زنجیــرە دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

## 27 ـ 36

### بەرگی سـێیەم

## خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتی دا

عەلـی باپیـر




بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

1427ك 2006ز

ناوی کتێب: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - بەرگی سێیەم
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم 1428ك - 2007ز
تیراژ: 3000 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( 468 ) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانم بە نۆرە بەگوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لەمێژ بوو هیوادارم وابوو بە شێوە چاپکردنێکی

وایا جا بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانا بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە خۆوە پێشەنگی تەفسیر بەو کارە هەڵئەستێ .

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

علی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە (عەلی باپیر) بەڕێز مامۆستا مخلص و نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و بێزەی زیاتر بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی تر مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە.

عەلی باپیر

١١ ربيع الثاني ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

﴿ وَلِلَّهِ الآسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْ حِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾(□)

﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الآعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالآرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(ير)



(تر) ( الأعراف –180 ).

(ير) ( الأعراف □ 180 ).

# پێشـــکـەش بێ

بەو مسوڵمانە خوا بەیەکگرانەی کە:

* تێکڕای ئەو ناو و سیفەتانەی کە لە قورئان و سوننەتدا بۆ خوا ((عزّوجل)) بەکارهاتوون، بەکاردێنن.
* بە وریایی یەوە خۆ بەدوور دە گرن لە هەردوو دەردی کو شندەی تێپەڕاندن (إفراط) و بەزایەدان (تفریط)
* بە بیانووی بە پاك و بەرزگرتنی خواوە (تبارك و تـ عالی) خۆ یان دوچاری (تعطیل) ناکـــەن و ناو و سیفەتەکانی لـێ لانابەن و، بە پاساوی ئیسپاتی ناو و سیفەتەکانیـ شی یەوە خۆ یان گیرۆدەی (تمثیل) ناکەن و وەك دروستکراوەکانی تەماشای ناکەن!

# پێشـــەكی

الحمدلله الذي تَسمَّى بالأسماء الحُ سْنى و و صف نَفْ سه بأ نَّه له في السّموات والأرض المَثَلُ الأعلى والصلاة والسلام على محمد خاتم الأنبياء وآلِهِ المهتدين بهداه صَحْباً وأزواجاً وقرابة وأتباعهم الى يوم اللقاء.

خوێنەری بەرێز!

بابەتی خوا بەیەككگرتن لەناوو سیفەتەكانیدا یەكێكە لەو بابەتانەی كە لە مێژووی مسوڵماناندا كێشەو مشتومڕی زۆری لەسەر كراوەو تێككگیرانو دەمەقاڵێ زۆری لەسەر قەوماوە، هەم لەبەر وردیی و قووڵی بابەتەكەو بەزەحمەت جێبوونەوەی رەهەندە زۆرو جۆراو جۆرەكانی لە بیروزەینی مرۆڤ داو، هەم لە سۆنگەی دووركەوتنەوەی زۆرێك لەوانەی لەوبارەوە مشتومڕیان بووە لە قورئانو سوننەت، كە دوو تاكە سەرچاوەی ڕوونو بێچەندو چوونی وەحی خوای پەنهانزانو بەزەیی فراوانە.

جا بە هەرحاڵ من لێرەدا نامەوێ بچمە نێو قووڵایی ئەو بابە تە گەورەو گرنگەی، كە هەموو ئەم بەرگی سێیەمی زنجیرە دەرسی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی .....)مان بۆ تەرخان كردوە! بەڵام ئەوەندە دەڵێم كە: ئێمە لەو كتێبەدا هەوڵمان داوە هەموو ئەوەی، كە پێویستە بابا یەكی

مسوڵمان بیزانێ لەبارەی ناوە هەرە چاكو سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەكانی خوای تاكو پاكو بەرزو بێوێنەوە، تاكو بتوانێ لەو بوارەشدا خوا بەیەكگرتن (التوحید) لەخۆیدا بێنێتەدیو بەرجەستەی بكات، بە شێوازێكی روون و ئاسان بیخەینە ڕوو، كە زۆربەی هەرە زۆری لاپەڕەكانی ئەم كتێبەی بۆ تەخان كراون.

ئنجا بۆ هەردوو بابەتی (خوا بە یەكگرتن لە پەرستراوێتیدا) و (هاوبەش بۆ خوا دانان)یش هەر بە كورتی دەڵێم:

گومانی تێدانیە، كە خوا بەیەكگرتن لە پەرستراوێتیدا (توحید الله في الألوهیة) كاكڵ و جەوهەری ئیسلام و موسڵمانەتی و بناغەی دینداریی یە، بەڵام هیوادارم بەو ئەندازە پانتاییەی، كە لەم زنجیرە دەرسەدا بۆی تەرخان كراوە، تارادەیەك هەقی خۆی درابێتێ بە تایبەتیش، كە لە زۆربەی باس و بابەتەكانی دیكەدا باسوخواسی ئەو بابەتە گەورەو گرنگە، كەمو زۆر هێنراوەتە پێشێ،چونكە ئەو مەسەلەیە پەیوەستە بە سەرجەم لایەن و بوارەكانی ئیسلام و مسوڵمانەتییەوە.

هاوبەش بۆ خوا دانانیش لە سۆنگەی ئەوەوە، كە دژو پێچەوانەی خوا بەیەكگرتن (التوحید)ە بە هەموو بەشەكانییەوە، گوتراویشە (وبِضدِّها تتبيَّنِ الأشياءُ) شتەكان بە پێچەوانەكانیان ئاشكرا دەبن، بۆیە بە پێویست نەزانراوە، كە زۆر بە درێژیی قسەی لەسەر بكرێو بتوێژرێتەوە.

خواش بەبەزەیی و بەخششی بێ سنووری خۆی هێندە پیرۆز هێز بخاتە ئەم كتێبەوە كە مایەی بەرچاو روونی و بەهرە لێوەرگرتنی مسولمانان و زیاتر لە خوا نزیك خستنەوەیان و چاكتر بەندایەتی‌كردنیان بێت بۆ خوای تاك و پاك و خاوەنی هەموو ناو سیفەتێكی پەسندو چاك.

وآخر دعوانا أن الحمدلله ربِّ العالمين

1427/1/29 ك / 2006/11/21 ز

هەولێر

# ڕێ خۆشـــــکردن

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم بەرگی سێیەمەی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) کە وێڕای دە (10) دەرس لە زنجیرە دەرسی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە دەرسی (27 تا 36) بابەتێکی کتێبی (موسڵمانی کامڵ ـ بەشی یەکەم: بیروباوەڕی موسڵمان)یش گرتۆتە خۆی و سەرەنجام ئەم بەرگە، کە لەم حەوت بەندەی خوارێ پێکهاتوە:

**بەندی یەکەم: چۆنیەتی وگرنگی ناسینی ناو و سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا (عزّوجل).**

**بەندی دووەم: دە (10) تێبینی گرنگ دەربارەی ناو و سیفەتەکانی خوا (تبارك وتعالى).**

**بەندی سێیەم: بنچینە گرنگەکانی مامەڵەکردن لە گەڵ ناو و سیفەتەکانی خوادا.**

**بەنـــدی چوارەم: تەئویلکردنی هەندێك لە سیفەتەکانی خوا (سبحانەو تعالى) لە نێوان تێپەڕاندن (الأفراط)و بەزایەدان (التفریط)دا.**

**بەندی پێنجەم: خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتی دا (توحید الله في الألوهیة).**

**بەندی شەشەم: هاوبەش بۆ خوا دانان (الأشراك بالله).**

**بەندی حەوتەم: خواناسیی راست و بەرهەمەکەی**(تێ)

شایانی باسیشە کەلە بەندی یەکەم لە پێنج خالا ندا تیشکمان خستۆتە سەر چۆنیەتیو رێبازو شێوازی ناسین و پەی پێبردن بە ناو و سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا (عزّوجل) وە بەر هەم و گرنگی ئەو ناسین و شارەزابوونە لە بواری ئیمان و عەقیدەو دینداریی دا .

لە بەندی دووەمدا دە (10) تێبینی گرنگمان لە بواری ناسینی ناو و سیفەتە هەرەبەرزو چاکەکانی خوای بەرزو مەزندا خستۆتە ڕوو، کە یارمەتی زۆرمان دەدەن بۆ رێی ڕاست و ڕەوان گرتن و هەتلەو لاڕێ نەبوون لەو مەیدانەدا.

لە بەندی سێیەمیشدا پێنج بنچینەی گەورەو گرنگمان خستوونەڕوو بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ناوو سیفەتە هەرە چاك و پەسندەکانی خوای تاك و پاكدا.

بەندی چوارەمیش هەموو تەرخانکراوە بۆ توێژینەوەی بابەتێکی گرنگ و زۆر مشتومڕ لەسەرکراوی بواری عەقیدە، کە بریتیە لە مەسەلەی تەئویلکردن و نەکردنی هەندێك لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار (عزّوجل)، وە زۆر جوان خراوە تەڕوو کە هەرکام لە تێپەڕاندن (إفراط)و بەزایەدان (تفريط)، ئینسان گیرۆدەی هەڵەو

(تێ) ئەم بەندەیەکێکە لە باسەکانی کتێبی: ((مسوڵمانی کاملْ...))، بڕوانە: لا پەرە (16 تا 44) چاپی یەکەم: 1418 ك 1997ز هەولێر.

خلیسکانی گەورە دەکەن و، هەڵوێستی راستو درو ست بریتـ یە لە: هاوسەنگی (إتزان)و خەتی نێوەڕاست گرتن و بەمـلاولادا نەچوون.

بەندی پێنجەمیش باسێکی پوخت و گوشراوی لەبارەی بابەتی خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتیدا تێدایە کە بە کا کڵ و نـ ێوەرۆکی خوا بەیەکگرتن (توحید الله) دادەنرێ و خاڵی بنەرەتی تێکگیرا نی نـ ێوان پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة و السلام) و نەیارو ناحەزەکانیان بووە.

لە بەندی شەشەمیشدا پێچەوانەو دژی خوابەیەکگرتن تویژراو تەوە کە بریتیە لە: هاوبەش بۆ خوادانان (الأشراك بالله) واتە: هاوبەش بۆ خوا دا نان بەگ شتی لە هەر سێك بواری: بەدیهێنەرا یەتی و پەروەردگارێتی و، ناو و سیفەتەکان و، پەرستراوێتیدا.

لە بەندی حەوتەم و کۆتایشدا دوو بابەت توێژراونەوە:

یەکەم: خواناسیی راست کە تێیداو لە یازدە(11) خالا ندا هەو ڵدراوە چۆنیەتی خواناسین (معرفة الله)یکی ڕاست و درو ستی قور ئانی بخرێتە ڕوو.

دووەم: بەرهەمی خواناسین، کە لەمیشداو لە دوو تووێی پـ ێنج خاڵی کورت و گوشراودا هەوڵدراوە بەرهەمە سەرەکییەکانی خواناسین ـ لە بواری ئیمان بەخواو پەیوەندی لەگەڵ خوادا ـ بخرێتە ڕوو.

شایانی باسیشە کە ئێمە بە مەبەستی تیشکی ز یاتر خستنە سەر نێوەرۆکی باسو بابەتەکانی ئەم کتێ بەو ئا سانکردنی هەزمکران و

فامکرانیان، لە سەرەتای هەر بەندێکدا پێناسەیەکی لەژێر ناوونیشانی ((ئەم بەندە))دا دەخەینەڕوو.

# بەندی یەکەم

# چۆنیەتی و گرنگیی ناسینی ناو و سیفەتە چاك و بەرزو بێوێنەکانی خوا (سبحانە و تعالی)

# ئەم بەنـــدە

خوێنەری بەرێز!

ئەم بەندی یەکەمە کە لە دەرسی یەکەم  واتە: دەر سی یە کەمی ئەو دە (10) دەرسەی کە ئەم بەرگی سێیەمەیان لـێ پێکهاتوە  پێك دێ وەك لە ناوو نیشانەکەیەوە دیارە، باسی چۆنیەتی و گرنگی ناسین و پەی پێبــردنی ناوو سیفەتە هەرەچاكو بەرزەکانی خوای بەدێهێ نەرو پەروەردگار (سبحانە و تعالى) دەکات، وە سەرجەم دابەش دەبێ بۆ پێنج خاڵ، کە ئەمە ناو و نیشانەکانیانە:

خاڵی یەکەم: بەبێ پەیبــردن بە ناوو سیفەتەکانی خوای بێوێنە ناتوانین بیناسین.

خاڵی دووەم: تاکە رێ گەی پەیبردن بە ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار (وحي)یە.

خاڵی سێیەم: گرنگی ناسینی ناو وسیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن ((عزّوجل)).

خاڵی چوارەم: ژمارەی ناوەکانی خوای پەروەردگار (سبحانە و تعالى).

خاڵی پێنجەم: چەند بنچینەیەك بۆ دیاریكردنی ناوەكانی خوا (تبارك و تعالى).

شایانی باسیشە ئەم بەندی یەكەمە بە هەر پێنج خاڵەكەیەوە بە بناغەو دەروازەی سەرجەم بەندەكانی دیكە دادەنرێ.

## خـاڵی یەكـەم :

## بەبێ پەیبـردن بە نـاوو سیفەتەكانی خوای بێ وێنە، ناتوانین بیناسین

بێگومان ئەمە بنچینەیەكە هیچ شتێكی لێ هەڵ نەهاوێردراوەو یاسایەكی گشتگیرەو هەموو شتێك دەگرێتەوە، بەڵێ هەموو شتێك لە رێگەی حاڵ و سیفەت و ناو و نیشانەكانی یەوە دەناسرێت، چ دروستكەر (خالق)، چ دروستكراو (مخلوق) بێ، بەتایبەتی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار، كە ئێمە بێجگە لە ناو سیفەتەكانی، كە دیارە شوێنەوارەكانی لە ئاوێنەی ناو و سیفەتەكانیدا دەدرەو شێنەوە ناو و سیفەتەكانیش لە ئاوێنەو دەلاقەی شوێنەوارەكانی یەوە دەردەكەون، بەبێ ئەوە هیچ رێگایەكی دیكەمان نیە، كە خوای پێ بناسین، چونكە خوای تاكو و بێهاوەڵ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾(1) هیچ شتێك وەك وی نیە، چا

(1) ( الشورى  11 ).

ئێمە ئەگەر بۆ دروستکراو (مخلوق) ناچار ببین تەنیا لە ڕێی ناو و سیفەتەکانی یەوە بیناسین، دیارە خوای بەرزو بێوێنە حەوت جار حەوت جار بەبێ گرتنی ڕێگای پەی پێ بردنی ناوو سیفەتەکانی ناتوانین بیناسین و بۆمان ناناسرێت، چونکە شتەکانی دیکە هەر چۆنێك بێت تارادەیەك دەستمان دەگاتە خودی خۆشیان نەك هەر ناو و سیفەتیان، بەڵام خوای بەدیهێنەر بە هیچ رەنگێك پەی بە خود (ذات)ی نابرێ.

شایانی باسیشە کە خوای زانا و شارەزا لە زۆر ئایەتی بەپێزی قورئانی بەڕێزدا لە میانەی خستنەڕووی ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانیدا خۆی بەبەندەکانی دەناسێنێ، بۆ وێنە:

یەك:- ئایەتی ژمارە (255)ی (البقرة)دا کە بە (آية الكرسي) ناسراوە خوای کاربەجێ لە میانەی دە ڕستە (جملة)دا ژمارەیەك لە ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی دەخاتە ڕوو وەك پێناسەیەکی خۆی: ﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلا يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ (1)

واتە: خوا سبحانه وتعالى:

1 ـ بێجگە لەوی هیچ پەرستراو ـ ی بەهەق ـ نین.

(1) ( البقـرة 255 ).

2 ـ زیندوویەو سەرپەرشتیارو مشوورخۆرە.

3 ـ نە وەنەوز دەیگرێ نەخەو .

4 ـ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە هی ویە.

5 ـ کێ هەیە تکای لەلا بکات مەگەر بە مۆڵەتی خۆی !

6 ـ داهاتوو و رابردوویان دەزانێ.

7 ـ بەڵام ئەوان هیچ لە زانیاری وی دەورە نادەن ( نازانن) مەگەر خۆی بیەوێ.

8 ـ دەستەڵاتی وی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە.

9 ـ وە پاراستنیشیان (واتە ئاسمانەکان و زەوی) ماندووی ناکات.

10 ـ وە ئەو یەکجار بەرزو مەزنە.

دوو:- وە لە ئایەتەکانی (22و23و24)ی کۆتایی (الحشر) یش وا دیسان لە میانەی خستنە ڕووی بیست (20) لە ناو و سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی دا خۆی پێناسەو وەسف کردوە.

﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ۞ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۞ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ [] واتە: ئەو خوایە کەسێکە:

1 ـ بێجگە لەوی هیچ پەرستراو نین.

(تر) ( الحشر – 22، 23، 24 ).

2 و 3 ـ زانای پەنهان و ئاشکرایە.

4 و 5 ـ ئەو بەبەزەیی، بەخشندەیە.

ئەو خوایە کەسێکە کە جگە لەوی هیچ پەر ستراوی دی کە ـ ی شایستەی پەراستران ـ نین.

6 ـ پادشاو خاوەنە.

7 ـ پاك و بێ پەڵەیە.

8 ـ سەلامەتە، سەرچاوەی سەلامەتی و ئاشتی یە.

9 ـ دڵنیاکەر، بەڕاست دانەرە.

10 ـ باڵادەستە، چاودێرە.

11 ـ زاڵە.

12 ـ مل پێ کەچکەرە.

13 ـ خۆ بە گەورە گرە.

پاکی بۆ وی لەو شتانەی کە دەیانکەنە هاوبەشی ئەو خوایە:

14 ـ بەدیهێنەرە.

15 ـ پەیداکەرە.

16 ـ وێنە کێشە.

17 ـ ناوە هەرە چاکەکانی هەن.

18 ـ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بە پاکی دەگرێ.

19 و 20 ـ وە ئەو زاڵی کاربەجێیە.

بەڵـێ بەرێزان!

ئێمە تەنها لە ڕێی ناوە هەرە چاك و سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەكانییەوە خوای بەرزو مەزن و تاكو پاك و بێ وێنەو هاوەڵ (سبحانە و تعالی) دەناسین و دەتوانین لە قەددەر توانا ناو پێداویستی خۆمان لەم ژیانە دنیاییەدا بزانین كێیەو چۆنە؟!

بەڵام ئایا لە چ ڕێیەكەوەو چۆن و لە چ سەرچاوەیەكەوە دەتوانین پەی بە ناو و سیفەتە بەرزو بێ وێنەكانی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار ببەین؟!

لە خاڵی دووەمدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە:

## خـــاڵی دووەم:

## تاکــە ڕێگەی پەیبـردن بە نـــاوو ســیفەتەکانی خوای پەروەردگار (وَحْي)یە

بەرێزان !

ئێمە چۆن بزانین کە خوای بەرزو مەزن ناوەکانی چی و چین؟! سیفەتەکانی چۆنن؟ بێگومان تەنیا لە ڕێگەی (وحي)یەوە ئەوە دەزانین، چونکە لە باسەکانی ڕابردوودا(تن) باسمان کرد کە عەقلّ و فیطرەت بە شێوەیەکی کورت و سەرەتایی دەزانن کە خوای بەدیهێنەر هەیەو خاوەنی سیفەتی چاك و بەرزەو ناوی زۆر چاکی هەن، بەڵام ناوەکان و سیفەتەکان چەندن و چین و چۆنن؟! ئەوە لە سەرووی ئاستی فیطرەت و عەقڵەوە یەو دەبێ لە ڕێگەی (وحي)یەوە ئەو زانیارییەمان پێ بگات، بەڵێ تەنیاو

(تن) لە بەرگی دووەم داو لە بەندی یەکەمی دا.

تەنیا لە ڕێگەی (وحي)یەوە ئێمە دەستمان دەگاتە ئەو زانیارییەی کە بزانین خوای بەرزو بێوێنە ناوەکانی چەندن و چۆنن و سیفەتەکانی چی و چین و چۆنن؟! بۆیە ئەگەر تەماشای مێژووی فەلسەفە و بیرمەندان و مێژووی ئەوانە بکەین کە لە ڕێی ڕووح و دەروونەوە ویستوویانە خوا بناسن، واتە: هەم عەقڵگەرایەکان و هەم رووح گەرایەکان (العقلانيون و الروحانيون)، تەماشا دەکەین کە بە ڕاستی تووشی هەڵەی زۆر زەق و سەیرو سەمەرە بوون و خراپ خلیسکاون! بۆ چی؟! لەبەر ئەوەی کە ئیعتیمادیان لەسەر عەقڵ یان دڵ بووە، دیارە هەم دڵ و هەم عەقڵیش سنووردار (محدود)ن، وەك چۆن ئینسان بۆ خۆی سنووردارە، دیارە هەموو ئەو شتانەش کە پێی دراون سنووردارن، هەڵبەتە خوای پەروەردگاریش بێ سنوورەو بێ سنووریش لەسنووردا جێگەی نابێتەوە!! بۆیە هەرکاتێك ئینسان ویستبێتی لە ڕێگەی عەقڵەوە خوابناسێ و باسی بکات و وەسفی بکات، حەتمەن تووشی هەڵەو لادان و هەڵخلیسکان بووە!

بۆیەش خوای زاناو کاربەجێ (عزّوجل) فەرموویەتی: ﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ [1] واتە: وە مەکەوە شوێنی شتێك کە زانیارییت لە بارەیەوە نیە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤ زانیاری ڕاستەوخۆی لە بارەی خواوە نیە، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْماً﴾ [2] کەواتە:

---

[1] (الإسراء 36).
[2] (طـه 110).

مرۆڤ هەرشتێك بەبێ پشت بەستن بە (وحي) لە بارەی خواوە بڵێ مانای وایە بەبێ زانیاری قسەی کردوە دیارە بەبێ زانیاری قسە کردنیش لەهەر بارێکەوە بێ هەر هەڵەیە، بەتایبەت لە بارەی خوای بەرزو مەزن‌و بێوێنەوە، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی، ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾(1) ئەی محمد ﷺ ـ بڵێ: بێگومان پەروەردگاری من هەموو گوناحە ناقۆڵاو ناشیرینەکانی قەدەغە کردوون، ئەوانەی کە ئاشکران، وە ئەوانەش کە پەنهانن، وە گوناح و دەستدرێژیی ناهەق وە کە هاوبەشێك بۆ خوا دابنێن کە بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خوار، هەروەها ـ قەدەغەی کردوە ـ شتێك بڵێن دەربارەی خوا کە نایزانن (واتە نازانن داخۆ ڕاستە یان هەڵەیە) لێرەدا وەك دەبینین خوای پەروەردگار چوار جۆرە گوناهی قەدەغەکراوی ڕاگەیاندوون، کە پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی بفەرمووێ: خوا تەنیا ئەو چوار جۆرە گوناهەی حەرام کردوون:

(یەکەم): (الفواحش ما ظهر منها وما بطن) گوناحە ناقوڵاو دزێوەکان ئەوانەی کە بە ئاشکرا دەکرێن و ئەوانەی کە بە پەنهانی دەکرێن، زانایان دەڵێن وشەی (فواحش) کە کۆی (فاحشة)یە زیاتر بۆ ئەو

(1) (الأعراف 33) .

گوناهانە بەکاردێت کە ئینسان لە زاتی خۆیدا دەیانکات و پەیوەندییان بە خەڵکەوە نیەو دەستدرێژییان تێدا نیە بۆ سەر خەڵك.

(دووەم): (والأثم والبغي بغير الحق) گوناه و دەستدرێژیی بە ناحەق.

(سێیەم): (وان تشركوا بالله مالم ينزل به سلطاناً) هاوبەش بۆ خوا دانانێك کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوە.

(چوارەم): بریتیە لە: (وأن تقولوا على الله ما لا تعلمون) شتێك دەربارەی خوا بڵێین کە زانیاریتان دەربارەی نەبێ. جا ئەوە جێگەی سەرنجە، کە زانایان دەڵێن: ئەوەی یەکەمیان لەوەی دووەمیان سووکترەو ئەوەی دووەم لەوەی سێیەم سووکترەو ئەوەی سێیەمیش لەوەی چوارەم سووکترەو ئەوەی چوارەم لە هەر هەموویان قورسترە! دیارە یەکەمیان ئەو جۆرە گوناهانەن کە ئینسان لە زاتی خۆیدا دەیانکات، دیارە مادام پەیوەندی بە خەڵکەوە نەبێ و (حق الناس) نەبێ، زۆر نزیکترە کە خوا لێی خۆش بێت. جۆری دووەمیش ئەو گوناهو تاوانەن کە پەیوەندییان بە خەڵکەوە بێت وەك کوشتنی بە ناهەق و ڕێگریی و زەوتکردنی ماڵ و سامانی خەڵك و داوێنپیسیی، کە بێگومان ئەم جۆرەیان قورسترە لە هی یەکەمیان، بەڵام لە هی سێیەمیان کە بریتیە لە شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دانان، سووکترە، ئنجا هی چوارەمیان، ئەوە کە شتێك دەربارەی خوا بڵێی بەبێ زانیاری، نایزانی و هەروا لە خۆڕا دەڵێی خوا ئاوایەو ئاوا نیەو

هەر لە گۆترە سیفەت و ناوی لێ هەڵبدەی، خوای کار بەجێ ئەمجۆرەی بە خراپتر داناوە لە هاوبەش دانان ( شرك) یش، چونکە سەری لە ئیلحادەوە دەردەچێ! کەواتە ڕێگای پەیبردن بە ناو و سیفەتەکانی خوای بێهاوتا بریتیە لە: (وحي)، وە لە ڕاستیدا ئینسان لە ڕێگەی (وحي)یەوە نەبێ، نەك هەر دروست نیە، بەڵکو گەورەترین گوناهـ و تاوانە قسە دەربارەی خوای بەدیهێنەرو خوای پەروەردگار بکات. دیارە (وحي)یش بریتیە لە قورئان و سوننەت قورئان قسەی خوایە، جا ئایا کەس هەیە بە قەدەر خوا (عزّوجل)، خوا بناسێ؟! ﴿ قُلْ أَأَنْتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾ (١) بێگومان کەس بە ئەندازەی خوا، خوا ناناسێ، وەك چۆن خوا بە هەموو شتێك لە هەموو کەس زاناترو شارەزاترە. ئنجا لە دوای خواش لە نێو دروستکراوەکانی خوادا هیچ کەس نیە بە ئەندازەی پێغەمبەرانی خوا (عليهم والصلاة والسلام) خوای بەرزو بێوێنە بناسێ، بە تایبەتی موحەممەد ﷺ کە سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، لە هەر هەموان شارەزاترە بە خوا، وەك لە چەندان فەرموودەدا ڕوونکراوەتەوەو یەکێ لەو فەرموودانە ئەوەیە، کە لە درێژەی بەسەرهاتێکدا دەفەرمووێ: ((فَوالله لأنا أعلمهم بالله وأشدّهم له

(١) ( البقرة - 140 ).

خشية))[(ت)] واتە: دەجا سوێند بە خوا من لە هەموویان بە خوا زاناترم و لە هەمووشیان زیاتر لــێی دەترسم.

ئنجا ئاشكراشە كە سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بە گ شتی هەر لەوەحی خواوە هەڵقوڵیوە.

## خــاڵی سـێیــەم :

## گرینگی ناسـینی نـاو و سـیفەتە بــەرزو بێوێنەكانی خــوای بــەرزو مــەزن

بۆچی گرنگ و پێویستە كە ئێمە ناوو سیفەتەكانی خوای بەرزو بێوێنە بناسین؟! خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین حەوت ڕووی گرنگیی و پێویستیی ناسینی ناو و سیفەتە هەرە چاك و پەسندەكانی خوای بەرزو پاك بخەینە ڕوو:

1 ـ ناسینی خوای پەروەردگار، بە هۆی ناوو سیفەتەكانی یەوە چاكترو زیاتر مسۆگەر دەبێت: وەك پێشتریش باسمانكرد، كە ئینسان تا ناو و

(ت) (رواه مسلم) عن عائشة رضي الله عنها، برقم (2356). بڕوانە صحیح مسلم، 1281. وە بڕوانە (صحیح البخاري) برقم 6101.

سیفەتەکانی خوای زیاتر بناسێ و پێیان ئا شنا بێ، ز یاتر خوا دەناسێ.

2 ـ پاك بوونەوە (تزكیة)ی ئینسان و ڕازانەوەی بە خەسڵەت و سیفەتە بەرزەکان: ئینسان کاتێك ئیمانی بەوەبێ کە خوای پەروەردگار زانایەو بە توانایەو بەخشندەیەو کاربەجێیە، هەموو شتێك دەبینێ و دەبیستێ، وەڵامی دووعای هەموو کەس دەداتەوە، باڵا دە ستی ئەم بوونەوەرەیە ،...... هتد ، وە ختێك ئینسان ئەو سیفەت و ناوانەی خوای پەروەدگاری بزانێ، حەتمەن زیاتر تەزکیە دەبێ و چاکتر خۆی لە گوناح دەپارێزێ و باشتر خۆی لە سیفەتە خراپەکان دەپارێزی و خۆی بە سیفەتە بەرزەکان دەڕازێنێتەوە. کەواتە: ڕاستە زیاتر ئا شنابوون بە ناو و سیفەتەکانی خوا، دەبێتە هۆی زیاترو چاکتر تەزکیەبوونی ئینسان، (تزكیة)ش وەك لە شوێنی خۆیدا باسمان کردوە، وا تە خۆ پاککردنەوەو خۆ بژارکردن لە سیفەتی خراپ و نزم و پەست، وە خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتی پەسندو بەرزو جوان.

3 ـ ناسینی ناو و سیفەتەکانی خوا، بنا غەی هەر جۆرە زان یاری و زانستێکە: چونکە ئەو شتانەی کە دەگونجێ بزانرێن بە گ شتی دوو جۆرن: یەکەم: ئەو دروستکراوانەی خوا دروستی کردوون، دووەم ئەو فەرمانانەی کە خوا دەری کردوون، ئەوانیش دوو بە شن: فەرما نە بوونییەکان (الأوامرالكونیة) کە خوای پەروەردگار شتی پێ پە یدا

کردوون و خولقاندوون، وە فەرمانە شەرعییەکان، (الأوامر الشرعیة)، ئەوانیش بریتین لەو فەرمانانەی لە ڕێی (وحي)یەوە بە پێغەمبەران (علیهم السلام)دا ناردوونی، بۆ ئەوەی حەڵاڵو حەرامو چاکەو خراپەو راستو چەوتیەکانیان بۆ خەڵکی پێ دیاری بکات، جا هەرکام لەم دووانە، واتە هەم دروست کردن (خلق)، هەم فەرمان (أمر) هەمووی هی خوایە وەك دەفەرموێ: ﴿أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[1]، واتە: ئاگاداربن دروستکردن و فەرمانکردن تەنیا بۆ خوایە، بەرزو پایە بڵندە پەروەردگاری جیهانەکان. بۆیە ئینسان هەتا ناو و سیفەتەکانی خوای بەدیهێنەرو فەرمانڕەوا باشتر بزانێو پێیان ئاشنا بێت، چاکتر دەستی لە سەرچاوەی دروستکراوەکانو فەرمانەکان گیر کردوەو زیاتر پەی بە سەرچاوەی دروستکراوەکانو فەرمانەکان بردوە، هەڵبەتە ئەم باسە زۆر قووڵە، بەڵام هەروا بە کورتی بۆتانم باس کرد.

4 ـ زیادبوون و گەشەکردنی ئیمان: چونکە ئیمان بە زانیاری (علم)و بە کردەوە (عمل) زیاد دەکات، وەك لە باسی ئیماندا خستمانە ڕوو، هۆکارەکانی زیادکردنیو گەشەکردنی ئیمان بە گشتی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار: زانیاری و کردەوەی باش، دیارە زانیاریش بناغەی کردەوەی باشە، چونکە ئەگەر نەزانی کردەوەی باش چییەو چۆنە؟!

---

[1] (الأعراف - 54).

چۆنی ئەنجام دەدەی!، کەواتە زانیاری بناغەیە. ئاشکراشە بەرزترین جۆری زانیاریو فراوانترین جۆری زانیاری، بریتیە لە زانیاری دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خوا عزوجلّ، چونکە ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار هەموو زانراوەکان (المعلومات) دەگرنەوە، چ دروستکراو بن، چ فەرمانی دەرکراو بن لە لایەن خواوە، بە واتا یەکی دی: چ (خلق) بن، چ (أمر).

5 ـ ستایشو مەدحکردنی خواو لێپاڕانەوەی و داوا لێکردنی بە هۆی ناوو سیفەتەکانییەوە: بەڵێ هەتا زیاتر لە ناو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار شارەزابین و پێیان ئاشنا بین، هەم زیاترو چاکتر دە توانین مەدحو سەناو ستایشی بکەین بە هۆی ناوو سیفەتەکانییەوەو پاكو بیگەردییو بەرزییو گەورەییو بێهەڵەو پەڵەیی بخەینەڕوو و ستایشی بکەین وەك چۆن خوای بێوێنە خۆی باسی کردوە، وە هەم چاکتر دە توانین لێی بپاڕێینەوەو داوای لێبکەین، وەك خوای کاربەجێو بەخشەر فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾(1) واتە: وە ناوە هەرە چاکەکان هی خوان، جا بەو ناوە چاکانە لێی بپاڕێنەوە. دیارە ئەمەش لێی دەفامرێتەوە کە: بە ناوە هەرە چاکەکان لە خوا پاڕانەوە، زۆر پێدەچێو نزیکە کە خوای بەخشەر پاڕانەوەو داوایەکە قبووڵ بکات، هەڵبەتە خواش پێی خۆشە کە

(1) (الأعـراف – 180).

بەندەکانی وەفادار بن‌و ناو و سیفەتەکانی بزانن وە مەدح و ستایشی بکەن، ئەوە بۆ بەندەکان باشە، ئەگەرنا خوای بەرزو مەزن خەڵك باسی بکات‌و نەکات، سوپاس و ستایشی بکات یان نەکات، بۆخۆی هەرستایی شکراو و پایە بەرز (حمید، مجید)ە وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾(١) واتە: یادم بکەن، یادتان دەکەم، وە سوپاسگوزاریی بۆ من بکەن و سپڵە مەبن. یادکردنی خوا دەبێتە هۆی ئەوەی خواش یادی تۆ بکات و سوپاسگوزارییت بۆ خوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوا بۆت زیاد بکات: ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾(٢) جا یادی ئێمە بۆ خوا (سبحانه‌وتعالی) لە قەدەر خۆمانەو یادی خواش بۆ ئێمە لە قەدەر خۆیەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((ما مِنْ أحَدٍ أحَبَّ اليه المَدْحُ مِنَ اللهِ))(٣) واتە: هیچ کەس بە قەدەر خوا ستایشی پێ خۆش نیە، بۆچی؟! چونکە لە هەموو کەس زیاتر شایستەی ستایش و سوپاس و مەدح و سەنایە، بۆیە پێی خۆشە، وە بۆیەش پێی خۆشە، چونکە بەندەکانی ئەگەر ستایشی بکەن، بۆ خۆیان قازانجەو خواش قازانجی بەندەکانی پێ خۆشە، وە حەز دەکات بەندەکانی بەوەفا بن و

(١) ( البقـرة – 152 ) .
(٢) ( أبراهـيم – 7 ).
(٣) البخـاري .

سوودو بەهرەش وەربگرن لە خوای بەخشەر بە هۆی ستایش شکردنیو لــێپارانەوەی و بەهۆی مەدح و سوپاسکردنییەوە. جا ئەگەر ئینسان ناو و سیفەتەکانی خوا نەزانێ چۆن دەتوانێ مەدح و ستایشی بکاتو لێی بپاڕێتەوە؟! وەك لە ئایەتێکی دیکەشدا فەرمووییەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾(تر)، واتە: وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، لە هەندێك لە شوێنەوار (أثر)دا هاتوە، کە: خوا لەو بەندەیەی تووڕەیە، کە لێی ناپاڕێتەوە! بۆچی؟! چونکە کە لێی ناپاڕێتەوە، وەك ئەوە وایە پێویستی بە خوا نەبێتو لێی بێنیازبێ! دیارە هەر خواش بۆ خۆی دەوڵەمەندو بێنیازەو پێی خۆشە کە بەندەکانی لێی بپاڕێنەوەو پێیان ببەخشێ، چونکە هەموویان نیازمەندن: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾(ير)، بێگومان ناسینی خواو بڕوا پێهێنانی، بە پێی ڕێنمایی (وحي)و شەریعەتی خوا مایەی سەربەرزیی و بەختەوەریی دنیاو قیامەتە، وە بە پێچەوانەوە، نەناسینی خواو ئیمانو بڕوا پێنەهێنانیو لــێدوورکەوتنەوەی، دەبێتە هۆی مایەپووچی و زەبوونی و ژێردەستەیی و بێدەستەڵاتیی بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿أَنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ

(تر) ( غافــر 60 ).
(ير) ( فاطــر 15 ).

الَّذِينَ آمَنُوا...﴾(ت)، واتە: خوا بەرگری دەکات لەوانە کە ئیمانیان هێناوە ـ سەریان دەخات و پشتیوانییان لێدەکات وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾(ر)، واتە: ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان ﴿علیهم الصلاة و السلام﴾ وە ئەوانەش کە بڕوادارن سەریان دەخەین لە دونیاو لە دوارۆژیش دا. کەواتە ئینسان هەتا ئیماندارتر بێت، لە موژدەو بەڵێنێك کە خوا پێی داوە بەرگری لە ئیمانداران بکات، نزیکترە، وە بێ ناسین و زانینی ناو و سیفەتەکانی خواش ئیمانی ئینسان نایەتەدی، وە بەڕاستیش ئەگەر تەماشای مێژووی ئۆممەتی ئیسلام بکەین دەبینین هەرکاتێك مسوڵمانان بە ڕاستی ئیماندار بووبن، خوایان بە تەواوی بە یەك گرتبێت، وە بە شێوەیەکی ڕاست ناو و سیفەتەکانی خوایان لە قورئان و سوننەتەوە وەرگرتبێ و ناسیبێ، وە بەڕاستی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خوای پەروەردگاردا وەك بەندەی وەفادارو چاکەکار لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت بووبێ، ئەوە لە سەرکەوتن و لە بەختەوەریی نزیکتر بوونەو هەتا زیاتریش دووچاری لادان و ترازان و خلیسکان بووبن، پتر گیرۆدەی زەبوونی و ژێردەستەیی و بێدەستەڵاتی بوونە! دوای ئەوەی لە سۆنگەی

(ت) (الحج 38).
(ر) (غافر – 51).

دووركەوتنەوە وە لە قورئان و سوننەت و دینداریی ڕاست و دروست مسوڵمانان لە بواری عەقیدەدا گیـرۆدەی لادان بوون، بە تایبەتی لە دوا دوای چاخی عەبباسییەکاندا کە زۆر بەی زۆری زانا یان هەر خەریکی مشتومڕو دم بە دمەو شەڕە قسە بوون دەبارەی ئەوە کە ئایا قورئان دروستکراو (مخلوق )ە یان نا؟! وە لەوبارەوە کە ئایا خوای پەروەردگار لەسەر(عرش)ە یان نا؟! وە ئایا خوا لە دوارۆژدا دەبینرێ یان نابینرێ؟! هەروەها لە بواری ناو و سیفەتەکانی خوادا تووشی کێشەو مشتومڕی زۆر بوون و هەیانبوو هەر چی سیفەتە نەفی دەکردو هەشیان بوو خوای وەك دروستکراوەکانی سەیر دە کرد! چا کاتێك مسوڵمانان ئاوا تووشی سەر گەردانیی و لادان و خلیسکان بوون و لە مسوڵمانەتیی ڕاست و دروست دووركەوتنەوە، هەر هێندەیان زانی تەتەرو مەغۆلەکان لە ڕۆژهەلاتەوە هاتن و خاچپەرستەکان لە ڕۆژ ئاواوە بەسەر مسوڵمانانیان داداو کیان و دەوڵەتەکەیانیان ڕووخاندو دووچاری ژێر دەسەتەیی بوون!

7 ـ هەرکەسێك ناو و سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا بزانێ و دەرکیان بکات و تێیان بگات و کاریان پێ بکات، گەورەترین پادا شتی هەیەو گەورەترین موژدەی پێدراوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ان لله تعالى تسعة وتسعين إسماً، مائة الاّ واحداً مَنْ أَحْصاها دَخَلَ

الجَنَّةَ﴾(١) واتە: خوای بەرز نەوەدو نۆ (99) ناوی هەیە سەد (100) بێجگە لە یەك، هەركەسێك بیانژمێرێتو كۆیان بكاتەوە، دە چێتە بەهەشت. جا دەربارەی ئەو ژماردنەی ناوەكانی خوا، زانایان چەند ڕاو بۆچوونێكیان هەن كە دوای تۆزێكی دیكە ئاماژەیان پێ دە كەین.
سەرەتا دەڵێین: لە زمانی عەرەبیدا وشەی (أحصْی) دوو مانای هەن:
یەكەم: بە مانای ژماردن و سەرژمێركردن دێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَداً﴾(٢) واتە: خوا ژمارەی هەموو شتێكی دیاری كردوە، واتە: هەموو شتێكی سەر ژمێركردوەو دەزانێ چەندە، كەواتە: (إحصاء) بە مانای ژماردن دێت.
دووەم: بە مانای لەبەركردن و پاراستن (حفظ)یش دێت، وەك خوای زا نا دەفەرموێ ﴿ عَلِمَ أَنْ لَنْ تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ﴾(٣) واتە: خوا زا نی كە بۆتان ناپارێزرێ، یانی كاتەكانی شەو نوێژتان بۆ ناپارێزرێ، كە هەمیشە لە كاتی دیاریكراودا هەستن بۆیە: (فتاب ع ليكم) لێ تان خۆش بوو، شەونوێژ نەشكەن گوناهبار نابن، ئیدی شەونوێژ فەرز نەماو بوو بە سوننەت. كەواتە وشەی (أحـ صْى) هەم بە ما نای لەبەركردن و پاراستن دێت، هەم بە مانای سەرژمێر دێت، بەڵام ئایا پێغەمبەر ﷺ كە دە فەرموێ: خوا نەوەدو نۆ ناوی هە یە،

---

(١) رواه البخاري عن أبي هريرة.
(٢) ( الجـن – 28 ) .
(٣) ( المزمـل 20) .

هەرکەسێك لە بەریان بکات، یاخود بـ ـیان ژمێر ـێت دە چێتە ـبە هەشت، هەر مەبەست لە ـبەرکردن و سەرژمێرکردن و ژ ماردنی ڕواڵەتییە یان مەبەست شتی دیکەشە؟!

هەندێکیان دەڵێن: بەڵێ مەبەست پێی ژماردن و سەرژمێرکردن و لەبەرکردنە، بەڵام بەم شێوەیەی تەفسیر دەکەن و دە ـڵێن: هەرکە سێك ناوەکانی خوای بە ڕاستی لەبەرکردو سەرژمێرکردو تێ ـیان گەی شت، بێگومان دەبێتە شایستەی بەهەشت، بەڵام زۆرینەی هەرە زۆری زانا ـیان دەڵێن: بەڵکو مەبەست لە سەرژمێرکردنو لەبەرکردنی ناوەکانی خوا ئەوەیە کە: لە مانایەکانیشیان تێبگات و کاریشیان پێ بـ کات! (ا ـبن القیم) دەڵـێ: (مراتِبُ إحصاءِ أسماءِ الله ـثلاثٌ:)[١] وا ـتە: پ ـلەکانی ژماردنی ناوەکانی خوا سێ پلەن:

یەکەم: (إِحصاءُ أَلْفاظِها و عَدَدِها) ژ ماردنی و لە ـبەرکردنی و شەو بێژەکانی - ناوەکانی خوا- و ژمارەیان .

دووەم: (فَهْمَ معانیها وَمَدْلُولها) تێگەیشتنی واتاکا ـیان و چەمك و مەبەستەکانیان.

سێیەم: (دعاؤه بها، کما قال: ولله الأسماء الحسنی فآدعوه بها) پاڕانەوەو داواکردن لە خواو ستایشکردنی خوا بەو ناوا ـنە وەك ـ خوای ـبە بەزەیی ـ فەرموویەتی: خوا ناوە هەرەچەکەکانی هەن چا ـلـێی

(١) (بدائع الفوائد). بەرگی/ 1 ، لاپەڕە 164.

بپارێنەوە پێیان. (ابن الحجر العسقلاني)یش دەڵــێ: دەربارەی و شەی (أحصاها) لە فەرمووودەکەدا: چوار ڕاو بۆچوون هەن:

1- لەبەرکردن (حفظ) یان،

2- ئیمان پێهێنان و مانا زانینیان.

3- ئەوەی کە بۆی دەگونجێ بە پێی توانا، بۆ خۆی کاریان پێ بکات و ڕەچاویان بکات،

4- قورئان بە تەواوی بخوێنێ، چونکە کە وای کرد، مە سۆگەر ناوەکانی خوا لە قورئانێدا هەن.

کەواتە ئەوە لە ڕاستییەوە نزیکترە کە مەبە ست لە (أح صاها) ژماردنی ناوەکانی خوای پەروەردگار، ئەوەیە کە هەم تێ شیان ب گات، هەم ئەوانەی کەلە تواناشیدا هەیە ئیشیان پێ بکات، بابزانین چۆن؟! تۆ کە دەزانی خوای پەروەردگار بینا (بصیر)ەو لە هەموو کات و شوێنێکدا دەتبینێ، هەرگیز شتی وا مەکە کە خوا بە شێوەیەکت ببینێ، کە پێی ناخۆشە، کە دەزانی خوای بێوێنە ڕۆزی دەر (رازق)ە، مانای وا یە، بۆ ڕزق و ڕۆزی بەس پشتت بە خوا ببەستە، وە خۆت تووشی ڕزق و ڕۆز یی حەرام نەکەی، یان کە دەزانی خوا ژیێنەرو مرێنەر (المحي والمميت)ە وە تەنها ئەو دەژیەنێ و دەمرێنێ و کەسی دی ژیان و مردنی بەدەست نیە، کەواتە: بۆ ژیان و مردن، تەنیا پشتت بە خوا بەهێز بێ و دڵنیاش بە کە مردن و ژیان هەر بە دەست ئەو و بە فەرمانی ئەوە. وە هەروەها باقی ناو و سیفەتەکانی دیکەی خوای تاك و پاك، ئەگەر ئینسان بیانزانێ دەبێ

بە پێی تواناش ڕەفتاریان پێ بکات، واتە: ئەو ناوانەی کە لەگەڵ ئەو دەگونجێن، چونکە ڕەفتارکردن لەگەڵ ناوەکانی خوا، لە جۆرێ کەوە بۆ جۆرێکی دی دەگۆڕێ و جیاوازی هەیە، وەك لە باسەکانی داهاتودا باسی دەکەین.

## خاڵی چوارەم:

## ژمارەی ناوەکانی خوای پەروەردگار (سبحانەو تعالى)

زانایان دەربارەی ژمارەی ناوەکانی خوا (جل جلالە) بە گ شتی دوو ڕایان هەن، هەندێکیان دەڵێن: مادام پێغەمبەر ﷺ فەرمووییەتی: ((إنَّ لله تعالى تسعة وتسعين إسماً، مائة الاّ واحداً))، کەواتە خوا تەنیا ئەو نەوەدو نۆ ناوەی هەیەو لەوە زیاتر ناوی دیکەی نین، هەندێ لە زانایان ئەم ڕایەیان هەیە، یەکێ لەوانە، (ابن حَزْم الأندلسي)یە، دەڵێ: خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لەوە زیاتر هیچ ناوی دی نییەو هەرکە سێك لەو نەوەدو نۆ ناوە زیاد بکات، ئەوە لادان (الحاد)ی کردوە، لە ناوەکانی خوادا، وە تووشی گوناهی گەورە بووە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان، کە وەك (ابن الحجر العسقلاني) دەڵێ: (نووي) گوتوویەتی: (زانایان هەموو لە سەری یەك دەنگن) دەڵێن: نەخێر خوا هەر ئەو (99) نەوەدو

نۆ ناوەی نیە، بەڵکو لەوە زیاتر ناوی هەن‌و بەڵگەش زۆرن. جا (إبن الحجر العسقلاني) ئاوا بەڵگەکان دێنێت و دەڵێ: زۆربەی زانایان دەڵێن: ناوە هەر چاکەکانی خوا لەو ژمارەیەی (99) نەوەدو نۆ دا کورت هەڵنەهاتوون، بەڵکو لەوە زیاترن، وە (نووي) یەك دەنگی (إتفاق)ی زانایانی لەسەر ئەو مەسەلەیە هێناوە، وە ئەمەش چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوای کاربەجێ لە نەوەدو نۆ ناو زیاتری هەیە:

1) عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە پاڕانەوەکانی دا فەرموویەتی: ((أللَّهم إنّي عَبْدُك وآبْنُ عَبْدِكَ، وآبنُ أَمَتِكَ، ناصيتي بِيدكَ، ماضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدلٌ فِيَّ قضاؤكَ، أسألُكَ بِكُلِّ اسم هو لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَك، أو أنْزَلْتَهُ في كتابِكَ، أو علَّمتَهُ أحداً مِنْ خَلْقِكَ، أو آسْتَأْثَرْتَ بِهِ في عِلْمِ الغيْبِ عنْدك، أنْ تَجعْلَ القرآن العظيم رَبْيعَ قَلبـي، ونُور صَدْري، و جِلاءَ حُزْني))(تر)، ئەم دووعاو پاڕانەوەیەی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا تێیدا دەبینرێ کە خوای تاك و پاك تەنیا ئەو نەوەدو نۆ ناوەی نیە، دەفەرموێ: ((ئەی خوایە من بەندەی تۆم، وە بەندە زادەی تۆم، نێوچاوانی من بە دەست تۆوەیە حوکم و بڕیاری تۆ لە مندا کاریگەرە، بڕیاری تۆش سەبارەت بەمن دادگەرانەیەو لە جێی خۆی دایە، بە هەر ناوێك کە تۆ هەتە لێت دەپاڕێمەوە، ئەو ناوانەی کە

(تر) رواه الأمام أحمد في مسنده: وصححه أبن حبان.

خۆتت پێ ناو ناون، کە لە یەکێك لە کتێبەکانی خۆتدا ناردووتە خوارێ یاخود فێری یەکێك لە بەندەکانی خۆتت کردوون، یان لە زانیاری پەنهان (علم الغيب)دا لای خۆت شێرراوەن (داوات لـێدەکەم بەو ناوانەت) کە قورئانی مەزن بکەی بە بەهاری دڵم (دڵمی پێ خۆش و گەش بکەی) وە بیکەی بە ڕۆشنایی سینەم وە بیکەی بە هۆی لابردنی غەم و پەژارەم)) کەواتە: دیارە هەندێك لە ناوەکانی خوا دەگونجێ کە خوای بەرزو مەزن تەنیا لای خۆی بن، یان لە یەکێك لە کتێبەکانی خۆیدا ناردبنیە خوارێ، یاخود فێری یەکێ لە عەبدەکانی خۆی کردبن.

(2) هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا أُحصي ثناءً عليكَ، أنْتَ كما أثْنَيْتَ على نَفْسِكَ))[تر] واتە: پەروەردگارم من ناتوانم مەدح و سەنای تۆ بکەم، بەڵکو هەر وەك بۆ خۆت مەدح و سەنای خۆتت کردوە. جا دیارە کە پێغەمبەر ﷺ ناتوانێ وەك پێویست مەدح و سەناو ستایشی خوا بکات لەبەر ئەوەیە کە وەك پێویست ناو و سیفەتەکانی خوا نازانێ بەو جۆرە کە خوا بۆ خۆی دەیانزانێ.

(3) وە لە فەرموودەی تکاکردنی گەورە (الشفاعة الكبرى)دا هاتوە کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ((فيفتح عليّ مِنْ

(تر) بخاري.

مَحامِدِهِ بِما لا أُحْسِنُهُ الآن))[٣١] واتە: جا خوا جۆرێك لە ستایش و مەدحو سەنای خۆیم فێردەكات (لە رۆژی قیامەتدا كاتێك كە شەفاعەتی مەزن و گەورە دەكەم) كە ئێستا نایزانم، واتە: ئەو مەدحو سەنایەی كە ئەو كاتی دەیكەم بەو ناو و سیفەتانەی خوا كە لێی دەپارێمەوە ئێستا نایانزانم[٣٢] كەواتە: ئێستا زانیمان كە ناوەكانی خوا لە نەوەدو نۆ زیاترن، بەڵام ئایا چەندن و كامانەن؟! وە دیاریكراون یان نا؟! لەو بارەوە فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێنراوە[٣٣]، كە نەوەدو نۆ ناوی بۆ خوا ژماردوە، بەڵام زۆرێك لە زانایان دەڵێن: ئەو فەرموودەیە، لەبەرئەوەی هەم دەق (متن)ە كەی نارێكی (اضطراب)و جیاجیایی (إختلاف)ی تێدایە، بۆ وێنە: لە ریوایەتێكدا هەندێك ناوی هێناون، بەڵام لە ریوایەتێكی دیكەدا هەندێكی دیكەی جیای هێناون، وە لە زنجیرەی راوی‌یەكانیشیدا خەڵكی لاوازی تێدایە، بۆیە ئەو فەرموودەیە بە بەڵگە ناشێ[٣٤] چونكە نەدەقەكەی بەكەڵك دێت و نە زنجیرەی راوی‌یەكانیش، ناڵێین:

(٣١) بخاري و مسلم .

(٣٢) ئەم قسانەو ئەم بەڵگانە هەموویان (أبن الحجر العسقلاني) لە (فتح الباري) بەرگی (11): لاپەرە (220) داهێناونی.

(٣٣) ترمذي و ابن ماجه لە (أبي هريرة)ەوە هێناویانە.

(٣٤) هەندێك لە ناوەكانیش پێم وایە گونجاوبن بۆ خوای بەرزو مەزن،وەك (الضارّ) زیانبەخش، زیان گەێن !!

هەڵبەستراو (موضوع)ە، بەڵام هی ئەوە نییە کە بەبەڵگە بهێنرێتەوەو پشتی پێ ببەسترێت. (دوایش لە بەندی حەوتەمدا دەقی ئەو ناوانەی کە لەو فەرموودەیەدا هاتوون، دەنووسین). کەوا تە: ناچارین بڵێین: ناوەکانی خوا (عزّوجل) لە هیچ دەقێکدا دیاری (تحدید) نەکراون، کە بتوانین بڵێین: ئەوە (99) نەوەدو نۆ ناوەکەیە یاخود ئەوە ناوەکانی خوای پەروەردگارن لە (99) نەوەدو نۆ زیاتر. (ابن العربي) لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (أحکام القرآن)[تر] (146) سەدو چلو شەش ناوی خوای پەروەردگاری هێناوە، کە هەموویانی لە قورئان و سوننەت دەرهێناون. وە (ابن الوزير اليماني)[ير]ش (173) سەدو حەفتاو سێ ناوی خوای بێ هاوەڵی ژماردوە. وە هەندێکیشیان گوتوویانە ناوەکانی خوا هەزار (1000) ناون، (ابن حجر العسقلاني) ئەو قسەیەی لە (ابن العربي) یەوە هێناوە، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە چوار هەزارن، بۆ نموونە: (فخرالدين الرازي) وای گوتوە، بەڵام ئەوە کە ناوەکانی خوا هەزار یان چوار هەزار بن، تەنیا هەر قسەیەو هیچ کەس ئەو ناوانەی دیاری نەکردوون، بەڵام (173)و (146) ناوەکەی سەر ژمێر کراون و دیاریکراون. جا ئایا حیکمەتی چیە کە خوای کاربەجێ ناوەکانی

---

(تر) أحكام القرآن، بەرگی/4، لاپەرە 340، 351.

(ير) سبل السلام . بەرگی /4، لاپەرە 343.

خۆی لە یەك شوێندا ڕیز نەكردوون، بە تایبەتی نەوەدو نۆ (99) ناوەكە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەركەسێك بیا نژمێرێ و كۆیان بكاتەوە دەچێتە بەهەشت؟! زانایان دەڵێن: وەك چۆن خوای زاناو شارەزا ئەو یەك سەعاتەی ڕۆژی جومعەی پەنهان كردوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سەعاتێك لە ڕۆژی (هەینی)دا هەیە، دووعای تێدا گیرایە تا مسوڵمانان هەوڵ بدەن لە تێ كرای ڕۆژی جومعەداو لە هەموو سەعاتەكانیدا طا عەت و پاڕا نەوە ب كەن و سەرنجام ئەو سەعاتە موبارەكە بپێكن هەروەها شەوی قەدر (لیـلة القدر) كە بێگومان لە مانگی ڕەمەزان دایەو لە دەیەكانی كۆتایی دایە، وە بە دڵنیاییی زۆرەوە لە شەوە تاكەكان دایە، بەڵام بۆچی خوای پەنهانزان پەنهانی كردوە؟

دیارە بۆ ئەوەی ئینسان لە هەموو ڕەمەزان دا خۆی ماندوو ب كات، بە تایبەت لە دەیەكانی كۆتاییدا تاكو بە م سۆگەریی ئەو شەوە موبارەكە بپێكێ! كەوا تە حیک مەتی د یاری نەكران و ڕیز نەكرانی ناوەكانی خوای پەروەردگاریش هەر ئەوەیە كە ئین سان هەوڵ بدات هەموو قورئان بخوێنێ، هەروەها سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بە گشتی، وە هەموو دووعاو پاڕانەوەكان كە پێغەمبەر ﷺ كردوونی، وە هەموو ئەو دووعایەنەی كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كردوویانن و بە ناوو سیفەتەكانی خوا پاڕاونەوە چونكە ئەو كاتە بە مسۆگەریی هەموو

ئەو نەوەدو نۆ ناوە موبارەکەی خوا (سبحانە و تعالی) دەپێ ـکێ و وە ـبەر موژدەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێ.

## خـاڵی پێنجـەم:

## چەند بنچینـەیەك بۆ دیاری کردنی ناوەکـانی خـوا

ئێمە چۆن بزانین کە فلان ناوە بۆ خوا شایستەیە، یان شایستەی نیە؟ چونکە جاری وایە ناوێك لە قورئان و سوننەتیشدا هاتوە، ـبەلام چۆن بزانین کە ئایا دەگونجێ بۆی بەکار بهێنین، ـیان ـنا؟! زۆر ـبەی زانا ـیان ئەگەر نەشڵێین هەموویان، لەسەر چەند بنچینەیەك ڕێککەوتوون، ـبۆ دیاریکردنی ناوەکانی خوای بێوێنە، لەو زانایانە (ابن تيمية، ابن ـقيم الجوزية، ابن الحجر العسقلاني، النَّووي) وە ژمارەیەکی دیکەش، شایانی باسیشە (د.عمر سليمان الأشقر) لە کتێ ـبی (أ سماء الله و صفاته، في معتقد أهل السنة والجماعة) ئەو بنچینە(ت) (قاعدة)ا ـنەی هێ ـناون و ریزی کردوون و رێکی خستوون کە دوازدە (12) بنچینە (قا عدة)ن وە

(ت) ئەو سێزدە (13)ی هێناون بەڵام من یەکیانم لابردو پێم زیاد بوو بۆیە مانەوە دوازدە (12).

دەتوانین بڵێین: ڕەچاوکردنی ئەو دوازدە بنچینەیە دەبێتە هۆی ئەوە کە: ئینسان لە ناوەکانی خوای پەروەدگاردا بە هەڵەدا نەچێ و ناوێك بۆ خوا بەکارنەهێنێ کە شایستەی نەبێت، وەناوێك کە شایستەی خوا بێت لێی لانەبات، ئەو دوازدە بنچینەیەش ئەمانەن بە کورتی:

**بنچینەی یەکەم:** دەبێ ئەو ناوانەی کە بۆ خوای تاكوپاك بەکاردێن لە قورئان و سوننەتدا هاتبن: دەبێ ئەو ناوانەلە قورئانی بە پێتوپێز یا لە سوننەتی ڕاستورەوانی پێغەمبەری بەرێز ﷺ دا بن، چونکە ناوەکانی خوا (توقيفي)ن، واتە: خواو پێغەمبەرە کەی ئێمەیان لەسەر ئەو ناوانە وەستاندوە، کە ئەو ناوانە هی خوان، بۆیە کەس بۆی نیە کە لە خۆوە ناوێك لە خوا هەڵبدات و بۆی دابنێت، بەڵکو یان دەبێ خوای زاناو شارەزا بۆ خۆی بە کاری هێنابێت، یان پێغەمبەر ﷺ بۆی بەکار هێنابێت.

**بنچینەی دووەم:** مەرج نیە هەرشتێك کە لە قورئان و سوننەتدا لە بارەی خواوە هەواڵی پێ درابێ ناوی خوا بێت: بۆ نموونە: وشەی (الموجود) یان وشەی (الشيء)، وشەی خود (الذات)، ئەوانە دەبینین لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، بەڵام ئایا دروستە بڵێی: (یا موجود، یا شيء، یا ذات)؟! نەخێر دروست نیە، زۆر لە ئەهلی تەصەووف لەو بوارەدا زۆر بە هەڵەدا چوون، چونکە پابەند نین بە قورئان سوننەتەوە، بۆ نموونە: دەڵێن: (یا موجود)، (موجود) واتە ئەو شتەی کە هەیە، دیارە هەموو شتێکیش کە پەیدا کرا بێ

هەیە، مانای وایە ئەم وشەیە هیچ مەدح و ستایشێکی بۆ خوا تێدا نیە، بۆیە ئەو جۆرە وشانە دروست نیە بۆ خوا بەکاربهێنرێن، بەڵێ دەربارەی خوا هەواڵیان پێ دراوەو دەڵێین: خوا ( سبحانەو تعالی) (موجود)ەو هەیە، یان خوا شت ( شيء)ە، یان خود (ذات)ی هەیە، ئەوانە دەڵێیـن، بەڵام ئەم و شانە بەکارهێنانیان هیچ مەدحێکی تێدا نیە بۆ خوا (سبحانەو تعالی) ئەوە لە لایەك‌و لە لایەکی دیکەشەوە غەیری خواش لەو شتانەدا بەشدارەو غەیری ویش (موجود)ەو (شيء)ەو (ذات)ەو، کەواتە ئیمتیازێکی بۆ خوا تێدانیەو بە ناوی خوا لە قەڵەم نادرێن.

**بنچینـەی سێیەم:** بێگومان هەموو ناوەکانی خوا بێجگە لە وشەی (الله) سیفەتی خوان، چونکە خوا (الله) ناوی عەلەمیەتی، وا تە ناوی سەرەکییەتی، بەڵام ناگونجێ هەموو سیفەتەکانی خوا، ناوبن بۆ خوا (عزّوجل) واتە: هەموو ناوەکانی خوا سیفەتن بۆی، بەڵام هەموو سیفەتەکانی خوا ناو نین بۆی، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە دێت (يأتي)[٢٦]، یان دێتە خوار بۆ ئاسمانی دونیا (ينزل الى السماء الدنيا)[٢٧] یان خواردن دەدات بە خەڵك (وهو يُطْعِم)[٢٨] یان ئیمان لە دڵی ئیمانداراندا دەنووسـێ، (کـتب

(٢٦) ﴿ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ... ﴾ البقرة:210.

(٢٧) رواه البخاري .

(٢٨) ﴿... وَهُوَ يُطْعِمُ وَلا يُطْعَمُ ﴾ الأنعم: 14.

في قلوبهم الأيمان)[تر] يان خوا حوكم دەكات (والله يقضي بالحق)[ير] يان: خوای بە بەزەیی ئاوم دەداتێ (ويَسْقِينِ)[سە]، دروست نییە بە هیچ شێوەیەك ئەو سیفەتانە بكرێن بە ناو بۆ خوای پەروەردگار، واتە: بگوترێ خوا (جائی، مُطْعِمْ، كاتِبْ، قاضي، ساقي)!!، چونكە ئەوانە هەموویان سیفەتی كردەوە (فعلي)ن و وەسفی كردەوەكانی خوا (تبارك وتعالى) دەكەن.

**بنچینەی چوارەم:** نابێ خوای پاك‌و تاك، بەو سیفەتانە ناو بنرێ كە بۆنی زەم كردنیان لێ دێت، هەر چەندە خوای كاربەجێ ئەو سیفەتانەشی بۆخۆی بەكارهێنابێ: بۆ نموونە خوای بێ هاوەڵ فەرموویەتی (ويمكرون و يمكرالله)[] يان (انهم يكيدون كيداً واكيد كيداً)[له] يان (ان المنافقين يخادعون الله وهو خادعهم)[]، جا هەرگیز دروست نیە بڵێین: خوا (ماكر)ە، یان (كائد)ە، یان (خادع)ە، یان (مخادع)ە، چونكە ئەو جۆرە وەسفانە بۆنی زەمیان لێ دێت‌و كە خوای كاربەجێش دەفەرموێ: ئەوان فێڵ دەكەن و

---

(تر) ﴿ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ ﴾ المجادلة: 22.

(ير) ﴿ وَاللَّهُ يَقْضِي بِالْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ... ﴾ غافر: 20.

(سە) ﴿ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴾ الشعراء: 7.

() ﴿ وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴾ آل عمران: 54.

(له) ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْداً. وَأَكِيدُ كَيْداً﴾ الطارق: 15، 16.

() ﴿ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ... ﴾ النساء: 142.

خواش فێڵ دەكات، واتە: فێ ـڵی ئەوا ـنە دەپوو چێنێتەوە، وە كە دەفەرموێ: دەغەڵ (منافق) ەكان دەیانەوێ خوا فریو بدەن و خواش ئەوان فریو دەدات، دیارە فریودانی خوا وەكو فریودانی ئەوان نیە، بەلام لەبەر (مشاكلة) كە تەگبیری خوا لە بەرانبەر فێڵ و پیلانی ئەوان دایە، ئەو وەسفەی بەكارهێناوە، هەروەها نابێ ئەو شتانە بۆ خوا بكرێنە ناو كە دەگونجێ هەم مانای چاك و هەم هی خراپ بگەیەنن و بۆ خواو بۆ غەیری ویش بەكاردێن با ـلە قورئانیشدا هاتبن، وەك: كە لە كوردیدا دەبن بە: (چێنەر، رِا خەر، ڤ سەكەر، بكەر) وەك دەفەرموێ: ﴿أَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ﴾[ت] وە دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ﴾[ي]، وە دە فەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً﴾[س]، وە دەفەرموێ: ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾[]، دیارە بۆیەش ناگونجێ ئەو وەسفانە بكرێنە ناو بۆ خوا (تبارك و تعالى) چونكە مەدحی رەها (المدح المطلق) ناگەیەنن و دەگونجێ بۆ باری خراپە (سَلبـي)یش بەكاربێن و غەیری خواش ئەو وەسفانەی بۆ بەكاردێن.

(تر) ( الواقعة – 64 ).
(ير) ( الذاريات – 48 ).
(سه) ( النساء – 16 ).
() ( البروج 16 ).

**بنچینـەی پێنجەم:** هەر سیفەتێك نەگونجێ پێی لە خوا بپارێینەوە، ناگونجێ بیکەینە ناو بۆ خوا: وەك وشەكانی (مكوِّر، داعي، زارع، شيء، قاضي، مستمع، جاعل، سريع، قاتل) ئەوانە هەموویان خوای پەروەردگار وەك سیفەت بۆ خۆی بەكاری هێناون، بەڵام دروست نیە ئێمە بۆ خوا بیانكەین بە ناو، چونكە ناگونجێ پێیان بپارێینەوەو بڵێین (يامكوِّر[ تر]، ياداعي[ یر]، يا زارعْ[سەم]، ياشيء[ ]).

**بنچینـەی شەشەم:** سیفەتی كردەوەكانی خوا (صفات الأفعال)، دروست نیە بە ناوی خوا (سبحانه و تعالى) دابنرێن. بۆ نموونە وشەكانی: (شديد العقاب[لە]، سريع العقاب[ ]، سريع الحساب[ ]، شديد المحال[تي]، رفيع الدرجات[ني]) ئەوانە هەموویان سیفەتی كردەوەی خوان و دروست نیە بكرێنە ناو بۆ خوا، چونكە باسی زاتی خوا ناكەن بەڵكو باسی كردەوەكانی خوا دەكەن.

---

(تر) ﴿ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ﴾ (الزمر: 5).

(یر) ﴿ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلامِ ﴾ (يونس: 25).

(سەم) ﴿ أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ ﴾ (الواقعة: 64).

( ) ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهِ ﴾ (الأنعام : 19).

(لە) ﴿ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ (الأنفال:48).

( ) ﴿ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ ﴾ (الأنعام: 165).

(بي) ﴿ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾ (النور:39).

( ) ﴿ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ﴾ (الرعد:13).

( ) ﴿ رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ ﴾ (غافر:15).

**بنچینـەی حەوتەم:** هەموو ئەو وشانەی کە بێژە (لفظ)ەکانیان جیان، هەرچەندە ماناکانیشیان لەیەك نزیك بێ هەموویان هەر بە ناوی خوا دادەنرێن: هەندێك ناوی خوا هەن کە بێژەکانیان لەیەك جیان، بەڵام ماناکانیان و یەك دەچن و زۆر لە یەك نزیکن، ئەوانە هەموویان بە ناوی خوا لە قەڵەم دەدەرێن و لەبەر ئەوەی کە ماناکانیان لەیەك نزیکن ناکرێ بڵێین: ئەوانە هەموویان ناوی خوا نین بۆ نموونە: وشەی (الرحمن، الرحیم) یان (القادر، المقتدر، القدیر) ئەوانە لە ڕاستیدا ماناکانیان ئەگەر لە یەکیش نیزیك بن بەڵام یەك نین و لە یەك جیان، با سەرنج بدەین: (الرحمن) واتە: بە بەزەیی، (الرحیم) واتە: بەخشندە، یاخود (الرحمن) واتە: ئەو خوایەی کە بە کردەوە ڕەحم بە خەڵکی دەکات، (الرحیم) واتە: ئەو خوایەی کە بە هەمیشەیی ڕەحم بە خەڵکی دەکات، چونکە صیغەی (فَعْلان) دەلالەت لەسەر تازەبوونەوە (تجدد) دەکات، بەڵام صیغەی (فعیل) دەلالەت لەسەر جێگیریی (ثبوت) دەکات، هەر بۆیەش هەندێ لە زانایان گوتوویانە (یارحمن الدنیاو رحیم الآخرة) چونکە نیعمەتەکانی دونیا دێن و دەچن، بەڵام نیعمەتەکانی قیامەت چەسپاو و نەگۆڕن. ئینجا (القادر) واتە: (توانا) وە (المقتدر) واتە: (توانادار) وە (القدیر) واتە: (زۆر بە توانا)..

**بنچینـەی هەشتەم:** ئەو ناوانەی کە پاڵ دراونە لای یەك، مادام لە قورئان و سوننەت دا هاتبن، هەر بە ناوی خوا لە قەڵەم دەدرێن،

وەك (عالم الغيب و الشهادة، مالك الملك، نور السموات و الأرض) واتە: زانای پەنهان و ئاشكرا، خاوەنی موڵك، ڕووناكی ئاسمانەكانو زەوی، هەرچەندە ئەوانە چەند وشەیەكن پاڵ دراونە لای یەك، بەڵام مادام لە قورئانو سوننەت دا بەو شێوەیە بۆ خوا بەكارهاتوون، هەر بە ناوی خوا لە قەڵەم دەدرێن.

**بنچینــەی نۆیەم:** هەر ناوێك نەگونجێ بۆ بەندەكان بەكاربێ، دروست نیە بە ناوی خوا لە قەڵەم بدرێت دەبێ هەر ناوێكی خوا بگو نجێ بەندەكانی پاڵ بدرێنە لای: بۆ نموونە وشەی (الله) دروستە بەندەی پاڵ بدرێتە لای و بگوترێ: (عبدالله) یان (قادر) كە ب گوترێ (عبدالقادر) یان (رحمن) بگوترێ (عبدالرحمن)، وە هەروەها، بەڵام هەندێ سیفەتی دی هەن، كە خوای پەروەردگار بۆ خۆی لە قورئاندا بەكاری هێناون، بەڵام دروست نیە بەندەكانیان پاڵ بدرێتە لا بۆیە دروست نیە بكرێنە ناو بۆ خوا، بۆ نموو نە: درو ست ن یە بلێی (عبدالزّارع، عبدالمُبْغِض، عبدالمتكلم، عبدالما هِد) ئەوا نە سیفەتی خوان، بەڵام مادام دروست نیە بەندەكان پاڵ بدرێنە لایان، دروست نیە بكرێنە ناو بۆ خوا.

**بنچینــەی دەیەم:** هەموو ئەو وەسفانەی كە بە (ذو) دەست پێ دە كەن، دروست نیە ناوی خوا بن، وەك: (ذوالقوة، ذوالجبروت، ذوالملـ كوت، ذوالكبرياء) (ذو) واتە: خاوەن، بۆچی دروست نیە؟! چونكە وشەی (قوي، جبّار، مالك، الكبــير، المتعال) ەمان هە یە، كەوا تە ئەو

(ذو)یە قەیدێکی زیادەو خراوەتە سەریان، بۆیە وەك سیفەت بەکاردێن، بەڵام وەك ناو دروست نیە بەکاربێن.

**بنچینەی یازدەیەم:** ئەو ناوانەی بە صیغەی بەچاکتر دانان ( صیغة التفضیل) هاتوون بەبێ پاڵدانە لا (إضافة) دروستە ناوی خوای بێ وێنە بن وەکو: (الأعلى، الأكرم ) واتە: هەرەبەرز، هەرەبەخشندە، وەك فەرموویەتی ﴿سبِّح اسم ربك الأعلى﴾(1) ﴿وربك الأكرم﴾(2) چونکە هەر خوا هەرە بەرزو هەرەبەخشندەیە.

**بنچینەی دوازدە یەم:** ناگونجێ ناوەکانی خوا لە نەوەدو نۆ (99) کەمتر بن، چونکە ئەو ژمارەیە دەقی لەسەرە، ئینجا ئەوە هیچ کە نابێ لە (99) کەمتر بن، بەڵکو دەق هەیە کە لە (99)ش زیاترن!، بەڵێ هەندێ لە زانایان کەمتریان ژماردوون، بەڵام بێگومان، تووشی هەڵە بوون، چونکە فەرموودەی لەسەرەو دەبێ بەلای کەمەوە (99) هەربن، بەڵکو لەوەش زیاترن.



(1) (الأعلى - 1).
(2) (العلق - 3).

# ئــەم بــەندە

ئەم بەندی دووەمە کە دەرسی دووەم دەگرێتە خۆی وەك لە ناوو نیشانەکەیەوە دیارە، لە دە (10) تێبینی و سەرنجی گرنگ پێك دێ لە بارەی ناو و سیفەتەکانی خوای تاك و پاکەوە (سبحانەو تعالی) کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە بەگوشراویی:

1 ـ ناوو سیفەتەکانی خوا (عزوجلّ) بێکۆتا چاك و بەرزو پەسندن.

2 ـ ناوو سیفەتەکانی خوا بە ئیعتیباری پێناسەیان بۆ خوا یەکن و بە ئیعتیباری مانای تایبەتی هەر کامێکیان جیاوازن.

3 ـ ناو و سیفەتەکانی خوا بەگشتی پێنج جۆرن.

4 ـ ناوەکانی خوا هەرچەندە هەموویان لەو پەڕی چاکیی دان، بەلاّم چاك و چاکتریان هەیە.

5 ـ دەلەلاتی ناوەکانی خوا لەسەر زات و سیفەتەکانی بە هەر سێك جۆری (مطابقة و تضمّن إلتزام)ە.

6 ـ چۆنیەتی پەیوەندی ناو و سیفەتەکانی خوا بە زاتی یەوە، ئەوە یە کە نە خودی وین و نە جیاشن!

7 ـ بەکارهێنانی وشەکانی: (ذات، نفس، صفة، شيء) بۆ خوا، دروستە.

8 ـ سیفەتەکانی خوا (عزّوجل) لە ناوەکانی فراوانترن.

9 ـ جۆرەکانی لادان (إلحاد) لە ناوەکانی خوادا، سێن.

10 ـ دەلالەتکردنی ناوەکانی خوا لەسەر سیفەتێك هەم چە سپاندنی سیفەتەکەو هەم ئەو ناوەش کە لــێی دەردەهێنرێ، دەگەیەنێ.

شایانی باسیشە ئەم بەندە تەواکەری بەندی پێشوویەو لەگەڵ بەندی سێیەمدا سەرجەم بنەماو هێڵە گشتییەکانی مامەڵەکردنی ڕاست و دروست لەگەڵ ناو و سیفەتەکانی خوای بێوێنەو هاوتادا دەگرنە خۆیان.

جا بەرێزان: پێشتر بە تایبەت باسی ناوە هەرەچاکەکانی خوامان کرد ئێستاش خوا پشتیوان بێت، وێکڕا باسی ناوەکانی خواو باسی سیفەتەکانیشی دەکەین، بە تێکهەڵکێشی لە (10) تێبینی و ڕوونکردنەوەی گرنگداو سەرەتا وەك زەمینە خۆشکردنێك دەڵێین: بە ڕاستی قسەکردن دەربارەی ناو و سیفەتەکانی خوا (جل جلالە) هی ئەوە نیە بە وەها کورتە باسێك تەواو بێت، چونکە بێگومان خوای پەروەدگار بێ کۆتایی ناوی بەرزو چاکی هەن، وە بێ کۆتایی سیفەتی بەرزو پەسندی هەن، بەڵام گۆشەیەك لە ناو و سیفەتەکانی خوا ئەوەندی ئێمە بۆمان وەردەگیرێ‌و لە تواناماندا هەیە، لە قورئان و سوننەتدا خراوەتە ڕوو، وە گۆشەیەکیش لە شوێنەواری ناو و سیفەتەکانی خوا لە کتێبی بینراو (منظور)ی خواو لە کتێبی خوێندراوە (مقروء)ی خوادا دەردەکەون و، هەرکەسەش بە ئەندازەی ئامادەیی و توانای ئیمان و دڵ

ڕوونی و بەرچاو ڕوونی و شارەزایی خۆی لە کتێبی بینراوی خوا کە بوونەوەر (کون)ە، وە لە کتێبی خوێندراوەی خوا کە قورئانە بەهرەمەند دەبێ، ئینجا وەك پێشتر باسمان کرد بە ڕاستی ناو و سیفەتەکانی خوا هەموو شتێك دەگرنەوە، چونکە ناو و نیشـــان و وەسفی خوان و هەرچی کە بوونیشی هەیە هەمووی زادەو بەرهەمی خوایە، چ لە جوغزی جیهانی دروستکراو (خلق)دا بێت، چ جیهانی فەرمان (أمر)، لەبەرئەوە مەرج نیە ئەوەی کە پێویست بێ دەربارەی ناو و سیفەتەکانی خوا بیزانین و بیلێین، بەڵام من هەوڵم داوە کە هەموو ئەو شتانەی لەوبارەوە گوتراون، بۆتان بگوشم و دەبێ خۆشتان لەوبارەوە سەرنج بدەن و خۆتان ماندوو بکەن، تاکو خوا پشتیوان بێ بتوانن بە باشی فامی بکەن و هەزمی بکەن.

## تێبینی یەکەم:

## ناو و سیفەتەکانی خوا، بێ کۆتا چاك و بەرزو پەسندن

هەم ناوەکانی خوا، هەم سیفەتەکانی، بەبێ سنوورو بڕانەوە لە لووتکەی هەرە بەرزی چاکی و تەواویی و پەسندیی دان. خوای تاك و پاك لەو بارەوە فەرمووویەتی: ﴿ قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾(١) واتە: ـ ئەی محمد ﷺ ـ بفەرموو: لە خوا بپارێنەوە، یاخود لە (الرحمن) بپارێنەوە، بە هەرکام لەم دوو ناوە ـ لە خوا ـ بپارێنەوە، خوا ناوی هەرەبەرزو پەسندو چاکی هەن. ئەوە دەربارەی ناوەکانی، کە هەتا بڵێی ناوەکانی خوای بێوێنە بەرزو پەسندو چاکن، چونکە بێگومان ناوی خوا لە قەدەر خوایەو وەك چۆن خوا بێ وێنەو هاوتایە، دیارە ناوەکانیش هەروان. دەربارەی سیفەتەکانی خواش، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(٢)، واتە: وە ـ خوا ـ سیفەتی هەرە بەرزی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، وە ئەو باڵادەستی کاربەجێیە، مەبەست

(١) ( الأسراء – 110 ).

(٢) ( الـروم – 27 ) .

له (المَثل)یش وەك زانایان دەڵێن (صفة) و (وصف)ە. كەواتە دە بێ زۆر وریا بین، هەر كاتێك باسی ناوێكی خوا دەكرێت، یان باسی سیفەتێكی خوا دەكرێت، هەرگیزاو هەرگیز بەلای ئەوەدا نەچین كە بڵێ یـن، ئەوە وەك هی ئینسانە، بۆ نموونە كە باسی زانیاری (علم)ی خوا دەكرێ، نابێ بیرو هۆشت بەلای ئەوە دابچێ كە زانیاری خوا وەك هی ئینسانێكە، با ئەو ئینسانە پێغەمبەری خواش بێت ﷺ، یان كاتێك باسی بینینی خوا یان بیستنی خوا یان، حیكمەتی خوا، یان هەر سیفەتێكی دیكەی خوا دەكرێ، بەهەمان شێوە، جا ئەو سیفەتانە چ سیفەتی خودیی (ذاتي) بن، چ هی كردەیی (فعلي) بن، چ هی هەواڵی (خـبري) كە دوا یی با سی ئەوە دەكەین جیاوازی یان چیەو چۆنە، چونكە خوای به بەزەیی كە دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ﴾(1) واتە: هیچ شتێك وەكو خوا نـیە یانی لە زاتیداو لە سیفەتیداو لە ناوەكانیداو لە هەموو شتێكیدا، هیچ شتێك وەكو خوا نیە، چونكە غەیری خوا هەرچی بێت هەر درو ستكراو (مخلوق)ی خوایە دیارە هەرگیز دروستكراویش وەك بەدیهێنەر (خالق) نیـــەو نابێ!

(1) (الشورى – 11).

**تێبینـی دووەم:**

## ناو و سـیفەتەکانی خوا، بە ئیعتیباری پێناسـەیان بۆ خوایەکن و بە ئیعتیبـاری مانای تایبەتی هەر کامێکیان جیاوازن

بەڵێ ناو وسیفەتەکانی خوا (تبارك و تعالى) دوو ڕوو یان هەن: ڕوویەکیان ئەوەیە کە ناو نیشانی خوان، چونکە تۆ کە دەڵێی: خوا (الله) کەسێك کەتائێستا خوای نەناسیبێ، دەڵێ خوا (الله) کێ یە؟! تۆش دەڵــێی خوا (الله) ئەو کەسەیە کە بەبەزەیی (رحمن)ە، بەخشندە (رحیم)یە، زانا (علیم)یە، توانا (قدیر) یە، کار بەجێ (حكیم) یە، بەخشەر (كریم)ە... هتد، کەواتە ناو و سیفەتەکانی خوابە ئیعتیبار یێك بریتین: لە ناو و نیشانی خواو لەو ڕووەوە هاوواتا (مترادف)ن. بەڵام لەو ڕووەوە کە وەسفی جیاجیان چونکە: وشەی زانا (علیم) وەسفی زانیاری خوا دەکات و وشەی توانا (قدیر) وەسفی توانایی خوا دەکات و و شەی بەخشندە (رحیم) وەسفی بەخشندەیی و لێبوردەیی خوا دەکات و و شەی بەخشەر (كریم) وەسفی کەرەم و بەخششی خوا دەکات و... هتد. جا بەم ئیعتیبارەی دووەمیان لە یەك جیاوازن. بە کورتی: ناو و سیفەتەکانی خوا: لەو ڕووەوە کە ناسێنەر (عَلَمْ)ن هاو واتان و لەو ڕووەوە شەوە، کە

وەسفن جیاوازن، واتە: بەو ئیعتیبارە کە ناوی خوان، هەموویان هاو واتان، بەو ئیعتیبارەش کە وەسفی خوان، هەموویان لە یەك جیان، بۆ وێنە: هەرکام لە وشەی (علیم، سمیع، بصیر، عزیز) ناوو نیشانن بۆ خواو ناوی خوای پەروەدگارن، لە هەمان کاتیشدا هەرکامێکیان وەسفێکی تایبەتە بۆ خوا، واتە ئێمە ئەو پێناسەو سیفەتەی کە لە (العلیم)دا دەیبینین، جیایە لەوەی کە لە (القدیر)دا دەیبینین، وە هەروەها سەرجەم ناوو سیفەتەکانی دیکەش بەهەمان شێوە.

## تێبینی سێیەم:

## ناوو سیفەتەکانی خوا بە گشتی پێنج جۆرن

جۆری یەکەم: تەنیا یەکێکە، ئەویش پێی دە گوترێ ناوی نا سێنەر (الأسم العَلم) واتە: ناو و نیشان، ئەویش بریتیە لە و شەی (الله) خوا، جا وشەی (الله) بۆ خوا ناوی عەلەمەو ناگو نجێ بۆ کە سی دیکە بەکاربێت بە پێ چەوانەی ناو و سیفەتەکانی دی کەوە کە دەگونجێ بۆ غەیری وی بەکاربێن. ئەوەتا خوای کار بەجێ و شەی (رؤوف، رحیم)ی بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەکارهێناوە، یان خەڵکێك ناوی لێ دەنرێت: (عزیز، قادر، علیم)، هەرکام لەو ناوانە مادام (ال)ی لەسەر نەبێت دروستە، چونکە هەموو کە سێك ئەندازە یەك (عزّة)و (قدرة)و (علم)ی هەر هە یە هەروەها سیفەتەکانی دیکەش، بەڵام کە (ال)ی چووە سەرو گوترا (العزیز، القادر، العلیم) ئەوە دروست نیە، چونکە زاتێك کە (عزة) هەمووی هی ئەو بێت و (قدرة) هەمووی هی ئەو بێت و (علم) هەمووی هی ئەو بێت، ئەوە بێگومان هەر خوایە، بەڵام ناوی خوا (الله) وا نیەو هیچ کەس دروست نیەو ناگونجێ ناوی خوا (الله)ی بۆ بەکاربێت.

کەواتە جۆری یەکەم لە ناوەکانی خوا، وشەی خوا (الله) یەو خوا (الله)ش ناوە نەك سیفەت، ناوی عەلەمە، وەك باسمان کرد، واتە ناوێکە کە خوا پێی دەنا سرێت بە تایبەتی، دیارە بە ناوو سیفەتەکانی دیکەش دەناسرێت، بەڵام ئەم ناوە تەنیا بۆ خوا بەکاردەهێنرێت.

جۆری دووەم: ئەو ناوانەی کە دەلالەت لەسەر سیفەتە (ذاتی) یەکان دەکەن. وەك (السميع، البصير، القدير، الحكيم، الحليم) چونکە ئەو جۆرە سیفەتانە هیچ کات لە خود (ذات)ی خوا جیا نابنەوە. جا سیفەتەکانی خوا بە گشتی دوو بەشن: خودیی (ذاتي)و کردەیی (فعلي)، سیفەتی (ذاتی) ئەو سیفەتانەن کە ناگونجێ هیچ کاتێك لە خوا جیابووبن، وە لە خوا جیاببنەوە، بۆ نموونە: (السميع) بیسەر، ئایا دەگونجێ هیچ کاتێك خوای پەروەردگار نەیبیستبێ؟! دیارە نەخێر، چونکە پێچەوانەی بیستن بریتیە لە: نەبیستن و کەڕیی، کە ئەوەش ناتەواویی و کەمو کوڕییەو خوای بێ هەڵەوپەڵە لێی دوورە، یان (القدير) توانا هەرگیز ناگونجێ خوای پەروەدگار بێتوانا (عاجز) بووبێ، یان (بصير) بینەر، ناگونجێ کە بینەر نەبووبێ، وە هەروەها سەرجەم سیفەتە خودیی یەکان، کە وەك گوتمان بۆیە پێیان دەگوترێ (الصفات الذاتية) سیفەتە خودییەکان چونکە هەمیشەو بەردەوام لەگەڵ خودی خوادان و هەرگیز لێی جیانابنەوە. بەڵام

سیفەتە کردەیی یەکان (الصِّفات الفعلیة) وانین و دەگونجێ لە خوا جیابن و هەمیشە لەگەڵی دانەبن وەك لە جۆری سێیەمی ناو و سیفەتەکانی خوادا باس دەکەین.

جۆری سێیەم: ئەو ناو و سیفەتانەن کە پێناسەی سیفەتێکی کردەیی (فعلي) خوا (عزّوجل) دەکەن: وەکو ناوەکانی: (الخالق، الرزاق، المحيي، المميت)، وە سیفەتەکانی (العلو، النزول، المجيء، الأستواء)، (خالق) واتە: بەدیهێنەر، (رازق) رۆزیدەر، (مُحيي) ژێینەر، (مُميت) مرینەر، (علو) بەرزیی، (استواء) سەرکەوتن، بەرزبوونەوە، (نزول) هاتنەخوار، (مجيء) هاتن، خوای کاربەجێ ئەو ناوانەی لە خۆی ناوەو ئەو سیفەتانەی بۆ خۆی بەکارهێناوە، ئنجا ئایا بۆچی پێیان دەگوترێ: سیفەتی کردەیی؟! چونکە: سیفەتە (ذاتي)یەکان وەك باسمان کرد هەمیشە لەگەڵ خوادان و لێی جیانابنەوە، لەگەڵ (ذات)ی دان، بەڵام ئەو سیفەتە کردەیی یانە، مەرج نیە هەمیشە لەگەڵ خوای پەروەردگار دابن، بەڵکو پەیوەستن بە ویست و ئیرادەی خواوە، چۆن؟! خوای زاناو توانا کاتێك ویستوویەتی خەڵك بخولقێنێ، لەو کاتەدا سیفەتی دروستکردن (خلق)ی لێدەرکەوتوە، بەڵام پێشترنا، کەواتە: ئەو سیفەتە سیفەتێکی کردەییە، هەڵبەتە سیفەتە کردەیی (فعلي) یەکان (بالقوة) هەمیشە لە خوای پەروەردگاردا هەر هەن، واتە خوای زاناو توانا هەمیشە (بالقوة) هەر بەدیهێنەر (خالق) بووە، بەڵام بەکردەوە

(بالفعل) كاتێك سیفەتی ( خالق) لە خوای بەرزو مەزن دا درەوشاوەتەوە، كە مەخلووقاتی دروست كردووەو كاتێك سیفەتی ژێینەری تێدا ئاشكرا بووەو دەركەوتوە، كە كائینات و خەڵكی ژیاندوەو كاتێك سیفەتی مرێنەر (مميت)ی تێدا دەر كەوتوە كە دروستكراوەكانی مراندوەو پێش ئەوەی بیان مرێنێ، ئەو سیفەتەی بە كردەوە (فعلي) تێدا پەیدا نەبووە، بەڵام وەك ئامادەیی ( بالقوة) خوای بەرزو مەزن هەر دروستكەرو ژێینەرو مرێنەرو رِۆزییدەرە، بەڵام بەكردەوە چ كاتێك خوای پاك و تاك سیفەتەكانی دروستكردن و بژیودان و ژیاندن و... هتدی تێدا دەركەوتوون؟! دیارە دوای ئەوەی كە بە كردەوە ئەو شتانەی كردوە بە ئیرادەی خۆی و لەو كاتەدا كە ویستوویەتی و بەو شێوەیە كە ویستوویەتی، ئنجا بە هەمان شێوە سیفەتەكانی: چوونە سەر عەرش (الأستواء على العرش)و هاتنەخوار (نزول)و هاتن (مجيء)یش هەموویان كاتێك لە خوای بێ وێنەدا وەك سیفەت هاتوونەدی كە خوا ئەنجامی داون، ئەگەرنا كاتێك بووە نە بارەگا (عرش) بووە، نە ئاسمان، نە زەوی، هیچ شتێك نەبووە، تەنیا خوا هەبووە، كەواتە ئەو كاتە لەسەر (عرش) نەبووەو نەچۆتە سەری، چونكە ( عرش) دروستكراوێكی خوایەو دیارە دروستكراوەكانیش هەموو سەرەتایان هەیە، بەڵام خوا (عزّو جل): (هو الأول)[(ت)]، واتە ئەو یەكەمەو سەرەتای هەموو شتێكەو كاتێك

---

(ت) (الحديد  3) .

(عرش) نەبووبێ مانای وایە خوا سیفەتی (الأستواء علی العرش)ی نەبووە، وە کاتێك کە ئاسمانی یەکەم نەبووبێ، مانای وایە خوای بەرزومەزن سیفەتی هاتنەخوار (نزول)یشی بۆ ئاسمانی یەکەم نەبووە.

بە کورتی: سیفەتە کردەیی (فعلي)یەکانی خوای زاناو توانا لەو کاتەدا کە ویستو ئیرادەی خوای تواناادار پەیوەندییان پێوە دەکاتو پێیانەوە پەیوەست دەبێ لەو کاتەدا دێنە دی و پێش ئەوە نین، بەڵام هەمیشە خوای بەرزو مەزن وەك ئامادەیی (بالقوة) سیفەتە کردەیی یەکانیشی وەك سەرجەم سیفەتەکانی دیکەی هەر هەیە.

جۆری چوارەم: لە جۆرو بەشەکانی سیفەت و ناوەکانی خوا: ئەو سیفەتو ناوانەن کە بێ هەڵەو پەڵەیی خوا دەگەیەنن، ئەوانەش بێگومان سیفەتی خودیی (ذاتي)ن، بەڵام بێعەیبی و بێهەڵەیی و بێپەڵەیی و بێ لەکەیی خوای پەروەردگار دەگەیەنن، وەك ناوی (القدوس) واتە بێهەڵەو بێ کەموکوڕیی، وە (السلام) واتە: سەلامەت و بێ عەیب، وە (العلي) واتە: بڵندو بەرز، وە سیفەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[١] واتە: هیچ شتێك وەك وی نیە، وە سیفەتی ﴿لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ﴾[٢] واتە: نە وە نەوز دەیگرێ و نەخەوی لێ دەکەوێ، وە سیفەتی ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ﴾[٣] واتە: بزانە کە جگە

---

(١) (الشوری  11) .
(٢) (البقرة  255) .
(٣) (محمد  19) .

لە خوا پەرستراوی دی نین، وە سیفەتی ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ (تر) واتە: نە کەسی لـێبووەو نە لە کەس بووە، وە سیفەتی ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾(یر) واتە: وە پەروەدگارت ستەمکار نیە بۆ بەندەکانی، وە سیفەتی: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِنْ شَيْءٍ﴾(سە)واتە: وە هیچ شتێك خوا دەستەوستان ناکات، وە سیفەتی: ﴿ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾() واتە: وەهیچ ماندوویێتیمان تووش نەبوو، وە سیفەتی ﴿لا تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ ﴾(لە)، واتە: چاوەکان ناتوانن دەرکی خوا بکەن و بیبینین، وە سیفەتی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً﴾()، واتە: ئایا پێیتان وایە بێحیکمەت و بە هەوەنتە درو ستمان کردوون؟! دیارە ئەمانە هەموویان چەند ناوو سیفەتێکن، کە بێ عەیبی و بێهەلەیی و بێکەمو کوڕی خوا (سبحانەو تعالی) دەگەیەنن.

جۆری پێنجەم: ئەو سیفەت و ناوانەی کە کۆکەرەوە ( جامع)ن، واتە: زۆربەی یاخود هەموو ناوو سیفەتەکانی دیکەی خوا کۆدەکەنەوە. وەك (المجيد) پایە بڵندو شکۆمەند، (العظيم) گەورە، مەزن

---

(تر) (الإخلاص  3) .

(یر) (فصلت – 46) .

(سە) (فاطر  44) .

() (ق – 38) .

(لە) (الأنعام – 103) .

() (المؤمنون  115) .

(الصَّمد) بێنیازو جێی نیاز، چونکە (الـ صَّمد) کە سێکە کە پێویستی بە هیچ کەس و هیچ شتێك نیە، بەڵام هەموو کەس و هەموو شتێك پێویستی بەویە، دیارە ئەویش تەنیا خوای بەرزو بێوێنەو هاوەڵە، ئاشکراشە کە ئەم سیفەت و ناوانە هەموویان کۆکەرەوە (جامع)ن.

**تێبینی چوارەم:**

**ناوەكانی خوای پەروەردگار، هەرچەندە هەموویان لەوپەڕی چاكی و بەرزیــــی دان، بەڵام چـاك و چاكتـرو بـەرزو بەرزتریــان هـەیە**

بەڵێ بەڕێزان!

بەڕای زۆربەی زانایان ناوەكانی خوای بەرزو مەزن چاك و چاكتریان هەیە وەك چۆن ئایەتەكانی قورئان، خۆ هەموویان هەر فەرمایشتی خوان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: گەورەترین ئایەت لە قورئاندا (آية الكرسي)[تر] یە، بێگومان قورئان هەمووی هەر فەرمایشتی خوایە، بەڵام فەرمایشتی خوا هەندێكی لە هەندێكی بەرزترە، چونكە ئەو فەرمایشتەی خوا، كە باسی خوا دەكات بەرزترە لەوەی، كە باسی شتێكی دی دەكات كە پەیوەندی بە ژیانی دونیاوە هەیە. دیارە هەندێك لە زانایان وەك (طبري و أشعري و ابن حبان و باقلانی) ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ، ڕایان وایە كە دروست نیە بگوترێ: ناوەكانی خوا چاك و چاكتریان هەیە، بەڵكو دەبێ بگوترێ: هەموویان هەرە چاكن و هەندێكیان لە هەندێكیان چاكتر نین، بەڵام بێگومان هەموویان هەرە چاكن، بەڵام دەشگونجێ لە هەرە چاكیشدا چەند پلەیەك هەبن وەك چۆن

(تر) وەك لە (صحيح البخاري) دا هاتوە .

لە لووتکەیەکی هەرە بڵندا چەند وردە لووتکە یەکی بەرزو بەرزتر دەبن، جا هەرچەندە ئەو کۆمەڵە زانایە وا دەڵێن، بەلاَم زۆر بەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە پێشتر خستمانە ڕوو، وە دەڵێن: فەموودەی ڕاست و ڕا شکاو ( صحیح و صریح)ی پێغەمبەر ﷺ هەن ئەوە دەگەیەنن کە هەندێك لە ناوەکانی خوا (سبحانە و تعالی) بەرزترن و چاکترن لە هەندێکیان، یەکێ لەو فەرموودانە ئەمە یە: (( عن أبي أمامة ان رسول الله ﷺ قال: اسم الله الأعظم الذي اذا دُعَي به أجاب في ثلاث سورٍ منَ القرآن: في البقرة، وآل عمران، و طه﴾[٢١] ئەبو ئومامە -ڕەزای خوای لەسەربێ- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ناوی هەرە مەزنی خوا، کە ئەگەر بەو لێی بپارێیەوە وەلاَم دەداتەوە، لە سێ سوورەتی قورئانێ دا یە: لە (بقرة)و (آل عمران)و ( طه)دا فەرموودەیەکی دیکە: ((عن أسماء بنت يزيد -رضي الله عنها- أنَّ النبيَّ ﷺ قال: أسم الله الأعظم في هاتين الآيتين: و إلهكم اله واحدٌ لا اله الا هو الرحمن الرحيم، وفاتحة آل عمران، ألم، الله لا اله الا هو الحي القيوم﴾[٢٢] واتە: ناوی هەرە گەورەی خوا لەم دوو ئایەتە دایە: ئایەتی یەکەم ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾[٢٣] ئایەتی دووەم

---

(٢١) رواه ابن ماجة، والحاكم والطبراني في الكبير بأسناد صحيح.

(٢٢) رواه الترمذي وابو داود وابن ماجة والدارمي بأستاذ صحيح.

(٢٣) (البقرة 163) .

سەرەتای سوورەتی (آل عمران) ﴿الٓمٓ، اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾(تر)، فەرموودەیەکی دی: ((عن بُريدة الأسْلَمي أنَّ رسول الله ﷺ سَمِعَ رجلاً يَدْعو وهو يقول: أللهم اني أسألك بأنّي أشهد أنَّكَ أنْت الله لا اله الاّ أنت الأحد الصَّمد الذي لم يَلدْ ولم يُولّدْ ولم يكنْ لّه كفواً أحَد، فقال والذي نفسي بيده لقد سأل الله باسمه الأعظم الذي اذا دُعي بِهِ أجاب، واذا سُئِل بهِ أعْطى))(یر)، واتە: پێغەمبەر ﷺ رۆژێك گوێی لە یەکێك لە هاوەڵانی بوو، کە دەپاڕایەوەو دەیگوت: ئەی خوایە من داوات لـێدەکەم بەوە، کە شایەدیی دەدەم، کە تۆ خوا (الله)ی، جگە لە تۆ پەرستراوێکی دی نیە، تۆ تاکی و بێنیازیو جێی نیازی، کەست لـێ نەبووەو لە کەس نەبووی، وە هاوتات نیە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، بە ناوی هەرە گەورەو هەرە مەزنی خوا پاڕاوەتەوە، کە ئەگەر بەو ناوە لە خوا بپارێیەوە، وەڵام دەداتەوە، وە ئەگەر داوای لـێ بکەی پێیت دەبەخشێ. کەواتە خوای پەروەردگار ناوێکی هەیە، کە لە هەموو ناوەکانی گەورەترە، ئنجا ئایا مەبەست لە گەورەترین ناو (اسم الأعظم) چیە؟ وە ناوی هەرە گەورەی خوا کامیانە؟ زانایان لەوبارەوە ڕایان جیاجیایە، هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە ناوی هەرە گەورەی خوا، ناوی خوای

---

(تر) (آل عمران: 1- 2).

(یر) رواه الترمذي وابو داود وابن ماجة والدارمي بأسـنادٍ صحيح.

(الله) یە ـ جل جلالە ـ، هەندێکیان گوتوویانە: (الرحمن)ە، وە هەندێکیان گوتوویانە (الحّي)یە، (ابن تیمیة) وای گوتوە، وە هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر، ناوی هەر مەزنی خوا لە چەند ناوێك پێکهاتوە، بۆ نموونە (الله الرّحمن الرّحیم)ە، وە هەندێکیان گوتوویانە (الحي القیّوم)ە، وە هەندێکیان گوتوویانە، (ذو الجلال و الأکرام)ە. بەڵام وا پێ دە چێت ڕای یەکەم کە دەڵێت: ناوی هەرە گەورەی خوا بریتیە لە وشەی: ( خوا) (الله) لە هەموویان ڕاستتر بێت، چونکە:-

یەکەم: لەبەرئەوەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ کە هاوەڵان تێیاندا لە خوا پاڕاونەوەو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فلانکەس بە ناوی هەرە گەورەی خوا پاڕاوەتەوە، وە ئایەتەکان کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ناوی هەرە گەورەی خوا لەو ئایەتانە دایە، لە سەرجەم ئەو فەرموودەو ئەو ئایەتانەدا، وشەی خوا (الله) هاتوە، بەڵێ وشەو ناوی دیکەش هاتوون، بەڵام لە هەر هەموویان دا تەنیا (( خوا)) (الله) دووبارە بۆتەوە.

دووەم: وە بە بەڵگەی ئەوە کە ناوی ((خوا)) (الله)، لە هەموو ناوەکانی دیکە زیاتر لە قورئانیدا هاتوە چونکە: دوو هەزارو شەش سەدو دوو (2602) جار وشەی (الله) لە قورئانیدا دووبارە بۆتەوە، بەڵام وشەی (الرّحمن) لە قورئانیدا تەنیا پەنجاو حەوت (57) جار هاتوە، وشەی (الرّحیم)یش کە بۆ خوا بەکار هاتبێ ـ چونکە جاری وایە بۆ

غەیری خواش بەکارهاتوە، وەك (رؤوف رحیم)(تر) کە بۆ پێغەمـبەر ﷺ بەکارهاتوە ـ، بەڵام گەر بۆ خوا بەکار هاتبێ سەدو چواردە (114)(یر) جار هاتوەو ئەوانی دیکە کەمتریش.

سێیەم: وە بە بەڵگەی ئەوە کە بێجگە لە (الله) ئەوانی دی هەموویان سیفەتن بۆ خوا، بەڵام (الله) ناگونجێ سیفەت بێ، کەواتە: هەموو ناوەکانی دیکە دەبن بە پێناسە بۆ (الله)، بەڵام (الله) نابێتە پێناسو وەسف بۆ ئەوانی دیکە.

چوارەم: وە بە بەڵگەی ئەوەی کە ناوی (الله) هەرگیز بۆ غەیری خوا بەکار نەهاتوەو نا شگونجێ بەکاربێت، بەڵام ئەوانی دی کە بەکارهێنراون و بەکاردێن.



(تر) ( التوبة  128) .

(یر) دیارە دووبارە بوونەوە (الرحمن) و (الرحیم) لە (بسم الله الرحمن الرحیم) ی سەرەتای سوورەتەکان دا حساب نەکراوەو ئەگەر حساب بکرێن ئاوای لێدێ : 57+114= 171 وشەی (الرّحمن) و 114+114= 228 جار وشەی (الرّحیم) دووبارە بوونەتەوە.

**تێبینی پێنجەم:**

## دەلالەتکردنی ناوەکانی خوا لەسەر (ذات)و سیفەتەکانی، بە هەرسێك جۆری (مطابقة و تضّمن و التزام)ەوە

دەلالەتی وشەیەك لەسەر مانایەكەی، سێ جۆری هەیە: (المطابقة، التضمن، الألتزام أو اللزوم)، سەرەتا با پێنا سەی ئەو سێ وشەیە بکەین: (المطابقة) ئەوەیە کە ناوێك یاخود وشەیەك دەلالەت لەسەر تەواوی مەعنای خۆی بکات، (التضّمن)یش ئەوەیە کە وشەیەك یاخود ناوێك دەلەلات لەسەر بەشێك لە مانایەكەی بکات، (الإلتزام) یان (اللزوم)یش ئەوەیە وشەیەك دەلالەت لە سەر مانایەك بکات کە نەتەواوی مانای ئەو وشەیەو نە بەشێکیشیەتی، بەڵکو بە جۆرێك پەیوەستە بەو وشەیەوە، ئێستاش با چۆنیەتی ئەوسێ جۆرە دەلالەتەی ناوەکانی خوا لەسەر ذاتو سیفەتەکانی روون بکەینەوە.

پێشتر بە کورتی پێناسەی هەرسێك وشەی: (مطابقة و تَضّمن و إلتزام)مان کرد بە وێنە هێنانەوەیەکیش چەمکی ئەو سێ جۆرە دەلالەتە روون دەکەینەوەو دەڵێین: بۆ وێنە: وشەی (الخالق) بە شێوەی پێکەڵپێك (مطابقة) دەلالەت دەکات لە سەر زاتی خوا وە لە سەر سیفەتی خواش، سیفەتی خوا کە دروستکردنە، وە زاتی خوای

پەروەدگاریش کە خاوەنی ئەو سیفەتەیە، چۆنیەتی ئەو دەلالەتەش ئاوایە: وشەی (الخالق) واتە: زاتێك كە دەتوانێ دروست بكات چا (الخالق) هەم دەلالەت لەسەر زاتەكە دەكات، هەم لەسەر سیفەتەكەش كە دروستكردنە، جا ئەگەر وشەی (الخالق) تەنیا دەلالەت لە سەر دروستكردن بكات، یاخود بەس دەلالەت لەسەر زاتی خوا بكات، ئەوە پێی دەگوترێ وەخۆگرتن (التضّمن) چونكە زاتی خوا بەشێكە لە مانای وشەی: (الخالق)، وە سیفەتی دروستكردنیش لە (ضمن)ی مانای (الخالق) دایە، ئەگەر نا تەواوی ماناكەی نیە، وە ناوی (الخالق) دەلالەت لەسەر زانیاری (علم)ی خواو لەسەر توانا (قدرة)ی خوا دەكات، بە شێوەی پەیوەست بوون (التزام)، چونكە: (خالق) سیفەتی زاتێكە كە دروست دەكات، دیارە دروستكردنیش بەبێ زانیاری و توانا و بەبێ ویستو خواست (إرادة ومشیئة) نابێ، كەواتە لازم دێت لە خالقیەتی خواوە سیفەتی زانیاریشیو سیفەتی تواناشی و سیفەتی ویستیشی، جا هەرچەندە ئەم باسانە هەندێك وردن، بەڵام هیوادارم هەرچۆن بووە بۆتان وەربگیرێ.

**تێبینی شەشەم:**

## چۆنیەتی پەیوەندی ناو و سیفەتەكانی خوا بە (ذات)ی یەوە ئەوەیە كە نە خودی وین و نە جیاشن:

ئەو مەسەلەیە تارادەیەك وردو ئاڵۆزە، زانایانی زانیاری عەقیدە دەربارەی سیفەتی خوا گوتوویانە: (لا هي هو ولا هي غيره) كە ئەمە وەك مەتەڵێك وایە، واتە: سیفەتەكانی خوا نەزاتی خوان، نە غەیری زاتی خوان، جا هەرچەندە ئەم قسەیە بە رواڵەت قسەیەكی ناكۆك (متناقض)ە بەڵام لە ڕاستیدا وانیەو بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست دەڵێین: بۆ نموونە: ئەگەر یەكێك پرسیارت لێ بكات: ئایا توانا (قدرة)ی خوا خودی زاتی خوایە، یان غەیری زاتی خوایە؟! ئەگەر بڵێی: خودی زاتی خوایە هەر هەڵەیە، وە ئەگەر بشڵێی غەیری خوایە، هەر هەڵەیە، بە ڕەهایی (مطلق)ی هەردووكیان هەڵەن. بەڵكو دەبێ بڵێین: ئەو مەسەلەیە دوو ڕووی هەن: بە ڕەهایی (مطلق)ی نە دەڵێین: سیفەتەكانی خوا خودی زاتی خوان، وە نە دەڵێین غەیری زاتن، بەڵكو دەڵێین: ئەوە دوو ڕووی هەیە:

یەکەمیان ئەوەیە کە: سیفەتەکانی خوا (تبارك و تعالى) بەبێ زاتی خوا نابن کەواتە لەم ڕووەوە بەم ئیعتیبارە سیفەتەکانی خوا (عزّو جل) لە زاتی جیانین بەڵکو پێیەوە پەیوەست (متلازم)ن.

ڕووی دووەمیان ئەوەیە کە: سیفەتەکانی خوا خودی زاتی خوا نین، واتە چەمك و واتایەکیان هەیە زیاد لەو چەمك و واتایەی کە و شەی (ذات) هەیەتی بۆ وێنە: سیفەتی زانیاری (علم)ی خوا کە بریتیە لە زانین و کە شفکردنی شتان، وە توا نایی (قدرة) کە بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەوەی کە دەویسترێ، وە سیفەتی قسەکردن (کلام) کە بریتیە لە دواندنی هەندێك لە خەڵکی کە پێغەمبەرانن (علیهم السلام)، ئەم سێ سیفەتە کە یەکێکیان زانین و دەرخستنی شتان و ئەوی دیکەیان جێبەجێکردن و ئەنجام دان و، ئەوی دیکەشیان قسەکردن دواندنە، هەرکامێکیان مانایەکی زیادەی هەیە لە مانای چەمکی (ذات) کە تەنها بوون (وجود)ی خوا دەگەیەنێو هیچ شتێکی دیکەی زیاد لەوەی لێ نافامرێتەوە، کەواتە: ناوو سیفەتەکانی خوا نە خودی (ذات)ی خوان و نە لێشی جیان.

شایانی باسیشە کە زانایانی ناسراو بە (أهل السنة) بۆیە وایان گوتوە. تاکو وەڵامی ئیشکالو پرسیارەکانی پیرو تاقمە داهێنەرەکان (أهل البدع) بدەنەوە، بۆ وێنە: (معتزلة) گوتوویانە: خوا (قدیرو حيّ و سمیع و حکیم و رّحیم و... هتدە)، بەڵام نالێین: خوا (قدرة وحیاة وسمع و

حکمة و رحمة و... هتد)ی هەیە!! بۆچی؟! گوتوویانە: چونکە ئەگەر بڵێین خوای پەروەردگار (حیاة)و (سمع)و (بصر)و (حکمة)و (رحمة)و (قدرة)و ئەوانەی هەیە ـ بە خەیاڵی خۆیان- چەند لەمێژنیەیی (تعدُّد القدماء) پەیدا دەبێت، واتە: چەند شتێکی بێ سەرەتا (قدیم) پەیدا دەبن و ئەوەش نەگونجاوە لەگەڵ خوا بە یەکگرتن (التوحید)دا، کەواتە: گوتوویانە دەڵێین: سیفەتەکانی خوا خودی زاتی خوان تاکو دوو چاری ئەو ئیشکالە نەبین! ئەوە قسەی (معتزلة)کانە، بەڵام (جهمیة)کان خراپتـریشیان گوتوە، کە گوتوویانە: ئێمە ناڵێیـن: خوای پەروەردگار سیفەتی هەیە یان نیە، وە (ذات)ی هەیە یان نا؟! چونکە سیفەت و ذات و ئەوانە هەموویان دروستکراو (مخلوق) تێیاندا بەشدارەو هەرشتێك دروستکراوی تێدا بەشدار بێت بۆ خوا بەکاری ناهێنین.

هەڵبەتە جەهمی یەکان زۆریان تێپەڕاندوە، بۆیە هەندێك لە زانایان جەهمی یەکانیان هەر بە کافریش داناوەو لە ڕیزی مسوڵمانان خستوویاننە دەرێ!

زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش گوتوویانە: نەخێر، ئێمە ناڵێیـن سیفەتەکانی خوای پەروەردگار خودی زاتەکەینی، بەو مانایە کە خوا (قدرة)و (سمع)و (بصر)و (حیاة)و ئەوانەی نیە، دەڵێین: خوا ئەو سیفەتانەی هەیە، بەڵام ناشـڵێیـن: لە زاتی خوای پەروەردگار جیان، واتە لە دەرەوەی زاتن، بەڵکو پێیەوە گرێ دراوو پەیوەستن، کەواتە: ناوو سیفەتەکانی خوا بە ئیعتیبارێك لەگەڵ (ذات)ن بە ئیعتیبارێکیش لە

(ذات) جیان، بۆیە ئەو قسەیەی زانایان کە گوتوویانە: سیفەتەکانی خوا نە خودی زاتینی نە لێشی جیان (صفات الله لا هي ذاته ولا هي غيره) شتێکی ڕاست و ڕەوا و بێ گرێیە. ئنجا لە ڕاستیدا ئێمە کە دەڵێین: خوا (الله) ئەو وشەیە، نە بە (ذات) دەگوترێ بە تەنیا، نە بە (صفات)یش دەگوترێ، بەڵکو بە هەردووکیان وێکڕا دەگوترێ، نەك هەر خوای بێوێنە بەڵکو هەموو شتێکی دیکەش هەروایە، چونکە ئایا چ شتێك هەیە کە تەنیا زاتی هەبێ بەبێ سیفەت یان سیفەتی هەبن بەبێ زات؟ دیارە هەرگیز ناگونجێ زاتی بێ سیفەت و سیفەتی بێ زات هەبێ، چونکە هەموو شتێك بەهۆی سیفەتەکانی‌یەوە دەزانرێ کە زاتی هەیە، (ولله المَثَلُ الأعلى)، کەواتە: زاتی بێ سیفەت هەر ناگونجێ هەبێ، مەگەر تەنها لە خەیاڵی ئینسانداو بە مێشك دابنێت و بیری لێبکرێتەوە!

زۆرجار ئەهلی بیدعەت و بیدعەتچی‌یەکان لە ئەنجامی ئەوەدا کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی مەنتیق و فەلسەفەی یۆنانی‌یەوە بۆیە بیریان لە شتی سەیرو سەمەرە کردۆتەوە، بۆ وێنە لە فەلسەفەی یۆنانیدا دەڵێ: (ماهية) یان (جوهر) واتە: ذات، لە گەڵ (أعراض) واتە: سیفەتەکان، لەیەك جیان و دەگونجێ لە یەك جیابن، جا ئێمە دەڵێین: ئەوە دەگونجێ لە خەیاڵدا لەیەك جیابێت، تۆ دەتوانی لە مێشکی خۆتدا ئینسانێك لەبەرچاو بگرێ بێ‌ئەوەی سیفەتی هەبن، بەڵام ئەوە تەنیا لە زەین و خەیاڵ دایەو لە دنیای واقیعدا شتی وا نیە!!

**تێبینی حەوتەم:**

## حوكمی بەكارهێنانی وشەی: (ذات)و (نفس)و (صفة)و (شيء) بۆ خوا (عزوجل)

ئەگەر تێبینیتان كردبێ هەم لە باسەكانی مەندا وە هەم لە كتێبەكانی ئیمان و عەقیدەو (علم الكلام)دا چەند وشەیەك بەكاردێن كە جێگەی سەرنجن، وەك (ذات، نفس، صفة، شيء) جا ئایا دروستە ئەم وشانە بۆ خوا بەكاربێن، یان نا؟! جا هەر لە سەرەتاوە بە كورتی دەڵێین، بەڵێ دروستە، بەڵێ دروستە بڵێی: (ذات)ی خوا، (نفس)ی خوا، (صفة)ی خوا، وە خوا شت (شيء)ە، بەڵام بێگومان كە دەڵێین: ذاتی خوا، نەفسی خوا، سیفەتی خوا، خوا شتە، هیچ كام لەم وشانە بەو چەمك و مانایە نیە، كە لە مێشكی ئێمەدا هەیە چونكە هەرچی لە مێشكی ئێمەدا هەیە لە كاتێكدا كە وشەی (ذات، نفس، صفة، شيء) بەكار دێنین لە چەمك و واتا هەمووی لە چوار چێوەی ماددەو ڕواڵەتەكانیدا دەسووڕێ، یان هەرچەند بێ لە جوغزی دروستكراوەكاندا دێت و دەچێ جا چ ماددی بن چ مەعنەویی وەك ڕووح، كەواتە چەمك و واتای سەرجەم ئەو وشانەی كە بۆ خوا بەكاردێن، هیچی ئەوە نیە كە لە مێشك و خەیاڵی ئێمەدا هەیە بەڵكو دەبێ تەنها ئەوەبێ كە بۆ خوا

شایستەیە، ئنجا ئایا ئەو وشانە بۆ خوا بەکارهاتوون؟! دەڵێین بەڵێ و با سەرنج بدەین:

1 ـ جارێ وشەی (ذات) بۆ خوا بەکار هاتوە لەسەر زمانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ وەك لەم فەرموودەیەدا دەیبینین: ((عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: لَمْ يَكْذِبْ ابراهيمُ قَطُّ الاّ ثلاث كذباتٍ، ثِنْتَيْنِ في ذات الله، قوله (إني سقيم)، وقوله (بَلْ فَعَلَه كبيرهم هذا) و واحدة في شأن سارة: إنَّكِ أختي))[(ت)] واتە: ئیبراهیم هەرگیز درۆی نەکردوە تەنیا سێجار نەبێت، (هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ بەڵێ ناوی لێیان ناوە (درۆ) بەڵام نەك درۆی بێ پێچ و پەنابن، بەڵکو لە شێوەی درۆ دان، ئەگەر نا لە حەقیقەتدا درۆ نین و زانایان بەم جۆرەیان دەڵێن: (تعریض) واتە لەبەر ڕاهاویشتن) جا دە فەرموێ: دوویان لە پێناوی زاتی خوادا بوون، ئەوەیان کە گوتوویەتی (انی سقیم) من نەخۆشم، بۆ ئەوەی پاساو بهێنێتەوە، لە دەرنە چوونی لەگەڵ قەومەکەیدا بۆ ئاهەنگ و سەیران، تاکو بتوانێ بتەکان بشکێنێ، ئەوە بوو گوتی: من نەخۆشم، واتە: دڵم نەخۆشە بەو بت پەرستییەی ئێوە، ئەوانیش وا حاڵی بوون کە نەخۆشی جەستەیی هەیەو وازیان لێهێنا، وە هەروەها ئەوەش کە فەرموویەتی: (بل فعله کبیرهم هذا)، دوای ئەوەی بتەکانی شکاندو خەڵکەکەش

(ت) متفق علیه: الأسماء والصفات: للبیهقي: بەرگی/2 لاپەرە (5).

گەڕانەوە زانیان کە ئیبڕاهیم ئەو کارەی کردوە، لێیان پرسی: بۆ چی ئەو کارەت کردوە؟! ئەویش گوتی (بل فعله کبیرهم هذا) بەڵکو ئەم گەورەیان وای کردوە، چونکە ئەو تەورەی کە بتەکانی پێ شکاندبوون، لە ملی بتە گەورەکەی پێچابوو، گوتی: ئەو ئاوای لەو بتە بچووکانە کردوەو ڕازی نەبووە بن بە شەریك و هاوبەشی، کە ئەوەش بەڵێ لە ڕواڵەتدا وەك درۆیە، بەڵام مەبەستی ئەوە بوو کە پێیان بسەلمێنێ خوا بەیەکگرتن (التوحید) شتێکی حەقیقەت و ڕاستەو سەیر بکەن کە ئەو بتە گەورە ڕازی نەبووە، ئەو بتە بچووکانە شەریك و هاوبەشی بن، ئەی خوای پەروەردگار چۆن ڕازی دەبێ کە بت (صنم) بکرێن بە هاوبەش بۆی؟!. ئەوەی سێیەمیشیان ئەوەبووە کە ئیبڕاهیم کۆچی کرد بۆ (مصر) لە پێناوی خواداو (سارة)ی خێزانی لەگەڵ دا بوو، کە ئافرەتێکی زۆر جوان و بەر چاو بو، جا بە (سارة)ی گوت: من لێرە بە تۆ دەڵێم خوشکمە، چونکە ئیماندار بەس من و تۆ لەسەر زەوی هەین، دە لێم: تۆ خوشکی ئیمانی منی، بەڵێ خێزانی منی و پێم دەشێ، بەڵام دە لێم تۆ خوشکی منی و دروستە وات پێ بلێم، چونکە پاشای ئەوکاتی (مصر) عادەتی وا بوو هەرکەسێك هاوسەری جوانی پێ بوایە، لێی زەوت دەکرد، بەڵام ئەگەر خوشکی بووایە دەستی لێ نەدەدا، جا ئیبڕاهیم ئەوەشی گوت، بۆ ئەوەی (سارة) بپارێزرێ، ئەوە بوو خوای

پەروەدگاریش پاراستی. وە هەروەها هەر دەر بارەی و شەی (ذات) دەڵێین: کاتێك هاوبەش دانەرەکان ویستیان خوبەیبی ئەنصاریی - خوا لێی ڕازی بێ- شەهید بکەن، ئەو دوو دێرە شیعرەی گوت:

وَلَسْتُ أبالي حين أُقْتَل مُسْلماً    على أيِّ شقٍ كان في الله مَصْرَعي
وذلــك في ذات الأله وإنْ يَشَأْ    يُبارِكْ على أوصالٍ شِــلْوٍ مُمَزَّعِ[٣٢]

واتە: گوێ نادە مێ کاتێك لە پێناوی خوادا دە کوژرێم، بە مسوڵمانەتی، کە لەسەر کام لە تەنیشتم دە کەوم، ئەوەش لە پێناوی (ذات)ی خوا دایە، وە ئەگەر خوا بیەوێت ئەو لا شەیەی من کە پارچە پارچە دەبێت وە دەبێتەوە خاك، خوا بەرە کەتی دەخاتێ و کاتێکی دی زیندووی دەکاتەوە.

2 ـ وشەی (نفس)یش خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك بۆ خۆی بەکارهێناوە، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ﴾[٣٣]، واتە: خوا لە نەفسی خۆی وریاتان دەکاتەوەو دەتانترسێنێ، وە دە فەرموێ: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾[٣٤]، واتە: پەروەردگارتان لە سەر نەفسی خۆی ڕەحمەتی تۆمار کردوە کە لە گەڵ درو سکراوەکانیدا بەرِەحم و بەزەیی بێت، بە تایبەتی لە گەڵ ئیمانداراندا، یان

(٣٢) رواه البخاري: الأسماء والصفات: للبيهقي: بەرگی/2 لاپەڕە 5 ، 6 .
(٣٣) (آل عمران – 28) .
(٣٤) (الانعام – 54) .

دەفەرموێ: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾[1]، واتە: ئەی موو سا تۆم بۆ نەفسی خۆم هەڵبژاردوەو پێگەیاندوە.

3 ـ وشەی (صفة)یش، دیسان بۆ خوای بێوێنە بەکارهاتوە، وەك لە ئایەتێكدا هاتوە، دە فەرموێ: ﴿ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾[2]، واتە: پاکی بۆ پەروەردگارت خاوەنی عیززەت لەوەی کە ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن وە (عائشة)ش -خوا لێی ڕازی بێ-، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێکی نارد بە فەرما ندەیی (سَرِيَّة)یەك، جا ئەو هاوەڵە عادەتی وا بوو کە پێشنوێژی دەکرد بۆ هاوەڵەکانی، هەموو جارێ لە قورئان خوێندنی دوای (الفاتحة)دا سوورەتی (الأخلاص)ی دەخوێند، جا کاتێك گەڕانەوە، بۆ پێغەمبەریان گێرایەوە (علیه الصلاة والسلام)، ئەویش فەرمووی پێی بڵێن: بۆچی وای کردوە؟ لێیان پرسی، ئەویش ئاوای وەڵام دایەوەو گوتی: ﴿لأَنَّها صِفَةُ الرّحمن، وأنا أُحِبُّ أَنْ أَقْرأَ بِها، فقال النبي ﷺ أَخْبِروهُ أَنَّ اللهَ يُحِبُّه﴾[3] واتە: چونکە سوورەتی (الأخلاص) سیفەتی خوایە، سیفەتی (رّحمن)ە، من حەز دەکەم هەموو جارێ بیخوێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەواڵی پێ بدەن کە خواش ئەوی خۆش دەوێ!

---

[1] (طــه 41) .

[2] (الصفات – 180).

[3] رواه البخاري

4 ـ وشەی (شيء)یش، خوای پەروەدگار دەفەرمویّ (جل جلاله) ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾[1]، واتە: هەموو شتێك لە نێو دەچێ جگە لە ڕووی خوا، لێرەدا (وَجْه)، هەندێ لە زانایان ئاوا بە (ڕوو)ی لێك دەدەنەوەو هەندێکیش بە (ذات)، جا ئەوە لێردا (إستثناء)ی (متَّصل)ە، کە لەو حاڵەشدا هەڵاوێراو (مُستثْنی) لە جینسی لێهەڵاوێراو (مستثنی منه)ە، کەواتە (وجه)ی خوای پەروەردگاریش (شيء)ە، بەڵام (شيء)ێکە کە لە نێو ناچێ.

بەڵام وەك پێشتر گوتمان: بێگومان چەمك (مفهوم)ی ئەو وشانە کە باسکران، بۆ خوای بێوێنە، بە شێوەیەکە کە لە خوای تاكو پاك بوەشێتەوە.



---

[1] (القصص - 88).

## تێبینی هەشتەم:

## سیفەتەکانی خوا لە ناوەکانی فراوانترن

واتە: هەموو ناوەکانی خوا، جگە لە ناوی خوا (الله) سیفەتن بۆ خوا، بەڵام مەرج نیە هەموو سیفەتەکانی خوا بگونجێ بکرێنە ناو بۆ خوا، بە تایبەتی سیفەتە کردەیی (فعلي)یەکان، بۆ نموونە: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ ناگونجێ و دروست نیە (استواء) بکەین بە ناوی بۆ خواو بڵێین: (مُسْتَوي) ناوی خوایە، یان کە دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾(١) ناتوانین بڵێین (جائي) ناوی خوایە، یان کە دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ﴾(٢) دروست نیە بڵێین (ماکر) ناوی خوایە، یان کە دەربارەی (منافق)ەکان دەفەرموێ: ﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾(٣) دروست نیەو ناگونجێ بڵێین (مُخادِعْ) ناوی خوایە، کەواتە: مەرج نیە هەموو سیفەتەکانی خوا ناو بن بۆ خوا، بەڵام هەموو ئەوانەی کە ناون بۆ خوا سیفەتیشن بۆ خوای تاك و پاك.

---

(١) (الفجر 22).
(٢) (آل عمران 54).
(٣) (النساء 54).

## تێبینی نۆیـەم :

## جـۆرەکـانی لادان لە ناوەکـانی خـوادا سـێن

خوای پەنهانزان دەربارەی لادان (إلحاد) لە ناوەکانیدا دە فەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(1) واتە: وە خوا ناوی هەرە چاکی هەن، جا بە ناوە چاکەکانی لێی بپارێنەوە، وە واز لەوانە بێنن کە لادان دە کەن لە ناوەکانیدا لەمەو دوا سزای ئەو لادانەیان دەدرێتەوە. جا ئەم لادانە لە ناوەکانی خوای تاك و پاکدا سێ جۆرە:

(یەکەم): نکوولێی کردن و بڕوا پێ نەهێنانی ناو و سیفەتەکانی خوا، وەك خوای بەرزو بێهاوەڵ لە هاوبەشدانەر (مشرك)ەکان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُوراً﴾(2) واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ سەجدە بەرن بۆ (رّحمن) دەڵێن: (رّحمن) چی یە؟! ئایا سەجدە بۆ ئەوە بەرین کە فەرمانمان پێدەکەی! وە هەر زیاتر دوورکەوتنەوەو سڵەمینەوەیان لە سوڵحی حودەیبیە یەدا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بنوو سە:

---

(1) (الاعراف  180).

(2) ( الفرقان  60).

(بسم الله الرحمن الرحيم) موشریکەکان گوتیان ڕازی نابین دە بێ بنوو سری (باسمك اللهم)، پێغەمبەرو هاوەڵان فەرموویان بۆچی؟! گوتیان خوا دەناسین، بەڵام (الرّحمن الرّحیم) ناناسین، (رحمن) کابرایە کە لە (یمامة)، وە (رحیم)یش کابرایەکە لە شوێنکی دی!! بڕوا یان بەوە نەبوو کە خوای بەرزو مەزن دوو ناو و سیفەتی گەورەو پەسندی هەن بە ناوی (الرحمن الرحیم) جا ئەوە جۆرێکە لە لادان (الحاد) لە ناوەکانی خوادا، کە داننەهێنان و بڕوانەبوونە بە ناوەکانی خوا.
(جهمیة)کان و زۆربەی (معتزلة)کانیش گوتوویانە: دروستە بڵێی: خوای پەروەردگار (حیّ)یەو (قیوم)ەو (سمیع)ەو (بصیر)ە، بەڵام نابێ بڵێی: خوا (حیاة)و (سمع)و (بصر)و ئەوا نەی هە یە، وەك پێ شتر باسمان کرد.

جا ئەوەش بێگومان جۆرێکە لە نکوولّی لە ناو و سیفەکانی خواو جۆرێکە لە لادان (إلحاد) لە ناو سیفەکانی خوای بەرزو بێوێنەدا بەڵام لەبەرئەوەی کە بە جۆرێك لە (تأویل) بووە، زانا یان بە کافریان لە قەڵەم نەداون.

(دووەم): ئەوەیە کە ناوەکانی خوا یان سیفەتەکانی خوا، بۆ غەیری خوا بەکاربهێنرێن، وەك (فیرعەون) کە خۆی بە پەرستراو (إله) دادەنا وە دەیگوت: ﴿لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهاً غَيْرِي﴾ [1]، واتە: ئەگەر ج گە لەمن

---

[1] (الشعراء 29).

پەرستراوێکی دیکەت هەبێ ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم! بێگومان، هەر خوا پەرستراو (إله)ە، ﴿لا إله الا الله﴾ بەلاّم فیرعەون خۆی بە پەرستراو (إله) دەزانی!، هەروەها (فیرعەون) خۆی بە پەروەردگار (رب)یش ناو بردوەو گوتوویەتی: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى﴾ []، واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، هەروەها نەمروودیش گوتوویەتی: ﴿أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ﴾ [ه] واتە: منیش دەژیێنم و دەمرێنم!، سیفەتی ژیاندن‌و مراندنی پاڵداوەتە لای خۆی لە حاڵێکدا کە تەنیا سیفەتی خوای بێهاوتان! کەواتە: ئەگەر دروستکراو سیفەتی خوای پاڵبدرێتە لا ئەوەش جۆرێکە لە جۆرەکانی لادان (إلحاد) لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ ناوو سیفەتەکانی خوادا، شایانی باسە کە لەو بوارەدا هەندێك لە ئەهلی تەصەووفیش تووشی خلیسکان‌و لادان بوونە، ئەوانەی کە پێیان وایە شێخەکەیان وەك چۆن خوا (عزوجل) نادیار (غیب) دەزانێ، ئەویش دەیزانێ[س]!، یاخود شێخەکەیان وەك چۆن خوا شیفا دێنێ، ئەویش شیفا بۆ نەخۆشان دێنێ! بێخەبەر لەوە کە شیفاهێنان تایبەتە بە خواوە: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ [] یاخود

---

(تر) (النازعات  24).

(ير) (البقرة  258).

(سم) لە حاڵێك دا کە خوا زانینی غەیبی تایبەت کردوە بە خۆیەوە: ﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ (النّمل – 65).

() (الشعراء  80) .

وەکو چۆن خوا لە گوناحی خەڵك خۆش دەبێ، شێخیش دەتوانێ لە خەڵك خۆش بێ! لە حالێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... إنه لايغفر الذنوب الا أنت)) (تر)، واتە: بێگومان جگە لە تۆ هیچکەس لە گوناهان نابووری.

(سێیەم): ئەوەیە کە سیفەتی دروستکراوەکان پاڵبدرێتە لای خوا وەك: جوولەکەکان دەیانگوت: ﴿إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ﴾ (یر) واتە: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، خوایان بە هەژار دادەنا ( سبحانه و تعالى)، یان دەیانگوت: ﴿يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ (سهم) خوا دەستی قوو چاو و نووقاوەو نابەخشێت. وەیان دەیانگوت: خوا ڕۆژی یەك شەممەو دووشەممەو سێ شەممەو چوار شەممەو پێنج شەممەو جومعە، هەموو شتەکانی دروستکردن و ڕۆژی شەممەش پشووی داوە، چونکە ماندوو بووە، بۆیە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِنْ لُغُوبٍ﴾ (□) واتە: ئێمە لە شەش ڕۆژاندا ـ کە خوا خۆی دەزانێ شەش ڕۆژە کە چەندن (□) ـ،

---

(تر) (متفق عليه) .

(یر) (آل عمران □ 181) .

(سهم) (المائدة – 64) .

(□) (ق – 38) .

(□) وەك لە شوێنی دیکە ڕوونمان کردۆتەوە مەبەست لەو شەش ڕۆژە شەش قۆناغە لە کات کە هەر خوا دەزانێ ماوەکەیان چەند بووە .

ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان دروستکردوە و هیچ ماندووبوونمان تووش نەبوو! یان وەك نەصرانییەکان کە وشەی باب (أب) بۆ خوا بەکاردێنن یان فەیلەسووفەکان کە وشەی هۆکاری ئەنجامدەر (العلة الفاعلة)یان عەقلی کارا (العقل الفعّال) یان خۆ پێویستکەر (الموجِب لِذاتِهِ) وەك ناو و سیفەت بۆ خوا بەکاردێنن، کە ئەمانە هەموویان لادان (إلحاد)ن.

وە خوا بە جەستەدانەر (مجسِّمة)و وێ چوێنەر (مُشَبِّهة)ەکان، کە دەڵێن: خوا ڕووی وەك ڕووی ئێمەی هەیەو دەستی وەك دەستی ئێمەی هەیەو لەسەر (عرش)ە، وەك چۆن ئێمە لەسەر کورسی دادەنیشین و... هتد!! وە هاوبەشی بۆ خوا دانەر (مشرك)ەکان کە ناویان لە بتەکانی خۆیان دەنا (اللاّت، العُزّى، المَناة) کە ئەمانە بە مێینەکردنی (تأنيث)ی ناوی (الله)و (عزیز)و (منّان) بوو، ئەمانە سەرجەمیان لادانن لە بواری ناو و سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن و بێوێنەدا.

## تێبینی دەیەم :

## دەلالەتکردنی ناوەکانی خوا لەسەر سیفەتێك هەم چەسپاندنی سیفەتەکەو هەم ئەو ناوەش کە لێی دەردەهێنرێ، دەگەیەنێ

بەڵێ بەرِێزان! کاتێك ناوێك بۆ خوا بەکاردێت دووشتمان دەگەیەنێ:
یەکەم: چەسپاندنی ئەو سیفەتە.
دووەم: ئەو ناوە کە لە سیفەتەکە دەردەهێنرێ.

بۆ وێنە: زیندوو، ژیاو (الحيّ) هەم دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە خوا ناوی (حيّ)یە، واتە: ژیاوە، زیندووە، وە هەم دەلالەت لە سەر سیفەتی ژیان (حیاة)یش دەکات بۆ خوای پەروەردگار، بەڵام ئەگەر ناوەکانی خوای بێهاوتا دەلالەت لەسەر سیفەتێك بکەن کە سیفەتەکە پەیوەندی هەیە بە دروستکراوەکان (مخلوقات)ەوە، واتە سیفەتێکی (متعدِّي)یە، (الرّحمن، الرّحیم، الخالق) ئەوە دەلالەت لەسەر سێ شت دەکات: یەکەم: لەسەر ناوی خوا، دووەم: لەسەر ئەو سیفەتە، سێیەم: لەسەر حوکمی ئەو سیفەتە، بابزانین چۆن؟! بۆ نموونە: خوای کاربەجێ لە سوورەتی (المائدة)دا باسی ئەوانە دەکات کە رێگریی دەکەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ

رَحِيمٌ﴾(ﮋ) واتە: بێجگە لەوانەی کە پەشيمان دەبنەوە ـ وە دەگەڕێنەوە ژێر ڕکێفی حوکمی ئيسلامی ـ پێش ئەوەی کە دەسەڵاتتان بە سەرياندا هەبێت، ئەوانە بزانن کە خوا لێبووردەی بە بەزەيی يە. زانايان لەوە هەڵێنجان (استنباط)يان کردەوە کە ئەگەر کەسێك ڕێگريشی کردبێت، مادام پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر ڕکێفی حوکم و دە ستەڵات، بۆ خۆی هاتەوە، ئەوە خوا هەم لە قيامەت لێی خۆش دەبێ و هەم لە دونيا شدا نابێ سزا بدرێت، بۆچی؟ چونکە خوا فەرموويەتی: خوا لێبووردەی بە بەزەيی يە، کەواتە دەبێ حوکمی لێبوردن و ڕەحمەتی خوای بەخشندە لەو دوو ناوەو لەو سيفەتەی خوادا دەربهێنرێ و بە سەر ئەو مە سەلەيەدا بچەسپێ کە خوای کاربەجێ باسی کردوە. کەواتە: سيفەتەکانی خوا لە ڕووی پەوەندی هەبوون و نەبوونيان بە دروستکراوەکانەوە دوو بە شن: بەشێکيان پەيوەستن بە (ذات)ی خۆيەوە، بەڵام بەشێکيان پەيوەستن بە دروستکراوەکانەوە، بۆ وێنە: ناوی ژياو، زيندوو (حيّ)، کە سيفەتەکەی بريتيە لە ژيان (حياة) دەڵێيـــن: خوا (سبحانەو تعالى) زيندوو (حيّ)و ژيان (حياة)يشی هەيە. جا ئەو سيفەتە دوو شتی لـێوەردەگيرێن: يەکەم: ناوی خوا، کە (حيّ)يە، دووەم: سيفەتی (حياة)، واتە: ئەو سيفەتەی کە ئەو ناوە دەلالەتی لەسەر دەکات، بەڵام ئەگەر ناوەکانی خوای بەرزو مەزن دەلالەت لەسەر سيفەتێك بکەن کە ئەو سيفەتە

(ﮋ) (المائدة ﮋ 34) .

پەیوەست بێ بە مەخلووقاتەوە، وەك (خالق)، (رحمن)، (رحیم)، (رازق)، (توّاب)، ئەو ناوانە کە ناگونجێ بەبێ غەیر هەبن، ئەوەی پێشتر ـ سیفەتی (حيّ) ـ پێویستی بە مەخلووقات ناکات چونکە خوا هەر بۆخۆی (حيّ)یە، بەڵام سیفەتی (خالق)، بەبێ (مخلوق)ێك دەرناکەوێ و بەبێ بژیوپێدراو (مرزوق)ێك سیفەتی (رازق) دەرناکەوێ و دەبێ رِحم پێکراو (مرحوم)ێك هەبێ ئنجا سیفەتی رەحمەتی خوا دەردەکەوێ، وە ئەوانی دیکەش هەروا، جا لەبارەی ئەو ناوانەوە کە دەلالەت لە سەر سیفەتێك دەکەن کە پەیوەستە بە دروستکراوەکان (مخلوقات)ەوە ئەوە سێ شتیان لــێوەردەگیرێن: یەکەم: ناوی خوای پەروەدگار، بۆ وێنە: سیفەتی (الرحمن) بەبەزەیی، خوای بەخشندە بۆ خۆی (رحیم)ەو رەحمەتیشی هەیە، (رحیم) ناوەکەیەتی و (رحمة) سیفەتەکەیەتی، وە رەحم پێکراو (مرحوم)ێکیش دەبێ هەبێ کە خوا رەحمی پێ کردبێت. جا لە هەر شوێنێك لە قورئانێدا ئەو ناوانە بەکارهاتبــن، هەم ناوی خوا، هەم سیفەتەکەی، وە هەم حوکمێکیش کە دراوە، دەگەیەنن، وەك ئەو ئایەتەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد لە سوورەتی (المائدة)دا سەبارەت بەوانەی کە چەتەیی و رێگرییان کردوەو پاشان خۆیان داوە بەدەستەوە لەو کارە پەشێمانییان دەربڕیوە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1]، لێرەدا ئەو ناوی

(تر) (المائدة 34).

(رحیم)ە سێ شتان دەگەیەنێ، یەکەم: ناوێکە بۆ خوای پەروەدگار، دووەم: سیفەتی بەزەیی (ر حمة) خوا دەگەیەنێ. سێیەم: وە ئەو حوکمەشی لـێوەردەگیرێ کە نابێ ئەو جۆرە کەسانە سزا بدرێن، چونکە خوا فەرموویەتی: من (لێبوردەو بە بەزەیی)م بۆ ئەوان! یان لە سوورەتی (الحجرات)دا خوای بەخشندە باسی ئەوانە دەکات کە گومانی خراپ بە خەڵك دەبەن و جاسووسی دە کەن و غەیبەت دە کەن، لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾[١] دیارە زانایان لێرەدا دوو ڕایان هەن: هەندێکیان دەڵێن: غەیبەت و ئەو شتانە مافی خەڵك (حق الناس)ن و بە تۆبەش هەر لاناچن، مە گەر خاوە نەکانیان (ئەوانەی ئەو خراپانەیان دەرحەق کراوە) لێیان خۆش بن بەڵام ئەو زانایانەی دیکە کە بێگومان[٢] بۆچوونی ئەوان ڕاستـتـرە ـ دە ڵێن: نەخێر: بەڵکو لادەچن مادام تۆبەیەکی باش بکات، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ﴾[٣] واتە: وە پارێز لە خوا بکەن بێگومان خوا تۆبە وەرگری بەبەزەییە، واتە: ئە گەر پەشیمان ببنەوە لەو غەیبەت و تاوانانە، خوا تۆبەتان لـێ قبووڵ دەکات. خوای بەخشندە ناوی (تّواب)ی هەیەو سیفەتی تۆبە

---

(١) (الحجرات 12).

(٢) بەڕای خۆم کە بە تەواوییش لێی دڵنیام، وەك لە کتێبی (گـەڕانەوە لای خوا)دا باسم کردوە.

(٣) (الحجـرات 12).

قبوولکردنی هه یه، وه که سێکیش بگەڕێتەوه بۆ لای خوا ئەوه گەڕانەوەکەی قبووڵه، هەروەها خوا ناوێکی شی (رحیم)ەو سیفەتی بەزەیی (رحمة) هەیه، کەواته که سێکیش واز له غەیبەت و هەر گوناهێکی دیکه بێنێ ئەوه خوای بە بەزەیی ڕەحمی پێ دەکات.

بەکورتی: هەر ناوێکی خوا که تایبەت بێ به خۆیەوه، دوو حوکمی لێ وەردەگیرێن، ناوه کەو سیفەتەکە، بەڵام ئەگەر پەیوەست بێ به دروستکراوەکانەوه، ئەوه سێ شتی لێوەردەگیرێن: ناوەکەی و سیفەتەکەیو حوکمێکیش که لەو ناوه وەردەگیرێت، جا ئەو ناوه هەرکام له ناوەکانی بێت که پەیوەندییان به دروستکراوەکانییەوه هەیه، بەڵام حاڵەتی دروستکراوەکان وانیه، بەڵکو هەیه ناوی بەخشەر (وهاب)ە، بەڵام ڕەنگه هیچ نەبەخشێت، یان جاری وایه یەکێك ناوی (زانا)یه بەڵام ڕەنگه (نەزان) بێت، یان یەکێك ناوی (حکیم)ە بەڵام ڕەنگه له واقیعدا (أحمق) بێت، کەواته به نسبەت دروستکراوەکانەوه جاری واهەیه هەر ناوەکه بۆ خۆی له خۆیدا هەڵەیەو ناوەکەشی له جێی خۆیدا نییه، سیفەتەکەشی تێدا نیەو حوکمەکەشی هیچی لێ وەرناگیرێ، بەڵام خوای بێوێنەو هاوەڵ هەمیشه ناوو نابراو (إسم و مسمَّى) پێکەڵپێك (متطابق)ن!

# ئــــەم بەنـــدە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەندەی سێیەمە، کە لە هەردوو دەرسی سێیەمو چوارەم پێ ـکدێ وەك لە ناوونیشانەکەیەوە دیارە، تەرخان کراوە ـبۆ توێژیـنەوەی پـێنج بنچینەی گەورەو گرنگ، کە زانایانی ڕەسەن لەسەریان ڕێککەوتوون بۆ چۆنیەتی هەڵ سوکەوتکردن لە ـگەڵ ـناوو سیفەتە ـبەرزو پە سندو بێوێنەکانی خوای تاكو پاکدا (سبحانەو تعالی)، ئەمەش ناوونیـ شانی ئەو بنچینانەیە:

1 ـ ناوبردن و وەسفکردنی خوا (عزَّوجلّ) بەو ناو و ســـیفەتانەی، ـکە بۆ خۆی ـلە قورئا ـندا ـیان پێغەمەرە ـکەی ﷺ ـلە سوننەتیدا خستوویاننە ڕوو.

2 ـ ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگـــــار هەموویان هەر ـبوو و بێ سەرەتان.

3 ـ لێکدانەوەی مانای ناو و سیفەتەکانی خوا (عزَّو جّل) ـبە ـپێی ڕوا ـڵەتی و شەکان و بنـ چیەنەکانی ز مانی عەرەبی و ـبە لەبەرچاوگرتنی ئەو سیاقەی کە تێیدا هاتوون، و ـێڕای ـبە ـپاكو بەرزگرتنی خوا لە هەر کەمو کووڕیی‌و پەڵەیەك.

4 ـ نائومێد بوون لە زانین و پەی پێبردنی حەقیقەتی ناو و سیفەتەکانی خوا (عزّوجل).

5 ـ هەر ناو سیفەتێکی خوا بە دەقێکی وەحی راست و راشکاو ئیسپات بوو وەك ناوو سیفەتەکانی دیکەی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ‌و نابێ بە بیانووی تێکگیرانی لەگەڵ عەقڵ دا تەئویل بکرێ مەگەر ناچار بین.

شایانی باسیشە ئێمە ئەو دوو دەرسەی کە ئەم پێنج بنچینەیان گرتوونە خۆیان لە بەر تێکهەڵکێشی باسەکان لە یەکمان جیانەکردوونەوەو هەر پێکەوەمان هێناون.

# دەستپێك

بەرێزان!

لەم با سەماندا چەند بنچینەو بنەما یەكی گەورەو گرنگ دەخەینەڕوو، كە زانایان و پێشەوایانی ئیسلام -ڕەزاو ڕەحمەتی خوا یان لەسەر بێ-، بۆ چۆنیەتی ناسین و دەرككردنی ناو و سیفەتەكانی خواو هەڵسوكەوت لەگەڵداكردنیان دایاننناون. سەرەتا با ئەوە بزانین كە پێغەمبەر ﷺ لە چەند فەرموودەیەكدا مەدحی سێ وەچە (جیل) لە كۆمەڵی مسوڵمانان دەكاتو دەفەرمویّ: ئەوانە باشترینی ئۆممەتی منن، یان باشترینی خەڵكن، بۆ وێنە لە یەكێك لە فەرموودەكا ندا فەرموویەتی: ((خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم))(تر) لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتوە كە بۆ چاری چوارەمیش فەرموویەتی: ((ثم الذين يلونهم)) واتە: باشترینی خەڵكی ئەوسەدەیەن كە لە سەردەمی من دان، پاشان ئەوانی دوای وان پاشان ئەوانی دوای وان. شایانی باسیشە كە لە زاراو (اصطلاح)ی سوننەتدا، (قرن) جیلێكی بەشەرییە، جا (60) ساڵ بێ (70) ساڵ بێ، یان زیاتریش، گرنگ ئەوەیە كە (قَرْن) لە زاراوی سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ و لە

(تر) رواه البخاري و مسلم: كتاب السنة: لأبي عاصم. بەرگی/2 لاپەڕە 975.

زاراوی قورئانیشدا کە بەکاری دێنێ، مەبەست پێی چینێکە لە بەشەر کە ماوەیەك تەمەن بەرێ دەکەن و دوایی دەبڕێنەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین وەچەو چین (جیل) ئەوانەن کە لە سەردەمی من دان، پاشان دوای ئەوان، پاشان دوای ئەوان، ئاشکراشە کە ئەو چین و پشتەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵە بەرێزەکانی (أصحاب)ن و هی دوای ئەوانیش پێیان دە گوترێ (تابعین) واتە: شوێنکەوتووانی (أصحاب) هی دوای ئەوانیش پێیان دەگوترێ: (تابعي التابعين) واتە: شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، لە هەندێك لە ڕیوایەتدا فەرموویەتی: ((ثم الذين يلونهم)) واتە: شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، کە بە هاوەڵانەوە دەکاتە چوار پشت (جیل)! وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: ((خير أمتي الْقَرْنُ الذي بُعِثْتُ فيهم، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم))(٨٦) واتە: باشترین ئۆممەتم ئەو چین (جیل)ەیە کە من لە نێویاندا بووم، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان. جا بە مەزەندە (تقدیر)ی زانایان ئەو سێ وەچەو چینە تاکو ساڵی (210)ی کۆچی، یان تا (230) یان (240)ی کۆچی دەوامی کردوە. هەندێکیشیان دەڵێن: هەتا کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی دێ، بەڵام ڕاستتر وایە کە هەتا (210) یان

(٨٦) رواه البخاري و مسلم: عن عمران بن حصين: السنة / لأبي عاصم، بەرگی/2 ، لا پەڕە 966.

(230 ـ 240) دەوامی كردوە، چونكە تا ئەوكاتە دەكاتە سێ وە چەی (70) ساڵی، سێ پشت كە هەر یەكەی (70) ساڵ تەمەنی كردبێت كەواتە (3 ×70= 210) یاخود شتێك زیاتر. جا پێغەمبەر ﷺ كە ئاوای فەرمووە، ویستوویەتی ئێمە ئاگادار بكاتەوە، كە باشترین مسوڵمانانێك چاك لە دین تێگەیشتبن و چاكیش مسوڵمانیەتییان كردبێ و چاك دینیان بەڕێوە بردبێت، هاوەڵانی بەڕێز (أصحاب) بوون، وە شوێنكەوتووانی ئەوان (تابعین) بوون، وە شوێنكەوتووانی شوێنكەوتووان بوون، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەسەر هەموویان بێت، چونكە بەڕاستی لەسەردەمی ئەو سێ وەچەیەدا (دین) هەمووی وەردەگیرا، وەك قورئان و سوننەت دەڵێن، وە نە بیدعەی عەقائیدی نە فیكریی نە عیبادیی، ئەوانە هیچیان دانەهێنرا بوون، وە مسوڵمانان هەموو لەسەر ئەوە كۆك بوون كە ئیسلام، عەقیدەیەو شەریعەتە، وە ئیسلام سیاسەتەو عیبادەتە، وە ئیسلام ژیانی تاك و خێزان كۆمەڵگاو دەوڵەت ڕێك دەخات، بەڵام لە دواییدا پاش ئەوكاتە مسوڵمانەتی كەمو زۆر لەق و پۆپی لێ بۆوەو یەكێك دەیگوت: دین تەنیا تەزكیەی نەفسەو یەكی دیكەیان ئیسلامی زیاتر لە جەنگ و جیهاددا دەبینی و یەكێكی دی بەلای سیاسەت دا شكابۆوەو، ئاوا هەریەكەی بە لایەكداو هەریەكەی بەشێك لە بەشەكانی ئیسلامی گرتبوە بەر، نەك هەموو ئیسلام بەیەكەوە، جا لەو سێ وەچەی ناوبراودا مسوڵمانان هیچ كێشەو

گرفتێکیان نەبوو لە بواری عەقیدەدا بە تایبەت لە بواری ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاردا، چونکە بە ڕاستی ئەگەر ئینسان تەماشای قورئان و سوننەت بکات دەبینێ کە لە قورئان و سوننەت دا ناو و سیفەتەکانی خوا (عزّوجلّ) هیچ گرفت و ئاڵۆزییەکیان تێدا نیەو زۆر ڕوون و ئاشکران: خوای پەروەردگار کۆمەڵێك ناوی چاکی بۆ خۆی بەکارهێناون، دەلالەت لەسەر کۆمەڵێك سیفەت دەکەن، وە کۆمەڵێك سیفەتی زیادەش لە ناوەکانی بۆ خۆی بەکار هێناون، کە ناگونجێ ناویان لێدروست بکرێت، بەڵام کۆمەڵێك سیفەتی خوای بەرزو بێ وێنەن، بەتایبەتی سیفەتە کردەیی‌یەکان. وە بێگومان کاتێك خوای کار بەجێ پێی ڕاگەیاندووین کە: هیچ شتێك وەك وی نیە: (ليس كمثله شيء)ئەوە هەم زاتی دەگرێتەوە، هەم سیفەتی کەواتە کە دەگوترێ: هیچ شتێك وەك خوا نیە، یانی نەزاتی خوا وەك زاتی دروستکراوەکانیەتی و نە ناوەکانیشی و نە سیفەتەکانیشی وەك ناو و سیفەتەکانیانە، بەڵام وەك ئاماژەمان پێکرد، لە دواییدا وردە وردە مسوڵمانان ترازان لەو خەت و ڕێبازەی پێغەمبەر ﷺ، وە شتی داهێنراویان لە نێودا پەیدابوو و بیرۆکەی جیاجیا هاتنە گۆڕێ، تا وای لێهات بە تایبەتی لە بواری عەقیدەدا مسوڵمانان زۆر تووشی ئاڵۆزیی بوون، وە بەتایبەتیش لە بواری ناو و سیفەتەکان دا، هەر زۆر تووشی سەر گەردانی بوون. جا کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلام، کە بە زاناو پێشەوایانی ئەهلی

سوننەتو جەماعەت ناسراون وە ڕابەرا ـیەتیو پێ شەوایەتیی زۆر ـبەی هەرە زۆرو جەماوەریی مـ سولّمانانیان دە ـکرد، دژا ـیەتی ـئەو لادان و داهێنان (الأنحراف و الأبتداع)ەیان کردو کەم و زۆر هەر لەسەر ڕاستەڕێ مانەوە، دیارترین و بەرجەستەترینی ئەو کۆمەڵە زانایەش کە ـبە زۆری لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا پەیدابوون و سەرقافڵەیەتی ڕێبازی ڕاست و هاوسەنگی زۆرینەی مسولّمانانیان دەکرد کە دوایی ناز ـناوی ( ـئەهلی سوننەت و جەماعەت)[تر] یان وەرگرت. ئەمانەن:

(تر) شایانی باسە کە وشەی (أهل السنة) یان (أهل السنة والجماعة) وشەیەك نیە کە لە قورئان یان سوننەت دا بەکارهاتبێ بۆ پێناسەی مسولّمانان یان زۆربەیان وەك ئێستا باوە، بەڵکو زاراوەیەکی فیکری و سیاسی یە کە زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام کە پێ شەوایەتی زۆر بەی هەرە زۆری مـ سولّمانانیان کردوە، لە بەراز بەر داهێ نەرەکان (المبتدعون)دا وەك خەواریج و شیعەو قەدەرییەو موعتەزیلەو جەبرییەو جەهمیە ... هتددا بەکاریان هێناوەو زیاتریش لە سەردەمی عەبباسی دا بۆتە باو و ڕەواجی پەیدا کردوە .

مەبە ستیش لە وشەی (سنّة) ڕێ بازی پێغەم بەرە ﷺ وە مەبە ستیش لە (جما عە) زۆری نەو جەماوەری مـ سولّمانانی دەوری دە ستەلاّتی سیا سی یا نە، کەوا تە: وشەی ( سوننەت) چوار چێوەی فیـ کری (الإ طار الفـ كري) زۆری نەی مـ سولّمانان و و شەی (جەما عەت)یش چوار چێوەی سیا سی (الأ طار السيا سي) یان دەدەر خات. د یارە مەرجیش نیە هەرکەسێك ناوی (أهل السنة) یان (أهل السنة والجما عة)ی لەسەر بوو ئەو پێنا سەیەی بەسەردا بچەسپێ، وەك چۆن ناوی (مسولّمان) لەگەلێك مسولّمانان خەسارە!

1 ـ (أبو جعفر الطبـري) کە بە پێشەوای توێژەرەوان (إمام المفسِّرين) بەناوبانگەو خاوەنی تەفسیری گەورەو ناوداری (جامع البيان في تفسير القرآن)ە.

2 ـ (البيهقي) خاوەنی کتێبی: (الأسماء الصفات).

3 ـ (الآجُرِّي) خاوەنی کتێبی: (الشريعة) کە تایبەتە بە بابەتەکانی عەقیدەوە.

4 ـ (ابن أبي عاصم) خاوەنی کتێبی (السنّة) کە ئەویش تایبەتە بە عەقیدەوە.

5 ـ (البغوي) خاوەنی کتێبی: (شروح السنّه).

6 ـ (اللّالكائي) خاوەنی کتێبی: (شرح أصول أعتقاد أهل السنة والجماعة)

7ـ (إبن تيمية) کە هەم لە: (مجموع الفتاوى)یەکەیداو هەم لە کتێبی. (دَرْءُ التعارض بين العقل و النقل)و هەم لە کتێبی: (العقيدة الواسطية)دا بەدرێژی باسی زۆرێك لە مەسەلەو بابەتەکانی ئیمان و عەقیدەی کردوە.

جا من پێنج بنچینەی گرنگم کە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام لە بواری هەڵسوکەوت کردن لە گەڵ ناوو سیفەتەکانی خوادا لە سەریان ڕێککەوتوون، باسکردوون، کە ئەمانەن:

**بنچیــنەی یەکەم:**

**ناو بردن و وەسفکردنی خوا (عزوجلّ) بەو ناو و سـیفەتانەی کە بۆ خۆی لە قورئانێدا یان پێغەمبەرەکەی ﷺ لە سوننەتیدا خستوویاننە ڕوو:**

واتە ئەو ناوو سیفەتانەی کە خوا بۆ خۆی بەکاری هێناون، یان پێغەمبەر ﷺ بۆ خوای پەروەردگار بەکاری هێناون، ئێمەش هەر بەو ناوانە خوا ناو بنێین، وە هەر بەو سیفەتانەش وەسفی بکەین و لێیان لانەدەین، نە لێیان کەم بکەین و نە لێیان زیاد بکەین. ئەمە بنچینەی یەکەمەو بێگومان هەموو بنچینەکانی دیکەش لەم بنچینەیەوە هەڵدەهێنجرێن. جا ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە ئەم بنچینەیان داناوە، بۆ چی دایانناوە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: شتێکی بەڵگەنەویستە کە هیچ کەس بە ئەندازەی خوا، خوا ناناسێ، ئەوە دیارەو قسە لەسەرکردنی ناوێ: ﴿قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ﴾(<sup></sup>) وە لە دوای خوای پەروەردگاریش هیچ کەس بە قەدەر پێغەمبەری خوا ﷺ خوای بەرزو بێوێنە ناناسێ، کەواتە هەر ناوێك خوا بۆخۆی بەکاری هێنا بێت و هەر سیفەتێك خوا خۆی پێ وەسف کردبێت، یاخود هەر ناوێك پێغەمبەر ﷺ بۆ خوای بەکارهێنابێت، یان هەر وەسفێك پێغەمبەر ﷺ خوای

---

(ت) (البقـرة 140) .

پێ وەسف کردبێت، مانای وایە لەو پەڕی زانیارییەوە یەو نە خوای پەروەردگار لەو ناوانەی زیاتر هەیە کە ئێمە بتوانین بیزانین، وە نە لەو وەسفانەشی زیاتر هەیە کە بۆ خۆی یان پێغەمبەرە کەی بەکاریان هێناون، کە ئێمە بتوانین بیانزانین چونکە خوا ناو و سیفەتی زۆرن، کە نە بۆ خۆی فەرموونی لە قورئانە یدا، وە نە پێغەمبەریش ﷺ لە سوننەتی خۆیدا ڕوونی کردوونەتەوە، بۆچی؟! چونکە ئێمە لە تواناماندا نیە بیانزانین، یان پێویستمان نیە کە بیانزانین، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە ڕێی غەیری قورئان و سوننەتەوە، لە ڕێی غەیری زانیاری خواو پێغەمبەرەوە، بەکورتی لە ڕێی غەیری (وحي)یەوە ئێمە بۆ مان نیە هیچ ناوێکی دی، وە هیچ وەسفێکی دی بۆ خوای کاربەجێ بەکاربێنین.

جا ئەم یاساو بنچینەیەی کە باسمکرد، ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئاوا دایان ڕشتوە، دەڵێن: (إثبات بلا تَمثِيلٍ، ولا تكييف، وتنْزِيْهٌ بلا تَعْطِيلٍ، ولا تَحريفٍ) واتە: چەسپاندنی ناوو سیفەتەکانی خوا بۆ خوا بەبێ وێچواندن‌و چۆنیەتی دیاریکردن، وە بە پاکگرتنی خوا بەبێ پەکخستنی ناوو سیفەتەکانی وگۆڕینیان، مەبەست لەم بنچینەیەش دوو شتە: یەکەم: ناوو سیفەتەکانی خوا، بۆ خوا بچەسپێنی‌و بۆی بڕیار بدەی بێ‌ئەوەی کە بڵێی: ئەو ناوو سیفەتەی خوای پەروەردگار یەکسانە لەگەڵ ئەو سیفەتەی ئەو دروستکراوە، یان ئەو ناوەی خوای بێ‌وێنە وەك یەك وایە لەگەڵ ئەو ناوەی ئەو دروستکراوە، چونکە (تمثيل) واتە ئەو

شته یەکسانە بەو شتە، بەڵام (تشبیه) کە هەندێ لە زانایان لە جێگەی (تمثیل) بەکاریان هێناوە، یانی: ئەو شتە بەو شتە دە چێت، (تمثـیل) بریتیە لەوەی کە دوو شت وەکو یەك بن بێ جیاوازی، بەڵام (تـشبیه) ئەوەیە کە شتێك بە شتێك بچێت، ئەگەر تەنها لە بەشێکیشی دابـێت، کەواتە (تمثیل)ی شتێك بە شتێکی دی کە ئەوەیە کە لە هەموو ڕوویێکەوە وەك یەك دابنرێن، بەڵام (تشبیه)ی شتێك بە شتێك ئەوەیە کە لە شتێکدا یان زیاتر پێك بچن و شێوەی یەکدی بکەن. کەواتە: دە بێ ناوو سیفەتەکانی خوا بۆ خوا بڕیار بدەین بەبێ یەکسان کردنو وێچواندن لەگەڵ هی غەیری خۆیدا وە بەبێ ئەوەی کە (تکییف) یان بکەین، چونکە جاری وایە تۆ ناڵێی زانیاری خوا وەك زانیاری ئینسان وایە، یان دیتنی خوا وەك دیتنی ئینسان وایە، بەڵام دەڵێی: زانیاری یان دیتنی خوا بەم شێوەیەیە، واتە: (تکییف)ی دە کەیو چۆنیەتییەکەی دیاری دەکەی چونکە (تکییف) یانی دیاریکردنی چۆنیەتی (کیفیة)، کەواتە: لە ئیسپاتی ناوو سیفەتەکانی خوادا دەبێ ئاگامان لە دووشتان بێ: یەکەم: یەکسان کردنو وێچواندن، دووەم: چۆنیەتی دیاریکردن، بۆ وێنە (ثم استوى على العرش) خوا لەسەر (عرش)ە، نەڵێی وەك چۆن ئینسان لەسەر کورسی دادەنیشێ چونکە ئەوە (تمثیل)ە، وە نە شڵێی چوونە سەر (عرش)، واتە خوای مەزن دەستەڵاتی پەیداکردوە بە سەر بوونەوەرو دروستکراوەکانی خۆیدا، چونکە ئەوەش (تکییف)ە، وە لە

ڕاستیدا ئەم جۆرە مانا لێدانەوەیە گۆڕین (تحریف)ێکیشە، چونکە چۆنیەتییەکت بۆ سیفەتێکی خوا بڕیار داوە بێ ئەوەی کە و شەکە بێگەیەنێ و هیچ بەڵگەیەکت لەسەری هەبێ.

دووەم: (تنزیه بلا تَعْطيلٍ ولا تَحريفٍ) بەڵێ هەر بەوەندە کارەکەمان پێك نایەت کە سیفەت و ناوەکان بۆ خوای بێهاوەڵ بچەسپێنین بەبێ (تمثیل)و (تکییف)، بەڵکو دەبێ خواش بە پاك ب گرین، بەڵام بەبێ ئەوەی سیفەتەکانی لێ دابڕینو (تعطیل)ی بکەین لە سیفەتەکانی، بە بیانووی بە پاکگرتنییەوە، واتە نەچین گیرودەی دەردی (جەهمییەکان) بین کە بە (المعطِّلة) ناسراون، کە دەیانگوت: ئێمە نالێین خوا توانا (قدرة)ی هەیە، چونکە ئینسانیش توانا (قدرة)ی هەیەو سەرەنجام خوا وەك ئینسان دەچێ! کەواتە: با نەڵێین: خوا توانا (قدرة)ی هەیە، بەڵکو بەس دەڵێین: خوا توانایە (قدیر)ە بۆ ئەوەی بە پاکی ب گرین با سیفەتەکەی لێدابڕین!! نەخێر نابێ وا بڵێین، چونکە ئەوە (تعطیل)ە، بەڵکو دەبێ خوا بە پاك ب گرین، بەڵام هەرگیز سیفەتەکانی لێ دانەڕنین، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، ناوو سیفەتەکانی خوا نەگۆڕین واتە (تحریف)یان نەکەین، بۆ وێنە: نەڵێین مەبەست لە چوونە سەر (عرش)ی خوا دەستەڵات ڕانان (إستیلاء)ە بە سەر بوونەوەردا، وە نەڵێین: مەبەست لە دیتنی خوای پەروەردگار ناسینی خوایە، وە نەڵێین: مەبەست لە هاتنە خوارەوەی خوا بۆ ئاسمانی یەکەم

فلاًن شتەیە، یان هاتنە خوارێ فریشتەکانە، بەڵکو هەڵوێستی ڕاست و دروست لەوبوارەدا ئەوەیە کە بگوترێ: خوا (عزو جلّ) لەسەر (عَرش)ەو دەچێتە سەر (عرش) بە شێوەیەك کە لە خۆی دەوەشێتەوە، وە دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی یەکەم بە شێوەیەك کە لە خۆی دەوەشێتەوە، وە خوا لە ڕۆژی دواییدا لە لایەنی ئیمانداراننەوە دەبینرێ بەو جۆرە کە شایستەیەتی و... هتد. کەواتە: ئەو دوو شتە بۆ جێبەجێکردنی ئەو بنچینەیە هەردووکیان پێویستن، هەم چەسپاندن (اثبات)و هەم بە پاکگرتن (تنزیه)، (اثبات)ەکە، بەبێ (تمثیل) و بەبێ (تکییف)، وە (تنزیه)ەکەش بەبێ (تعطیل)و بەبێ (تحریف)، باسیشمان کرد کە ئەوانە چی دەگەیەنن و مەبەست پێیان چیە!.

ئێستاش با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە: ئێمە دەڵێین، خوای بەرزو مەزن توانا (قدرة)ی هەیە، وە زانیاری (علم)ی هەیە، وە ویست (إرادة)ی هەیە، وە بیستن، (سمع)ی هەیە وە دیتن،(بصر)ی هەیە، وە چوونە سەر عەرش یان بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش (الأستواء علی العرش)ی هەیە، جا دیارە ئەم سیفەتانە دروستکراوەکان (مخلوقات)یش هەیانە بۆ وێنە: ئینسان توانای هەیەو شت دەکات، وە زانیاری و ویست و بیستن و دیتنی هەیە، وە دەتوانێ بەرزبێتەوەو لەسەر شت بێت، وە دەتوانێ دابەزێت و دەتوانێ قسە بکات و... هتد. جا لێرەدا ئەو سیفەتانەی خوای تاك و پاك مادام خوا

بۆخۆی خۆی پێ وەسف کردوون بۆ نموونە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾(1) تۆ نابێ بڵێی: من ناڵێم خوا (سمع) و (بصر)ی هەیە چونکە ئینسانیش هەیەتی، کەواتە وەك هی ئینسانە!! نەخێر، نابێ وا بڵێی، بەڵکو جاری بێنە (إثبات)ی سیفەتەکان بۆ خوا بکە، ئەوەتییە خوا (عزّوجلّ) بۆ خۆی فەرموویەتی: (سمع)و (بصر)م هەیە، دیارە خوا بۆ خۆی زاناترو شارەزاترە کە چ سیفەتێکی هەیەو چ ناوێکی هەیە، وە پێغەمبەریش ﷺ وای فەرمووەو ئەو سێ پشت (جیل)ەی مسوڵمانانیش کە چاکترینی خەڵك‌و ئۆمەتن دەستکارییان نەکردوە! کەواتە تۆ ئەو ناوو سیفەتانەی خوا، وەك خوای زاناو شارەزا بۆخۆی لە قورئاندا، وە پێغەمبەر ﷺ لە سوننەتدا بەکاریان هێناون، بۆ خوای بەرزو مەزنیان بەکاربێنەو بیانچەسپێنە، چونکە هیچ ماقووڵ نیە خواو پێغەمبەرەکەی شتێك بفەرموون و کەسێك کە خۆی بە مسوڵمان دەزانێ بڵێ: نەخێر وانییە، جا چ راستەوخۆ وا بڵێ، چ بە پێچ‌وپەناو تەئویلکردنەوە! بەڵام بێگومان ئێمە ناڵێین: (قدرة)ی خوا، وەکو هی ئینسان وایە، چونکە ئەوە (تمثیل)ە، وە ناشڵێین: مەبەست لە (قدرة)ی خوا فلان شتەیە چونکە ئەوە (تکییف)ە، کەواتە نەچۆنیەتی بۆ ناوو سیفەتی دادەنێین، وە نە وەك هی دروستکراوەکانیشی تەماشای دەکەین، پاشان دەڵێین: سیفەتەکانی خوا، لەوە بەرزترن وە خوا لەوە پاك (مُنزّه)

---

(1) (الشورى 11).

ترو لەوە بێهەڵەو بێ پەڵەیە کە سیفەتەکانی وەك هی دروستکراوەکانی بچن، بۆ نموونە: (زانیاری) خوا ڕەهاو بێ سنوورە، بەڵام هی ئینسان سنووردارە، چونکە مرۆڤ هەندێ شت دەزانێ و زۆر شت نازانێ، بەڵام خوا هیچ شتێك نیە کە نەیزانێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾(تر)وە مرۆڤ هەندێ شت دەتوانێ و زۆریش ناتوانێ، بەڵام خوا هەموو شتێك دەتوانێ: ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(یر) وەژیان (حیاة)ی ئێمە کاتیی و (جزئی)یە کەمێك دەژین و دوایی دەمرین، بەڵام خوای پەروەردگار (سبحانە تعالی) زیندووی هەمیشەیەو ژیان (حیاة)ەکەی نە پەیدابووەو نە لە نێویش دەچێت، بەڵام هی ئێمە پەیدا بووەو لە نێویش دەچێت. کەوا تە: بەڵێ (تنزیە)ی خوای پەروەردگار دەکەین و بە پاك و بێگەردی دەگرین لەوەی کە لە هیچ شتێکدا وەك دروستکراوەکانی خۆی بچێت، بەڵام سیفەتەکانی لێ دانارِنین، وە بە هیچ شێوەیەك ناشیانگۆڕین. جارێکی دیکەش بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست دەڵێم: ئێمە هەم دە بێ ئەو ناوو سیفەتانە کە خوای زا ناو کار بەجێ، وە پێغەمبەری سەروەر - صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ-، بەکاریان هێناون و ناویان بردوون بۆ خوای بێوێنەو هاوتا ئێمەش ئەو ناوو سیفەتانە بۆ خوا بەکاربێنین و بە بیانووی (تنزیە)ی خواوە گیرۆدەی داوی (تعطیل) نەبین، بەڵام لە

---

(تر) (المجادلة 7) .

(یر) (الحدید 2) .

هەمان کاتیشدا لە کاتی (إثبات)ی ناو و سیفەتەکاندا ئاگا مان لە (تمثیل) بێت و هیچ کاتێك زەین و هۆشمان بەلای ئەوەدا نەچێت کە ناوو سیفەتەکانی خوا وەك هی دروستکراوەکانی تەماشا بکەین. بۆ وێنە:کاتێك دەڵێین: خوا لە ئاسمانە، هۆش و زەینمان بەلای ئەوەدا نەچێت کە وەك چۆن هەور لە ئاسمانە، هی خواش وەك ویە (سبحانەوتعالی)، چونکە (هەور) کە دروستکراوێکی خوایە لە ئاسمان بوونەکەی لە قەدەر خۆیەتی و لە ئاسمان بوونی خواش کە سیفەتێکی خوایە لە قەدەر خوایەو لە هی غەیری خوا جیایە، هەروەها کاتێك دەڵێین: خوا لەسەر (عرش)ە (عرش) یانی تەخت و بارەگای حوکمڕانی، بەپێی ئەو مەفهوومە زمانییەی ئێمە بەکاری دێنین وەك لە قورئاندا هاتوە: ﴿أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾[1] سولەیمان (علیه السلام) دەڵێ: کامەتان دەتوانێ (عرش)ی (بلقیس)م بۆ بێنێ، پێش ئەوەی بە ملکەچیی بێن بۆ لام؟!، بەڵێ (عرش) لە عورف و باوی زمانو بەکارهێنانی ئێمەدا واتە: تەخت و کورسی حوکمڕانیی کە پاشا لەسەری دادەنیشێ، بۆیە هەرگیز نابێ فیکرو هۆش و زەینمان بەلای ئەوەدا بچێت کاتێك باسی چوونە سەر عەرشی خوا دەکەین، کە بڵێین: خوای کاربەجێ تەختو بارەگایەکی هەیەو لەسەری دانیشتوە!!، چونکە ئەوە سیفەتی ئینسانە، وەك لە پێشدا باسمکرد: ئینسان لەسەر کورسیو

---

[1] (النمـل 38).

تەخت دادەنیشێو ئەو تەختو کورسییەش ئینسان هە ڵدەگرێ، بەڵام خوای بباڵا دە ست ئاسما نەکان و هەر چی درو ستکراوەکانن بە (عرش)یشەوەو هەموویان ئەو ڕایگرتوون وەك فەرمووویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ أَنْ تَزُولا...﴾[ت] مانای وایە لەسەر ( عرش) بوونی خوا جیایە لەگەڵ لەسەر تەخت بوونی دروستکراوەکانی، وە لە ئاسمان بوونی خوای تاك و پاکیش جیا یە لە لەئاسمان بوونی دروستکراوەکانی. کەواتە: لە بواری ناو و سیفەتەکانی خوادا دە بێ ئاگامان لە (تمثیل) بێت، وە ئاگاشمان لە (تکییف) بێت و، نەوەك هی دروستکراوەکانیان سەیر بکەینو پێیانیان بـ چوێنین، وە نە چۆنیەتی (کیفیة)یشیان بۆ بڕیار بدەین و بڵێین: فلان سیفەتی خوا ئاواو ئاوا یە، بەڵکو دەبێ بڵێین: بە شێوەیەکە کە بۆ خوا شایستەیە، کەوا تە: پێویستە لە چەسپاندن (إِثبات)ی ناوو سیفەتەکاندا ئاگا مان لە وەك یەك دانان (تمثیل) یان وێ چواندن (تشبیه) وە چۆنیەتی بۆ دا نان (تکییف) بێت. وە لە ڕووی بە پاکگرتن (تنزیه)ی شەوە، کاتێك کە دەڵێین خوای بێهاوتا لە هیچ شتێکدا وەك دروستکراوەکانی خۆی نییە: نە ناوی، نە زاتی، نە سیفەتی، نە کردەوەی... هتد، چونکە خوا خۆی وای فەرمووە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[ث] لێرەشدا دەبێ ئاگامان لێبێت، بە

---

(ت) (فاطر 41).

(ث) (الشورى 11).

بیانووی ئەوەی کە ئێمە خوابە پاك دەگرین، سیفەتەکانی لـێ دانەڕنین و دووچاری (تعطیل) نەبین، یاخود سیفەتەکانی ـنە ـگۆڕین و دوو چاری (تحریف) نەبین!، بۆ وێنە: سیفەتی قسەکردن (کلام)ی خوا، هەر دە ـبێ بڵێین: خوا قسە دەفەرموێ چونکە بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً﴾(1) بەڵام، فەرمایشت ـفەرموون و قسەکردنی ـخوای پەروەردگار وەك هی ئێمە نیە، ئێمە بە زمان و لێوو ددان و ـپووك و قورِگ و ئەوانە قسە دەکەین، بەڵام بێگومان ـخوا (عزّو جلّ) وانیە، چونکە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ وە ژیان (حیاة)ی ئێمە بە هۆی خوێن و دڵو هەناسەدانو ئەو ئەندام و کۆئەندامانەوەیە ـکە ـهەمانن، ـبەڵام ژیانی خوای بێوێنەو تاك وانیە، ـبە ـکورتی: ئێمە پێویستە ـهەم چەسپێنەر (مُثْبِتْ) بین، هەم بە ـپاکگر (مُـنَزِّه)، واتە: ـهەم ـناوو سیفەتەکان بۆ خوا بچەسپێنین، وە هەم خوا بە پاك بگرین لەوەی کە ناو سیفەتەکانی وەك هی غەیری خوا سەیر بکەین. بەڵام دەبێ لە (اثبات)و لە (تنزیە)دا هاوسەنگو میانەڕەو بینو زیادەڕۆیی (إفراط) نەکەین بەلای (اثبات)داو بڵێین: سیفەتەکانی ـخوا وەك ـهی دروستکراوەکان وان!، وەك هەندێك کە ئەوەندە تێیانپەڕاندوە ـلە ـبواری (إثبات)ی سیفەتەکاندا چوونەتە خانەی وێچواندن (تشبیە)و بەجەستەدانان (تجسیم)ەوەو هەیان بووە گوتوویەتی: بەڵێ ـخوا (عرش)ێکی هەیە

---

(1) (النساء – 164).

دەوری هەموو بوون (وجود)یی داوەو بۆخۆشی لەسەری دانیشتوە!! ئەوە بێگومان شتێکی هەڵەیەو کوفرو لادانیشە. دیسان ئێمە دەبێ بە پاکگر (مُنزِّه) بین، بەڵام لە بە پاکگرتنەکەماندا دووچاری بەزایەدان (تفریط) نەبین و وەك (الجهمیة) نەڵێیـــن: (ئێمە ناڵێین نە بوونی هەیە نە بوونی نیە؟ مەبەستیان ئەوە بووە، گوتوویانە: چونکە دروستکراوەکان بوونیان هەیە جا ئەگەر بڵێین: خوا بوونی هەیە، مانای وایە وەك دروستکراوەکان سەیرمان کردوە، هەروەها بۆ سیفەتەکانیشی گوتوویانە، ناڵێین: خوا توانا (قدرة)ی هەیە یان نیەتی! یان وەك (معتزلة)ە کان گوتوویانە: ((ئێمەش دەڵێین خوا (سمیع، بصیر، قدیر، علیم)ەو ئەو ناوانەی هەیە، بەڵام ناڵێین: خوا (سمع)و (بصر)و (قدرة)و (علم)ی هەیە، بۆ ئەوەی چەند لە مێژینەیی (تعدّد القُدماء) پەیدا نەبێت))، ئەوا نە هەردوو لایان بە حیساب (تنزیه)ی خوایان کردوەو بە پاکیان گرتوە، بەڵام سیفەتەکانیان لە خوا دارنیوە. یان وەك هەندێکی دیکەیان، کە گوتوویانە: بەڵێ ئێمەش دەڵێین خوا: (استوی علی العرش)، بەڵام دەڵێین (استوی) واتە: دەستی بەسەرداگرت و خستیە ژێر رکێفی خۆیەوە (استولی) وە بەڵێ دەڵێیـــن: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾[*] بەڵام دەڵێین (وجه) مەبەست پێی (ذات)ە (هەرچەند زانایانی پێ شینیش ئەوەیان هەرگوتوە) وە گوتوویانە دەڵێین: خوا فلان سیفەتەی هەیە، بەڵام ئەو

---

(*) (القصص - 88).

سیفەتە مەبەست پێی ئەو شتەیەو بە ناوی تەئویلکردنەوە گۆڕین (تحریف) یان تێداکردەوە. کەواتە: ئینسانی مسوڵمان دەبێ ئاگای لە تێپەڕاندن (افراط)و بەزایەدان (تفریط) بێت، لە چەسپاندن (اثبات)ی سیفەتەکانی خوادا، ئاگای لە زێدەڕۆیی و تێپەڕاندن بێت، لە بە پاکگرتن (تنزیه)ی خواشدا ئاگای لە بەزایەدان (تفریط)و کورت هێنان بێت. هەروەها پێویستە ئاگامان لەوەش بێت، کە ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار، چ لە قورئاندا هاتبن، چ لە سوننەتی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)، مادام ڕاستو ڕەوا بێو ئیشکالی تێدا نەبێ، دەبێ پێیەوە پابەند بین، با ئەو سوننەتە ڕاست ( صحیح)ە فەرموودە (حدیث)ی (آحاد)[تر]یش بێت، چونکە هەندێك لە زانایانی (علم الكلام)و زانایانی (علم الأصول) گوتوویانە: ((بە (حدیث)ی (آحاد) مەسەلەکانی عەقیدە ناچەسپێن و ئەو ناو و سیفەتانەی کە لە فەرموودەی (آحاد)دا هاتوون ئێمە بۆ خوا بەکاریان ناهێنین))، بەڵام ئەو ڕایە هەڵەیە، بەڵکو چەندان ناو هەن، هەموو ئەو زانایانەی، کە ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان سەرژمێرکردوون، ئەو ناوانەش کە لە سوننەتدا هاتوون حیسابیان کردوون. بۆ وێنە: هەرکام لە ناوی (الَحنّان)و (المنّان)، کە لە (مُسنَد)ی (الأمام أحمد)دا هاتوون،

---

(تر) فەرموودەی (آحاد) ئەوەیە کە زنجیرەی (راوی) یەکان یەك یەك بێت و نەگەییبێتە ڕاددەی تەواتور، (تواتر)یش ڕاوی یەکانی کۆمەڵ کۆمەڵن نەك تاك تاك .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ان عبداً في جهنَّم لُينادي ألْفَ سَنةٍ يا حنّان يا منّان﴾ واتە: بەندەیەك لە عەبدەكانی خوا ـ هەزار ساڵ لە دۆزەخدا دەپاڕێتەوە لە خوا، دەڵێ (یا حنّان، یا منّان) واتە: ئەی خاوەن سۆزو بەزەیی، ئەی خاوەن چاكەی زۆر! هەروەها هەركام لە ناوی (سُبّوحٌ قُدّوسٌ) وەك لە (صحیح)ی (مسلم) داهاتوە، عائیشە -خوای لێی ڕازی بێت- گێراویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە ڕكووعدا دەیفەرموو: ( سبوحٌ قُدّسٌ رّب الملائكة و الروح)، (سبوح) واتە: خوا دوورە لە كەموكوڕیی یەكان، (قدوس) واتە: خوا پاكە لە كەموكوڕیی یەكان، پەروەردگاری فریشتەكان و جیبریل، یان (گیان) هەروەها ناوی (شافي)یش یەكێكە لەناو و سیفەتەكانی خوا، چونكە لە عائیشەوە -خوا لێی ڕازی بێ- گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ كە دوو عای بۆ نەخۆش دە كرد دەیفەرموو: ﴿اَللّهم ربّ الناس أذهبِ البأس، إشْفِ أنْتَ الشّا في لا شفاءَ الاّ شفاؤك شفاءً لا يُغادرُ سَقَماً﴾[ﭬ] واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری خەڵكی! ئازار لابەرە، شیفا بدە تۆ شیفا هێنی جگە لە شیفای تۆ شیفا نیە، شیفایەك كە هیچ نەخۆشییەك بەجێ نەهێڵێ و یەكجاریی بێت. هەروەها ناوی (الحيِّ) وە (الستِّیر)، پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: ((ان الله تعالى حيٌّ ستِّيرٌ يُحِبُّ الحياءَ والسِّتْرَ فأذا آغْتَسل أحدكُمْ

---

(ﭬ) البخاري و مسلم .

فَلْيَسْتَتِرْ))[٨٠] واتە: خوای بەرز بە شەرمو شکۆیەو داپۆشەرەو شەرم و پۆشتەیی خۆش دەوێ، جا ئەگەر یەکێکتان خۆی شۆرد با خۆی داپۆشێ. هەروەها لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە کە: خوا پێدە کەنێ، وە خوا شادمانە. هەڵبەتە هەرکام لەو ناو و وە سفانە، دە بێ ب گوترێ: بە شێوەیەك بۆ خوا شایستەیە. وە هەروەها هەرکام لە سیفەتەکانی: (جَوَاد، نَظِيف، طيِّب، كريم)، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموو یەتی: ((انَّ اللّٰه طَيِّبٌ يحبُّ الطَيِّب، نَظيف يحبُّ النَّظافَة كريمٌ يُحبُّ الكَرَم، جَوادٌ يُحبُّ الجُودَ، فَنَظِّفُوا أَفْنِيتكُمْ ولاتَشبهَّوا باليهود))[٨١]، واتە: بێگو مان خوا پاكو چاکەو پاكو چاکیی خۆش دەوێت، خاوێنەو خاوێنی خۆش دەوێت، وە بەرِێزەو بەرِێزی خۆش دەوێت، بەخشەرەو بەخ شەریی خۆش دەو ێت کەواتە بەرو پێش دەرگاتان خاوێن بکەنەوەو وەك جوولەکەکان مەبن ـ کە پیس و پۆخڵن ـ: هەروەها (المقدِّم و المؤخِّر و الدَّيّان) کە هەرسێکیان وەك سیفەتی خوا (سبحانەو تعالی) لە (صحیح)ی (بخاري)دا هاتوون (المقدِّم) واتە پێشخەر، (لمؤخِّر) واتە: دواخەر (الديّان) واتە: فەرمانرِەواو مل پێکەچکەر. هەروەها (الجميل و الرفيق)یش بەهەمان شێوە کە لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوونو (مسلم) لە (صحیح)ی خۆ یدا هێناونی، (جميل) واتە: جوان و (رفيق) وا تە: نەرم و نیان، بەڵام

(٨٠) احمد وابو داود والنسائي عن يعلى بن أمية .

(٨١) رواه الترمذي .

هەموویان هەر بەو شێوەیە کە لە خوا دەوە شێنەوەو شای ستەنیی.
هەروەها وشەی: (السِّيد) چونکە لە فەرموودەدا هاتوە کە یەکێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: (يا سيِّدَنا و ابْنَ سَيِّدنا!) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (السيدُ: اللهُ) واتە هەر خوا سەییدە، (سیِّد) واتە: گەورە، سەرۆك. کەواتە: ئەو ناوەچاکانەو ئەو سیفەتە بەرزانەش کە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هاتوون، مادام فەرموودەکان ڕاست (صحيح)بن، ئەوانیش پێویستە پێیانەوە پابەند بین و بەناو و سیفەتی خوای پەروەردگاریان دابنێین.

## بنچینەی دووەم
## ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار هەموویان هەر بوو و بێ سەرەتان

بەڕێزان: بێگومان ئەمە باسێکی یەکجار قووڵە بەڵام بە کورتیی و بە تەعبیرێکی سادە ئەوەیەکە ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن سەرەتایان نیەو دەستپێکردنیان نیە، بەڵکو هەر بوو (أزلي)ن، چونکە خوای بەدیهێنەر هەربوو و یەکەم (أوَّل)ە، واتە لە پێش ویدا هیچ شتێك نەبووەو سەرەتاو دەسپێکردنی نیەو کاتێك نەبووە کە نەبووبێ، دیارە سیفەتەکانیشی هەروان و ناوەکانیشی هەروان، چا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: باشە ئەو سیفەتانەی خوا کە (ذاتي)ن، واتە لەگەڵ خودی خوادا بوون، وەك (زانیاری، توانا، بیستن، دیتن، ژیان... هتد) ئەوە دیارە هیچ گومان لەوە دانیە کە لە گەڵ خوای بەدیهێنەردا بێ سەرەتا (أزلي)ن، بەڵام هەندێك سیفەتی دیکە هەن کە ئەوانیش هەر سیفەتی خوای بەرزو بێهاوتان وەك پێشتریش باسمان کرد کە سیفەتە کردەییەکان (الصفات الفعلية)یان پێ دەڵێین بۆ نموونە: بەدیهێنەر، ڕۆزیدەر، بەخشەر، ژیێنەر، مرێنەر (الخالق، الرازق، المعطي، المُحي، المميت)، چا ئەم سیفەتانەو هاوێنەکانیان ناگونجێ بڵێین: هەربوو (أزلي)ن، چونکە ئەگەر هەربووبن لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دەبێ درو ستکراوەکان

(مخلوقات)ی خواش بێ سەرەتا بن و هەربووبن، واتە کاتێك نەبووبێ کە خوا دروستکراوی نەبووبن! وە دەبێ بڵێیــن کاتێك نەبووە کە کە سانێك نەبووبن کە خوا ڕۆزییان بداتێ، وە کەساتێك کە خوا بەزەیی پێ یان دا بێتەوە، وە کەسانێك کە خوا لێیان خۆش بێت... هتد!! جا لێرەدا زانایان بوونەتە دوو بەش:

(1) زۆربەیان دەڵێین: خوای بەدیهێنەر بۆ ئێمەی ڕوون کردۆتەوە کە هەموو شتێکی خولّقاندوە، واتە کاتێك بووە هیچ شتێك نەبووەو دوایی خوا (سبحانەوتعالی) هێناونیە دی، هەر لە عەرشەوە هەتا هەموو شتێکی دیکە. بەڵام ئایا: لە پێش ئەوەدا چی بووەو چۆن بووە؟! دەڵێین ئێمە حەقمان نیەو پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، ئەوە دەزانین کە کاتێك بووە خوای بەدیهێنەر هیچ دروستکراوێکی نەبووەو ئەو سیفەتە کردەیی‌یانەش پەیوەستن بە ویستی خواوە، واتە: خوا شت دەخولّقێنێ لەوکاتەدا کە بیەوێت، وە ژیان پێدا دەکات لەوکاتەدا کە بیەوێت، وە بەزەیی بە خەڵکدا دێت لەوکاتەدا کە بیەوێت، وە ڕزقیان دەداتێ لەوکاتەدا کە بیەوێت! بەڵام ئەگەر نەیەوێت نەدروستیان دەکات و نەدەیان ژیێنێ و نە ڕزقیان دەدات. زۆربەی زانایان ئاوا دەڵێن، وە ئەوەش زیاتر لە عەقڵی ئینساندا جێگای دەبێتەوە، وە فەرموودەیەکیش هەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أول ما خلق الله تعالى القَلَم ثم قال: اكتُبْ، قال

یاربِّي ما اكتب؟ قال: اكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة))[(تر)] واتە: یەكەمین شتێك كە خوای بەرز دروستی كرد قەڵەم بوو (قەڵەم چی یە؟ خوادەزانێ) پاشان خوا پێی فەموو: بنووسە، قەڵەم گوتی: پەروەردگارم چی بنووسم؟ فەرمووی: ئەندازەی هەموو شتەكان بنووسە تا ڕۆژی دوایی.

به پێی ئەم فەرموودەیە بێت، لە پێش قەڵەمدا هیچ شتێك نەبووەو یەكەمین دروستكراوێك كە خوا دروستی كردوە قەڵەم بووە. هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: (عەرش) لە پێش (قەڵەم)ەوەیەو پێش ئەوەی خوا قەڵەم دروست بكات، عەرشی دروست كردوە، هەندێكیش دەڵێن: نەخێر ئەو فەرموودەیە دە فەرموێ: یەكەم دروســـتكراو (قەڵەم)ە، كەوا تە عەرشیش لە دوای قەڵەمەوە دروست بووە.

(2) وە هەندێك لە زانایان دەڵێن: هیچ كاتێك نەبووە كە خوا (عزّوجل) دروستكراوی نەبووبن! جا ئایا ئەمان بۆچی دەڵێن: خوای پەروەردگار ناگونجێ كاتێك بووبێت دروستكراوی نەبووبن؟! دەڵێن: چونكە ئەگەر دایبنێین تەمەنی ئەم بوون (وجود)ە، بە عەرش و قەڵەمیشەوە ئەوە هەزار هەزار ملیار ساڵ بوو، لەچاو ئەزەل ئەگەر نەڵێین سفرە، نوختەیەكی زۆر بچووكە.

---

(تر) أبو داود واحمد والطبراني، وصححه الألباني .

جا دەڵێین: چۆن خوای بەدیهێنەر لە ئەزەلەوە ـ ئەزەلێك كە لە عەقڵی ئینساندا جێگای نابێتەوە ـ هیچی دروست نەكردوە ـ دوایی ئەو هەموو دروستكراوانەی دروست كردوون؟! جا لە ڕاستیدا ئەم پر سیارە شتە، چونكە وەك دەڵێین خوای بەدیهێنەر لە ئەزەلەوە ( بەبێ سەرەتا) سیفەتی بەدیهێنەرایەتی (خالقیة)ی هەبووە، ئەدی بۆچی دەبێ هیـ چی دروست نەكردبێ؟ وە سیفەتی بژیودانی هەر هەبووەو تێكرای ئەو ناوو سیفەتە هەرە چاك و پەسندانەی هەبوون، جا ئایا بۆچی و چۆن دەبێ لە كاتێكی بێكۆتاییو لە مێژینەدا ئەو ناوو سیفەتانەی تێدا دەرنەكەوتبنو لەسەر ڕووپەڕی دروستكراوەكانی نەدرەوشابنەوە؟!! جا وەك گوتم بەهەرحاڵ ئەم پرسیارە تاڕاددەیەك پاساوی هەیە! بەڵام ئەوەی كە بە پێویستی دەزانم لێرەدا بیڵێم ئەوەیە كە بڵێین: بە ڕاستی ئەم مەسەلەیە لە عەقڵی ئینساندا جێی نابێتەوە، چونكە نە ئەزەل لە عەقڵی ئینساندا جێگای دەبێتەوە، نە ئەبەد (أزل) بێ سەرەتایەو (أبد)یش بێ بڕانەوەو كۆتاییی، لە سۆنگەی ئەوەوە كە عەقڵی ئینسان گچكەو سنووردارە، بۆیە وابا شە سنووری خۆمان بزانینو زۆر تێ نەنووسێین و بڵێین: بەڵێ ئەوە جێگەی پرسیارو ئیشكالە كە چۆن خوای بەرزو مەزن پێشتر شتی نەخوڵقاندوە، بەڵام مەرج نیە ئێمە بە عەقڵ و توانا سنووردارو گچكەكانی خۆمان توانای ئەوەمان هەبێ وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بدەینەوە كە پەیوەندییان بە ئەزەل و ئەبەدەوە هەیە،

تەنیا دەتوانین ئەوەندە بڵێیـــن: کە خوا خاوەنی ویستو حیکمەتی ڕەهاو بێسنوورەو لەو کاتەدا کە بوون (وجود)ی هێناوەتە دی ویستی وا بووەو حیکمەتی خواستوویەتی کە بیخولقێنێ نەك پێشتر یان دوا تر، پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندوە کە یەکەمین دروستکراوی خوا قەڵەم بووەو ئەگەر گریمان پێشتریش خوا دروستکراوی دی کەی بووبن ئەوە ئێمە نازانین و با لەخۆوە قسە نەکەینو تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێینو بەبێ زانیاری قسە نەکەینو با لە سنووری خۆمان دەرنەچینو بە تەواوی مانا پابەند بین بە (وحي) درەوشاوەی خواوە لە قورئان و سوننەتدا.

**بنچینەی سێیەم :**

**لێکدانەوەی مانای ناو و سیفەتەکانی خوا بە پێی ڕواڵەتی وشەکان و بنچینەکانی زمانی عەرەبی و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سیاقەی کە تێدا هاتوون، وێڕای بە پاکگرتن و بە بەرزگرتنی خوا لە هەر کەموکووڕیی و ناتەواویی‌یەك.**

بەڕێزان: ئەو وشانەی کە خوای کاربەجێ کردوونی بەناو یان سیفەت بۆ خۆی یان پێغەمبەر ﷺ کردوونی بە ناو و سیفەت بۆ خوای پەروەردگار، پێویستە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا بەم شێوەیە بێت: دەبێ مانا ڕواڵەتی یەکەیان ڕچاوبکرێ، جا مانا ڕواڵەتی یە کەیان جاری وایە مانای (حقيقي)یە، جاری وایە (مجازي)یە، ئەوە گرفت نییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە مانا ڕواڵەتی یەکەیان، بە لەبەرچاوگرتنی (سیاق)و ڕستەو تەعبیری بەکارهێنانەکە، وە بەڕەچاوکردنی بنچینەکانی زمانی عەرەبی، دەبێ ئەوانەی هەمووی لەبەرچاو بگرین و ڕەچاو بکەین، وە وێڕای بە پاك گرتن و بە بەرزگرتنی خوای تاك و پاك، ئنجا تەفسیر و مانای ئەو ناو و سیفەتانەی خوای پەروەردگار بکەین. با وێنەیەك بێنینەوە: وشەی (اسْتَوَى)، خوای کاربەجێ لە حەوت (7) شوێندا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ واتە: خوا چووە سەر عەرش،

یاخود، خوا بەرزبۆوە بۆ سەر عەرش، یان خوا سەقامگیر بوو لە سەر عەرش، چونکە (اسْتَوَى) هەم بە مانای (بەرزبۆوە) دێت: (عَلا، آرتَفَع، صَعَد)، هەم بە مانای (سەقامگیر بوو) (استقر) دێت، وە لە زمانی عەرەبیدا وشەی (اسْتَوَى) ئەگەر بە تەنیا بەکاربێ، مانای (اعتدل) دەگەیەنێ (إكتمل و اعتدل) واتە: رێك بوو، هاوسەنگ بوو، کامڵ بوو، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەربارەی (موسى) (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾[1] جا لەبارەی تەفسیری وشەی (واسْتَوَى) توێژەرەوانی قورئان دەڵێن (إعتدل، واكتمل)، واتە: تەواو بوو، کامڵ بوو، واتە: وە کاتێك ـ مووسا (عليه الصلاة والسلام) ـ گەیشتە ئەوپەری تین و تاقەتی خۆیو کامڵ بوو حیکمەت و زانیاریمان پێدا هەر ئاواش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. کەواتە: وشەی (اسْتَوَى) ئەگەر بە تەنیا بەکارهاتبێ، بەبێ ئەوە کە بە پیت (حرف)ێك بەرکار (مفعول)ێکی خواستبێ و (تعدِّي)ی کردبێ، ئەوە بە مانای هاوسەنگیی (اعتدال)و کامڵ بوون (اکتمل)[2] دێت.

بەڵام ئەگەر (تعدّي)ی کردبێت بە پیتی (الـى)، ئەوە لەو حاڵەتەدا مانای رووی تێکرد (قَصَد) دەگەیەنێ (قَصَد) واتە: بۆی چوو، رووی تێکرد، وەك خوا (عزّوجل) فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا

---

[1] (القصص 14).

[2] لسان العرب: بەرگی (6)، لاپەڕە (447).

فِي الآرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ ﴾[1] واتە: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەوی دایە بۆتانی دروست کردوە، (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ) دوایی ڕووی کردە ئاسمان کە دروست بکات. هەندێکیش دەڵێن: (ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ) واتە: ( وجّه أمره اليها ) فەرمانەکەی ئاڕاستە کرد، یان (أقبل اليها) ڕووی تێکرد، بەڵام ئەوانە هەر یەکن و لە یەکەوە نزیکن، ڕووی تێکرد، ویستی، فەرمانی ئاڕاستەکرد، ئەوە ئەگەر وشەی (اسْتَوَى) بە پیتی (الـى)، (تعدّي)[2] بکات. بەڵام ئەگەر بە پیتی (على) شتێکی دی بخوازێ و(تعدِّي) بکات ئەوە بە مانای ( علا و آستقّر) دێت، وەك ﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾[3] واتە: خوای خاوەن بەزەیی لەسەر عەرش سەقامگیر بوو، یان بۆ سەر عەرش بەرزبۆوە، کەواتە: (اسْتَوَى) هەر یەك وشەیە، بەڵام ئەگەر بە تەنیا بێت واتایەکی هەیەو ئەگەر بە پیتی (الـى) (تعدّي)ی کردبێت، مانایەکی دیکەی هەیە، وە ئەگەر بە پیتی (على) (تعدّي) بکات مانایەکی دیکەی جیاوازی لە هەردووکیان هەیە. بۆیە: ناکرێ ئێمە وشەی (اسْتَوَى) هەر بەیەك مانا لێك بدەینەوە، بەڵکو دەبێ تەماشا بکەین دا خۆ چۆن بەکارهاتوەو ڕستەو (سیاق)ەکەی چۆنە! ئەو جار دەتوانین مانایەکی گونجاوی بۆ دیاری بکەین. کەواتە ئەوانەی وشەی (اسْتَوَى) یان بە

---

[1] (البقـرة 29) .

[2] لسان العرب: بەرگی/6، لاپەڕە 447 .

[3] (طـــه 5) .

(إستوْلى) لێك داوەتەوەو گوتوویانە (اِسْتَوَى) واتە (إِسْتوْلى)، كە (إستوْلى) بەمانای دەستەڵات بەسەردا گرتنەو دێرە شیعرێكیان لە سەر هێناوەتەوە كە دەڵێ:

(ثم استوى بِشر على العراق بلا تَعَبٍ ولا دم مهراقٍ)

واتە (بیشر) دەستەڵاتی بەسەر عێراقدا پەیداكرد بەبێ ماندووبوون‌و كوشتارو خوێن ڕشتن. ئێمە دەڵێین: لە ڕاستیدا لەو مانا لێدانەوە یەدا نەیانپێكاوە، چونكە: وشەی (اسْتَوَى) بە مانای (استولى) نەهاتوە بە تایبەتی ئەگەر بە (على)، (تعدِّي)ی كردبێت، بۆیە لە تەفسیری (استوى على العرش)دا هەرگیز ناگونجێ بگوترێ: (إستولى على العرش)، ئەمەش بەڵگەیەك لەوبارەوە: (إبن الأعرابي) كە یەكێكە لە زاناو پسپۆڕ (متخصص)ەكان لە زمانی عەرەبیدا، جارێك پیاوێك هاتە لای و پێی گوت: خوای بەرزو مەزن كە دەفەرموێ: (الرّحمن على العرش استوى) یانی چی؟ (إبن الأعرابي)یش لە وەڵامدا پێی گوت، واتە خوا لەسەر عەرشەو چۆتە سەر عەرش، كابرا گوتی: نەخێر بەڵكو (استوى) واتە: (استولى) دەستەڵاتی پەیدا كردوە، (أبن الأعرابي) پێی گوت: (العرب لا تقول إستولى على الشيء حتى يكون له مُضادٌّ فأَيُّهما غَلَبَ فقد إستولى) واتە: عەرەب وشەی (إستولى) بەكارناهێنن مەگەر دوو شت لە شتێكدا پێشبڕكێیان بێت‌و دژی یەكدی بن، جا لەو كاتەدا هەر كامێكیان بەسەر ئەوی دیكەدا زاڵ بوو دەڵێن: (إستولى عليه)،

کابرا گوتی بەڵگەت چیە؟ گوتی: بەڵگەم ئەو شیعرەی (نابغة الذبیاني)یە کە دەڵێ:

ألا لمثلك أومن أنت سابقه سبقاً الجواد أذا آستولى على الأمَدِ

واتە کامەتان ئەسپەکەی پێشتر بکەوێتەوە، لە پێشبڕکێدا، ئەویان (استولى)ی کردوە، واتە: یەکیان بەسەر ئەوەی دیکەدا زاڵ بووە، جا (إبن الأعرابي) پێی گوت: (استولی) بە مانای زاڵبوون دێت، کە لە نێوان دوو کەسدا کێشەیەك هەبێت، کەی خوای زاڵ و توانا کە سێك هەبووە کە عەرشی لـێ داگیر بکات تاکو ئەو بچێت (استولی)ی بەسەردا بکات[ئ]؟! کەواتە: دروست نیە بگوترێ: (أستوی) بە مانای (استولی)یە، بەڵکو (استوی) یانی خوا چۆتە سەر عەرش، جا ئایا چۆن چۆتە سەر عەرش؟! بەو شێوەیە کە لە خوا دەوەشێتەوە، گرنگ ئەوەیە دروست نیە بڵێی: وەك هی ئێمەیە، بەڵکو دەبێ خوا بە پاك بگیرێ لەوەو (تنزیه) بکرێ، بەڵام پاش چەسپاندن (إثبات)ی سەرجەم ناوو سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی[ب].

(ئ) پێم وا یە لەو قسەیەش بەهێزتر ئەوە کە بگوترێ: بێگومان خوای زاڵ و تو ناو کاربەجێ هەمیشەو هەردەم تواندار بووە بەسەر دروستکراوەکانی داو و هەمیشە هەر لە ژێر ڕکێفی ویست و دەستەڵاتی بێ سنووری دا بوون، بۆیە دەستەڵات ڕانان (استیلاء)ی خوا بەسەر عەرش و ئەوەی لە ژێر عەرش دایە هیچ مانای نیە!

(ب) لسـان العرب: بەرگی/6، لاپەڕە 447 .

## بنچـینەی چـوارەم

## نائومێـدبوون لە زانیـن و پەیـپێـبردنی حەقیقـەتی ناو و سـیفەتەکانی خوا (عزوجلّ)

بەرێزان!

بەڕاستی ئەم بنچینەیەش بنەمایەکی گەورەو گرنگە لە بواری هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ناوو سیفەتەکانی خوای بێوێنەدا، ئنجا ئایا بۆچی حەقیقەت و ماهییەتی ناوو سیفەتەکانی خوا بە ئێمە کەشف و دەرك ناکرێت؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لەبەرئەوەی کە سیفەتی هەر شتێك لق (فرع)ی خودی ئەو شتەیە، دیارە خوای پەروەردگاریش دەربارەی زاتی خۆی فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[1] بەڵکو بەدڵنیاییەوە ڕستەی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ هەر مەبەست پێی زاتی خوا نیەو، مەبەست پێی خوای بێوێنەیە بە زات و سیفەتییەوە، ئینجا مادام هیچ شتێك وەك خوا (سبحانەو تعالی) نەبێ لە هیچ ڕوویکەوە، کەواتە ناکرێ و ناگونجێ حەقیقەتی ناوو سیفەتەکانی خوا (عزّوجل) کە بێوێنەو هاوتان بزانرێ! بەڵێ بەرێزان! خوای پەروەردگار نە زاتی وەك زاتی هیچ کەسێك و هیچ شتێك وایە وە نە ناوو سیفەتەکانیشی وەك ناوو سیفەتی هیچ کەسێك و هیچ شتێك وانە. هەربۆیەش دەبێ زۆر وریاو بەئاگا بین، لەوەدا کە لە

---

[1] (الشورى  11).

کاتێکدا دەگوترێ: بیستنی خوا، دیتنی خوا، قسەو گوفتاری خوا، ڕووی خوا، عەرشی خوا، لە ئاسمان بوونی خوا، هەرکام لەوانە وە غەیری ئەو ناو و سیفەتانەش کە باس دەکرێن، خەیاڵ و بیروهۆشمان بەلای هیچ شتێکدا نەچێت، وەك لە باسەکانی پێشووش باسمان کرد، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوای پەروەردگار لە ئاسمانە، بێگومان لە ئاسمان بوونی خوا، جیایە لە ئاسمان بوونی درو ستکراوەکان، بۆ وێنە هەور لە ئاسمانە، واتە هەور لەلای سەرەوەیە، بەڵام لەژێر سایەو سێبەری ئاسمان دایە ـ ئاسمان بەو چەمك و واتایەی، کە لە قورئان و سوننەتدا باسکراوە(تر) ـ یان دەڵێین فڕۆکە لە ئاسمانە، یان باڵندە لە ئاسمانە، لە ئاسمان بوونی هەورو فڕۆکەو باڵندەو ئەو شتانە واتا یەکی هە یەو لە ئاسمان بوونی خوای پەروەردگار واتاو چەمکێکی دیکەی جیاوازی هەیە. بۆ نیزیك خستنەوە لە عەقڵ دەڵێین: لە ئاسمان بوونی هەموو ئەو شتانەی دی واتە: بوونە بەشێك لە ئاسمان و چوونە جوغز (حـيِّز)ی ئاسمانەوەو چوونە نێو ئاسمان، بەڵام هەرگیز ناگونجێ بڵێین: خوا چۆتە نێو ئاسمان، چونکە ئەوە هیچ کە نەك هەر ئاسمانێك هەر حەوت ئاسمانەکان لەگەڵ زەویش، خوای پەروەردگار دەفەرموێ لە نێو کورسی دان: ﴿وَسِعَ

---

(تر) واتە بە چەمك و واتا باوەکەی وشەی (سماء) یان (سموات) کە بریتیە لە حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین و یەك لەسەر یەك (سبع سموات طبا قًا) (الملك-3)، ئەگەر نا وشەی (سماء) لە قورئاندا بە چەند مانا یەکی دیکەش بەکارهاتوە، وەك: لای سەرێ، هەور، سەقفی خانوو هتد...

كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾(٭) كورسی خوا دەوری ئاسمانەكان و زەوی داوە، (كورسی) ئەگەر مەبەست پێی (جیسم)ێك بێت، كە ئەوە یەكێكە لە واتاكانی، ئەگەر مەبەستیش پێی (زانیاری) خوا، یان دەستەڵاتی خوا بێت، كە ئەوەش یەكێكی دیكەیە لە واتاكانی، وەك (ابن عباس) خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێت فەرمووویەتی: وە من ئەم ڕایەشم پێ ڕاست و تەواوە، چونكە هەبوونی (كُرْسي) بەواتاو چەمكە ماددی و جیسمییەكەی بەڵگەیەكی وای لەسەر نییە. ئینجا ئەگەر هەبوونی كورسی بە واتا ڕواڵەتی یەكەی ئیشكالی تێدابێ، عەرش هیچ ئیشكالێكی تێدانیە، وەك دوایی باسی دەكەین، دیارە (عرش)ی خوای لە سەرووی هەموو دروستكراوەكانەوەیەو خواش لە سەر عەرشە بەو شێوەیەی كە لە خوا دەوەشێتەوەو بۆ خوای پەروەردگار شایستەیە. كەواتە: كە دەگوترێ: خوا لە ئاسمانە، یانی خوا لە بەرزییە، نەك مەبەست ئەوەبێ كە خوا لە ئاسمانە وەك چۆن یەكێ لە دروستكراوەكان لە ئاسمانە، (وللّه المَثَلُ الأعلى) خوا لە بەرزی یەو لە سەرووی تێكڕای دروستكراوەكانی خۆیەوەیە، بە شێوەیەك كە بۆ خوا شایستەیە. ئنجا لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵكی كە لە ناوو سیفەتەكانی خوادا بە هەڵەدا دەچن، لەبەر ئەوەیە كە ناتوانن وەك پێویستە (تنزیه)و (تقدیس)ی خوای پەروەردگار بكەن و بە پاكو بێهەڵەی بزانن، بەڵكو هەڵدەستن (قیاسُ النَّفسْ) دەكەن، بۆ نموونە: یەكێك لەوانە بە زمانی هەڵوێستو

---

(٭) (البقـرة 255) .

حاڵ و دەڵێ: خوا زانیاری هەیە منیش زانیاریم هەیە، خوا دەبیستێ و دەبینێ منیش دەبیستم و دەبینم، واتە سیفەتی خواو هی ئەو وەك یەك وان!! بەڵام بێگومان زانیاری و بیستن و دیتن و توانا ناو ژیان و سیفەتەکانی دیکەی ئینسان لەقەدەر ئینسانن، هی خوای بەرزو بێ وێنەش لەقەدەر خۆیتی و، بە هیچ ڕەنگێك لەگەڵ یەکدا ناخرێنە تەرازووەوەو بە یەکەوە قیاس ناکرێن، ئینجا بە ڕاستی کەسێك بەتەمای ئەوەبێ بزانێ خوا (عزّوجلّ) چۆنە، یان ناوو سیفەتەکانی چۆنن! هەر بۆ نزیك خستنەوە لە عەقڵی ئینسان، وەك ئەوە وایە، بەڵکو لەوەش قورسترو دوورترە، ئینسان بیەوێت ئاوی هەموو دەریاکان لە پەرداخێکدا جێگا بکاتەوە!! کە لە ڕاستیدا ئەوە پێ چواندنێکی زۆر کەموکورتیشە، چونکە هەر چۆنێك بێت پەرداخەکە جێگای شتێك ئاوی تێدا دەبێتەوەو ئاوی ئۆقیانووس و دەریاکانیش سنووردارە، بەڵێ پەرداخەکە بچووکە، بەڵام ئەوانیش سنووردارن، بەڵام عەقڵی ئینسان سنووردارەو سیفەتەکانی خواش بێ سنوورن، بۆیە ئێمە هەرگیز ناتوانین دەرکیان بکەین. کەوابوو مەحاڵە ئینسان بتوانێ دەرکی ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن بکات، کەواتە دەبێ چۆن خوای زانا ناو کاربەجێ بۆ خۆی ئەو ناوو سیفەتانەی بەکارهێناون و پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی بەکارهێناون، ئێمەش ئاوا بەکاریان بێنین، بەڵام بێهیواو نائومێد بین لەوەی کە بتوانین بزانین ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار حەقیقەتیان چۆنە.

**بنچینەی پێنجەم:**

## هەر ناو سیفەتێکی خوا بە دەقێکی وەحی ڕاست و ڕاشکاو ئیسپات بوو، وەك ناو و سیفەتەکانی دیکە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێت و، نابێ بە بیانووی تێکگیرانی لەگەڵ عەقڵدا تەئویل بکرێ مەگەر زۆر ناچار بین

بەڕێزان!

کۆمەڵێك ناوی هەرە چاکی خوای بێ هاوتا، وە کۆ مەڵێك سیفەتی هەرەبەرزی خوای بێوێنە هەن، کە عەقڵمان بە سێنایی تێیان دە گات، وەك ئەوە کە خوای زاناو توانا زانیاری بێ سنووری هە یەو دە ستەڵاتی بێسنووری هەیەو ویستێکی هەیە کە بەسەر هەموو شتێکدا زا ڵەو خاوەنی ژیانەو هەموو شتێك دەبینێو دەبیستێو... هـ تد، ئەوا نە تا ئەندازەیەك عەقڵ سەرەدەرییەکیان لێدەکات و لێیان تێدەگات. بەڵام هەندێك سیفەتی دیکەی خوای بێوێنە هەن، وەك بڵێی لە عەقڵی ئینساندا جێگایان نابێتەوە، یاخود عەقڵ چاك لێیان تێناگات، وەك: لە ئاسمان بوونیو لەسەر عەرش بوونی، یان بەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرش، یان ئەوە کە خوا بەندەکانی خۆی خۆش بوێت، یان خوا تۆڵەستێن بێت، یان تووڕەبوونی خوا، وە سیفەتی دیکەی لەو بابە تەش، کە ئینسان

سەرنجیان دەدات بە ڕواڵەت بە نەگونجاویان دەزانێ بۆ خوا، بۆ چی؟! چونکە: تووڕەبوون ئەوەیە کە خوێنت بجۆشێت و ڕەنگت سوور هەڵبگەڕێت و دەمارەکانی ملت هەڵبستێ، جا وا بە بیرو خەیاڵتدا دێت کە ئەگەر خوا تووڕە ببێت ئایا چۆن و بە چ شێوەیەك؟! خۆ ناگونجێ ئەو نیشانانەی هەبێت کە هی ئینسانن، هەروەها خۆشویستنی خوا، یان خۆشحاڵ بوون و ڕازی بوونی یان پێ کەنینی خواو سەرجەم ئەو سیفەتانەی کە لە قورئاندا یان لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوون و پێشتر ئاماژەمان پێیان کرد. ئەو ناو سیفەتانەی خوای بێهاوتا ئایا ئێمە چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین؟! زانایان لەو بارەوە ئەم (بنچینەی پێنجەم)ەیان داناوەو دەڵێن: هەر کاتێك بە دەق (نص)ێکی شەرعی ڕاست و ڕاشکاو (صحيح و صريح)، بۆمان ئیسپات بوو کە خوای کاربەجێ ئەو ناوە یان ئەو سیفەتەی هەیە، ئێمە دەبێ بێ پێچ و پەناو بێ سێ و دوو تەسلیم بین و ئەو ناوە یان ئەو سیفەتەی بۆ بڕیار بدەین. ئنجا ئەگەر لێمان بپرسن: ئاخر ئەو سیفەتە چۆنە؟! دەڵێین: بۆ خوای بێوێنە بە تەئکید وەك هی ئێمە نیە چونکە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾: بەڵکو بەو شێوەیە کە بۆ خوای تاكو پاك شایستەیە، بەڵێ ئێمە مانای: پێکەنینو خۆشحاڵیو تووڕەبوونو ئەوانە دەزانین چۆنە، بەڵام بیگومان ئەو ماناو چەمکەی کە لە مێشکی ئێمەدا هەیە، کە تەنیا بۆ ئینسانو بۆ دروستکراوان شایستەیە، ئێمە ئەو ناوو سیفەتانە بەو ماناو چەمکە

بۆ خوای بێوێنە بەکارناهێنین چونکە شایستەی نییە بەڵکو دەڵێین: توورەبوونو خۆشحاڵ بوون و بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرشو ڕووی خوا، ئەوانە هەموویان بەو شێوەیەن کە بۆ خوا شایستەن و ئێمە ماهییەت و حەقیقەتیان نازانین، بەڵام جیاوازی ناخەینە نێوان ناو و سیفەتەکانی خوا، کە بڵێین: ئەوانەیان مەعقوولن و عەقڵ تێیان دەگات بۆیە قبووڵیان دەکەین، بەڵام ئەوانەی دیکە چونکە لە عەقڵەوە ناچن و سەر لێیان دەرناچێ ڕەفزیان دەکەین!! جا ئێستا با سەرنج بدەین! خوای زاناو کاربەجێ و توانا، فەرموویەتی: ﴿ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾[٤٢]، واتە: خوا بە هەموو شتێك زانایەو هەموو شتێك دەزانێ، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[٤٣] واتە: بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بالادەست و بە توانایە، وە فەرموویەتی:﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾[٤٤] واتە: خوا جگە لەوی هیچ پەرستراونین زیندوویەو سەرپەرشتی کارە، وە فەرموویەتی: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً﴾[٤٥] واتە: خوا بە قسەکردن فەرمایشی لەگەڵ مووسادا فەرموو، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعاً بَصِيراً﴾[٤٦] واتە: بێگومان خوا

---

(٤٢) ( الأحزاب – 40 ).
(٤٣) ( النحل – 77 ).
(٤٤) ( البقرة – 255 ).
(٤٥) ( النساء – 164 ).
(٤٦) ( النساء – 58 ).

بیسەرو بینەرە، وە فەرموویەتی: ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾(1) واتە: هەر چی بیەوێت دەیکات. ئەم حەوت (لا) سیفەتە کە (علم و قدرة و حياة و كلام و سمع و بصر و إرادة)ن، هەندێ لە زانایان هەن تەنیا ئەم (لا) حەوت سیفەتەیان بۆ خوای پەروەردگار بەکارهێناون، کە ئەشعەرییەکان و ماتوریدی یەکانن. دیارە لە کتێبەکانی (علم الكلام)دا وەك (العقائد النسَّفية)و (شرح المواقف)و (تهذيب الكلام) بۆ ئەوەی لێ تێ بگەن، تێیك نەچێ، لەو کتێبانەدا، دەڵێ: سیفەتەکانی خوا بیست (لالا)ن،: حەوتیان (معاني)ن، کە ئەم حەوتانە بوون، حەوتی شیان (معنوي) ین و پێنچیشیان سیفەتی (سلبـي)ن‌و یەکێکیشیان سیفەتێکی نەفسییە کە بریتیە لە (وجود)، کە دوایی باسیان دەکەین. بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر ورد بینەوە هەر دەبنەوە بەم حەوتە، چونکە سیفەتی (معنوي) هەر سیفەتی (معاني)ن بەڵام بە دەربڕینێکی دی دەگوترێن(2) بە شێوەی ناو (إسم) دەگوترێن ـ بەڵام ئایا بەڵگە چیە لەسەر ئەوە کە خوای بەرزو مەزن تەنیا ئەم حەوت ناوەی هەن؟! لە ڕاستیدا وەك باسی دەکەین هەندێك پاساویان هێناونەوە کە نە لە شەرعدا جێگایان دەبێتەوە، نە لە عەقڵ داو نە لە فیطرەتدا. ئێستا با ئێمە سەرنج بدەین! خوای بەرزو بێوێنە وەك چۆن ئەو حەوت سیفەتانەی بۆ خۆی بڕیارداوە کۆ مەڵێك

(1) (البروج - 16).

(2) صیغەی صیفەتە مەعنەویی یەکان ئاوا یە:(القدير، السميع، البصير...)، بەڵام سیفەتە مەعانی یەکان صیغەکەیان ئاوایە: (القدرة، السميع، البصَر).

سیفەتی دیکەشی هەر لە قورئاندا هێناوە، هەر لەو ئایەت و سوورەتانەدا کە ئەو حەوت سیفەتانەیان تێدا هاتوون، بۆ وێنە: لە (آية الكرسي)دا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾(٣) خوا یەکجار بەرزی مەزنە، وە هەر لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(٤) بزانە کە خوا زاڵی کاربەجێیە، وە لە ئایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انْتِقَامٍ﴾(٥) خوا زاڵی تۆڵە ستێنە، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾(٦) بێگومان تۆی زۆر بەخشەر، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾(٧) بێگومان خوا رۆزی دەرە، وە خاوەنی هێزەو زۆر پتەوە، وە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾(٨) خوا پەنهان بین و زۆر شارەزاو وردبینە، وە لە سوورەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾(٩) بە بەزەیی و بەخشندەیە، وە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾(١٠) بێگومان پەروەردگارم بەخشندەیەو بەندەکانی خۆی خۆش دەوێت وە هەر لە (الفاتحة)دا

---

(٣) (البقرة - 255).
(٤) (البقرة - 260).
(٥) (آل عمران - 4).
(٦) (آل عمران - 8).
(٧) (الذاريات - 58).
(٨) (الملك - 14).
(٩) (الفاتحة - 2).
(١٠) (هود - 90).

فەرموویەتی: ﴿رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پەروەردگاری جیهانەکان، وە فەرموویەتی: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾()، خاوەنی ڕۆژی سزاو پادا شت وە دە فەرموێ: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّو نَهُ﴾(ير)، خوا بەندەکانی خۆی خۆش دەوێ و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ، وە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾(سهم) خوا چووە سەر عەرش، بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، وە دەفەرموێ : ﴿أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ ﴾()، ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لە ئاسمانە کە بە زەویتاندا بەرێتە خوار، وە فەرموویەتی: ﴿وُ جُوهٌ يَوْمَ ئِذٍ نَاضِرَةٌ ۞ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾(له)، چەند ڕوویەك لە ڕۆژی دواییدا گە شن و پاراون، سەیری پەروەردگاری خۆیان دەکەن، کەواتە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا دەبینــرێ، وە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْ هَهُ﴾()، هەموو شتێك لەنێو دەچێت جگە لە ڕوو (وجە)ی خوا، هەڵبە تە ڕوو و (وجە)ێك کە لە خوا دەوەشێتەوە. وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هە یە کە باسی ڕوو (وجە)ی خوای پەروەردگار دە کات دە فەرموێ: ((ان الله لاينام، ولا يَنْبغي له أنْ ينام، ولكنَّه يَخْفَضُ القِسطَ و يَرْفَعُه، يُرفَعَ اليه

(تر) (الفاتحة  3).
(ير) (المائدة  54) .
(سهم) ( الأعراف  54) .
() ( الملك - 16).
(له) ( القيامة / 22-23) .
() ( القصص - 88) .

عَمَلُ اللیَّل قِبل عَمَل النهار، وعملَ النهار قبل عمل الليل، حِجابهُ نورً لو كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحاتُ وَجْهه ما آنتهى اليه بَصَرُه مِنْ خَلْقِه))(٣٨)

واتە: خوا ناخەوێ، وە ناگونجێ كە بخەوێ، بەڵام تەرازوو نزم دەكات و بەرزی دەكاتەوە، یاخود رِزقی خەڵكی فراوان دەكات و كەمی دەكاتەوە، یان كەمی و زیادی دەكات، كردەوەكانی شەو پێش هی رِۆژ بۆ لای خوا بەرزدەكرێنەوە، وە كردەوەكانی رِۆژیش پێش هی شەو بەرز دەكرێنەوە، واتە: هەر كردەوەی لە كاتی خۆیدا بۆ لای خوا بەرز دەكرێتەوە، ئینجا دەفەرموێ: پەردەیەك كە رِووی خوای بەرز لە دروستكراوەكانی دەشارێتەوەو پەنهان دەكات رِۆشناییيە، ئەگەر ئەو پەردەیە لابچێت لە پێش رِووی درەوشانەوەی رِووی هەرچی دروستكراوە هەمووی دەسووتێنێ.

وەك بینیمان هەرهەمان ئەو ئایەتو فەرمایشتانەی كە باسی ئەو حەوت سیفەتانەیان تێدان كە ئەشعەرییەكانو ماتوریدییەكان (الأشاعرة والماتريدية) گوتوویانە: خوا هەر ئەو سیفەتانەی هەن، هەمان ئایەت و فەرمایشتن كە باسی كۆمەڵێك ناوو سیفەتی دیكەی خوای بێهاوەڵ و هاوتا دەكەن. وەك (علي، عظيم، عزيز، حكيم، حليم، غني، خبير، ذوانتقام، وهّاب، رزاق... هتد). كەوا تە بابزانین پاساو (مبِّرر)ی ئەوانە چیە، كە گوتوویانە خوای پەروەردگار هەر ئەو حەوت سیفەتەی هەن؟! ئەو جۆرە كەسانە ئەو سێ پاساوەیان هێناونەوە:

(٣٨) مسلم و ابن ماجه واحمد والطيالسي، شرح السنة: للبغوي، بەرگی/ 1، لاپەرە 173.

پاساوی یەکەم: گوتوویانە: ئەو حەوت سیفەتە عەقڵ تێیان دەگات، بەڵام سیفەتەکانی دیکە لە عەقڵی ئینساندا جێیان نابێتەوە!. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم قسەیە هەڵەیە بەم چەند بەڵگەیە:

(الا) ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن مەرج نییە عەقڵ تێیان بگات‌و ڕێیان تێ بەرێت، وەك لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسمان کرد: ئینسان بۆ هەڵس‌وکەوت کردن لەگەڵ دەوروبەری ماددیدا پێنج هەستەکان‌و عەقڵیشی هەیە، وە فیطرت‌و دەروونیشی هەیە، بەڵام بۆ هەڵس‌وکەوت کردن لە گەڵ ئەودیو سرو شت و لە گەڵ خوای پەروەردگارداو لەگەڵ جیهانی نادیارو پەنهاندا، ئەوە (و حي) مان هەیە، کە تاکە ڕێگایەکی سەلامەت و مسۆگەرە کە ئێمە بە هۆیەوە بزانین جیهانی نادیار (عالم الغیب) چیەو چۆنە؟! بە خوای تاك‌و پاك‌و بە فرشتەکانەوەو بە ڕۆژی دواییەوەو بەرووحەوەو بە سەرجەم شتە نادیارەکانەوە، تەنیا (وحي)و پەیامی خوامان بە دەستەوە هەیە، وە لە ڕاستیدا جگە لە وە حی هیچ ڕێگا یەکی دیکەی مسۆگەرو سەلامەت و جێی دڵنیاییمان نییە، دیارە (و حي)ش زانیاری بێسنووری خوایە (عزّوجلّ)، کەواتە کە دەڵێین: ئەو سیفەتانە عەقڵ تێیان دەگات و ئەوانی دی عەقڵ تێیان ناگات، ئەوە ڕاست نیە. ئاخر عەقڵ چۆن لە زانیاری خوای پەروەردگار حاڵی دەبێت و چۆن زانیاری بێسنووری خوا لە عەقڵی ئینساندا جێگای دەبێتەوە؟! ئەگەر

مەبەست ئەوە بێت، کە ئەو حەوت سیفەتە لە عەقڵدا جێگا یان دەبێتەوە، بێگومان تەنیا هەر سیفەتی زانیاری خوا لە عەقڵی ئێمەدا جێگای نابێتەوە، کە خوای زاناو شارەزا وردو درشت دەبینێ و پێی شارەزایەو هیچی لە لا ون نابێ و مشوور لە هەموو شتێك دەخوات لە دروستکراوەکانی، ئنجا نەك هەر (زانیاری) بەڵکو سیفەتەکانی خوا هیچیان لە عەقڵی ئینساندا جێگا یان نابێتەوە ئەگەر مەبەست ناسین و دەرککردنی حەقیقەتیان بێت[تر]، کەوابوو ئێمە بە هۆی (وحي)یەوە دەزانین کە خوا ناوو سیفەتەکانی چەندن و چۆنن و چین؟! جا ئەگەر بە هۆی (وحي)یەوە دەزانین خوا ئەو حەوت سیفەتەی هەن، هەر بە هۆی (وحي) شەوە دەزانین کە ناوو سیفەتەکانی دیکەشی هەر هەن.

(لا) عەقڵ چەندە لەوە حاڵی دەبێت، کە پێویستە خوا زانیاری و دەستەڵات و ژیان و بوونی هەبێت و فەرمایشت و قسەی هەبێت، ئەوەندەش لەوە حاڵی دەبێت کە خوای بەرزو پاك خۆشەویستی هەبێت بۆ بەندەکانی و سیفەتی رزق پێدانی هەبێت و سیفەتی بەخشینی هەبێت و سیفەتی بەرزیی هەبێت، واتە عەقڵی ئینسان لەوانەش هەر حاڵی دەبێت وەك چۆن لە سیفەتە پێشووەکان حاڵی دەبێ!

---

(تر) بەڵام ئەگەر مەبەست لە: (جێگابوو نەوەیان لە عەقڵ دا) و (لێ حاڵی بوونیان) ئەوەبێ کە عەقڵ دانیان پێدادینێ و بە مەحاڵیان نازانێ ئەوە سیفەتەکانی خوا هەموویان هەر وان!

(لا) بەڵگەی سێیەمیشمان ئەوەیە کە ئەگەر مەبەست زانین و نا سینی حەقیقەت و ماهییەت بێ، لە ڕاستیدا عەقڵ دەستەوستانە لەبەردەم ناسین و زانینی حەقیقەت و ماهییەتی هەموو ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگارداو هەموویان لەو ڕووەوە وەك یەکن و جیاوازی یان نیە. کەواتە ئەو پاساوو بیانوو (مبرر)ە هیچ.

پاساوی دووەم: ئەم پاساوو بیانوویەشیان ئەوەیە کە دەڵێن: سیفەتەکانی دی هەموویان دەگەڕێنەوە نێو ئەو حەوت سیفەتە، بۆ وێنە دە ڵێن: سیفەتی (حکیم، خبیر) دەچنەوە نێو (علم)ی خوا، وە سیفەتی (لطیف، کریم، رحیم) دە چنەوە نێو سیفەتی (قدرة)ی خوای پەروەردگارەوەو... هتد، چا ئەوەی زۆر جێ گای سەر سوڕمانە ئەوەیەکە خوای بەخشندە سەدو چواردە (ﻼﻼ)جار (بسم الله الرحمن الرحیم)ی لە قورئاندا هێناوەو لە هەر (ﻼﻼ)دا سیفەتی (الرحمن الرحیم)ی خۆی هێناون، وە لە چەندان شوێنی دی کەش سیفەتی (رحمة)ی خۆی هێناوە، کەچی زانایانی (علم الکلام)[ﺗﺮ] سیفەتی ڕەحمەت و بەزەیی و بەخشندەیی و میهرەبانی خوای بەخ شندەیان حیساب نەکردوە!! بەڵام بێگومان سیفەتی بەزەیی (ر حمة)ی خوا، ناچێتەوە نێو هیچ کام لەو سیفەتانەو لێ یان جیا یە، هەروەها سیفەتی خۆشویستنی خوا بۆ بەندەکانی وەك فەرموویەتی: ﴿يُحِبُّهُمْ

---

(ﺗﺮ) واتە: ئەوانەیان کە خاوەنی ئەو بیرو بۆچوون و هەڵوێستەن.

وَيُحِبُّونَهُ﴾[1] وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾[2] ناچێتەوە نێو هیچ کام لەو سیفەتانەی دی، وە هەرکام لەو سیفەتانەی دیکە چەمك و واتایەکی تایبەتی هەیە، وە حەقیقەتێکی تایبەتی هەیەو ناچنە نێویەك، چونکە لە ڕاستیدا ئەگەر چووبانە نێو یەك، خۆ خوای کاربەجێ هیچ شتێکی زیادەی نەفەرمووەو تەنیا پیتێك لە قورئاندا زیاد نیەو خوای زاناو شارەزا یەك پیتی نە فەرمووە کە مانایەکی زیادەی نەبێت‌و پێویست نەبێت، ئەدی ئەو هەموو ناوە چاکانەو ئەو هەموو سیفەتە بەرزانەی خۆی چۆن باس دەکات ئەگەر پێویست نەکات‌و هەموویان هەر بچنە نێو ئەو حەوت سیفەتانە؟!

پاساوی سێیەم: پوختەکەی ئەوەیەکە دەڵێن: جگە لەو حەوت سیفەتانە ئەوانی دیکە، وێچواندن (تشبیه)یان تێدا یە! دەڵێن: بۆ وێنە خۆشویستن، دەگونجێ ئینسان ئینسانی خۆش بوێت، بەڵام لە خوای پەروەردگار ناوەشێتەوە کە دروستکراوەکانی خۆی خۆش بوێت، یان دەڵێن: تووڕەبوون (غَضَبْ) ئەوەیە کە ئینسان خوێنی دەکوڵێ و دڵی دەجۆشێ، ئەوەش لە خوا (عزّوجل) ناوەشێتەوە، هەروەها دڵ خۆش بوون (فرح)و پێکەنین‌و سیفەتەکانی دیکەی لەو بابەتە تێکڕای ئەو سیفەتانە وێچواندن (تشبیه)یان تێدایە، واتە وێچواندنی خوا بە دروستکراوەکانی و ئەوەش دروست نیە بۆیە نابێ ئەو جۆرە سیفەتانە

[1] ( المائدة  54 ).
[2] ( البروج – 14).

بۆ خوا بەکاربێن! بەڵام لە ڕاستیدا ئەم پاساوەشیان ڕاست نیە بەم بەڵگانە:

(لا) ناوو سیفەتەکانی خوا، لە قەدەر خوان و وەك زاتی خوا بێ وێنەن و بێهاوتان، جا چ خۆشویستنی خوا بێت، چ بەزەیی و تووڕەبوونی خوا بێت، چ دروستکردن بێت و چ سیفەتی زانیاری و توانا و ئەوانی دیکەبن.

(لا) وەك چۆن بەزەیی و خۆشویستنی خوا، وە تۆڵە ستاندن و تووڕەیی خوا، ئەگەر هی ئینسان بن، پێویستی یان بە چەند ئەندامێك هەیەو چەند نیشانەیەکی تێدا دەردەکەون، وەك خوێن هەڵچوون و ڕەنگ سوور بوونەوە، یاخود دڵ گوشاد بوون و ئەوانە، بە هەمان شێوە ئەو سیفەتانەی دیکەی خوای بێوێنەش کاتێك کە هی ئینسانن دیسان پەیوەندی یان بە ئەندامەکانی ئینسانەوە هەیە، بۆ وێنە (دیتن) ئینسان بە گلێنەی چاوو تۆڕی چاوو بە هۆی پێڵوەکانی کە دەیانکاتەوە دەبینێت، وە (بیستن) ئینسان بە هۆی ئەو ئێسقانانەی کە لە گوێدا هەن، وەك چەکوش و سندان و ئاوزینگ و بەشەکانی دیکەی گوێ وە دەبیستێ، کەواتە: ئەگەر ئەو سیفەتانەی دیکە وەك: خۆشویستن، تووڕەبوون، تۆڵەستاندن، بەرزبوونەوەو چوونە سەر عەرش، وێچواندن (تشبیە) بگەیەنن، لە ڕاستیدا ئەوانی دیکەش هەر دەیگەیەنن! بەڵام ئێمە پێشتر گوتمان نە زانیاری خوا وەك هی ئێمە وایەو نەبیستن و دیتن و ژیان و ویست و... هتدیشی ـ

دەجا بەهەمان شێوەش: نە خۆشویستنی خوا وەك ئێمەوایە، نە تووڕەبوونیو نە تۆڵەستاندنەوەی و نە پێکەنینیو نە چوونە سەر عەرشیو نە ڕزق دانیو نە ژیاندنو نەمراندنیو هیچ کام لە سیفەتەکانی خوا وەك هی ئێمە نین، ئەگەرنا سیفەتەکانی دیکەش بۆ نموونە: (زانیاری) ئێمە بە هۆی عەقڵ و مێشكو دەمارەوە دەتوانین زانیاری وەدەست بێنین. بەلاَم بێگومان زانیاری خوا (سبحانەو تعالی) ـ وە تێکڕای سیفەتەکانی دیکەش بە هۆی ئەندامو ئامرازانەوە نین و پەیکیان لە سەریان نەکەوتوەو هیچ پەیوەندییەکیان پێیانەوە نیە. کەوابوو، ئەگەر لەبەر وێچواندن (تشبیە)و وەهمی جەستاندن (تجسیم) بڵێین: با ئەو سیفەتانە بۆ خوا بەکارنەهێنین، لە ڕاستیدا سیفەتەکانی دیکەش، ئەگەر ئینسان ئاگای لە خۆی نەبیّو خوای پەروەردگار بە پاك نەگریّو بە دوورنەگریّ لە وێچوونی دروستکراوەکان، سیفەتەکانی دیکەش جەستاندن (تجسیم) وێچواندن (تشبیە) هەر دەگەیەنن!. لێرەشدا دێینە کۆتایی بابەتی (بنچینە گرنگەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ ناوو سیفەتەکانی خوادا)، کە زۆرینەی زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام لەسەریان پێکهاتوون.

# ئــــەم بەنــــدە

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەندی چوارەمە لە چوار دەرس پێک هاتوە: (لاولاولاولا)، وە دوو بابەتی سەرەکی گرتۆتە خۆی:

بابەتی یەکەم: تەئویلکردن لە نێوان تێپەڕاندنو بەزایەدان دا، جا ئەم بابەتی یەکەمە دابەش دەبێ بۆ سـێ خاڵی سەرەکی:

خاڵی یەکەم: چەمك و واتای وشەی تەئویل.

خاڵی دووەم: ئایا تەئویل بەگشتی ڕەت دەکرێتەوە؟!

خاڵی سێیەم: تەئویلکردن لە نێوان زانایانی پێشین و پاشین دا.

بابەتی دووەم: سیفەتە خەبەریـیـیەکان لە نێوان تەئویل کرانو بەرێ کراندا. ئەم بابەتی دووەمەش بۆ چەند خاڵێك دا بەش کراوە، کە ئەمە ناو و نیشانەکانیانە:

خاڵی یەکەم: تەوژمی سیفەت لا بەرەکان (نفاة الصفات)و سێ قوتابخانە سەرەکییەکـانی: جەهمییـــەکانو ئەشعەرییەکانو ماتوریدییییەکان.

خاڵی دووەم: سیفەتە خەبەرییەکان، هۆی ناونرانیان، جۆرەکانیان، ژمارەیان.

خاڵی سێیەم: سێ جۆرە هەڵوێست لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەکاندا، دووی چەوت و یەکی ڕاست.

خاڵی چوارەم: سەرنجدانێکی گشتی لە سیفەتە خەبەرییەکان لە ڕووی تەئویلکران و بەرێ کرانەوە، شایانی باسیشە کە ئەم بەندە باسی کۆتاییە لە بارەی ناوو سیفەتەکانی خوای بەرزو بێوێنەوەو ئەگەر بەندەکانی پێشوو دەوری بناغەو پێشەکیو ڕێ خۆشکەریان بینی ئەوە ئەم بەندە بە هەردوو بابەتەکەیەوە دەوری ئەنجامو بەرهەم دەبینێ و چڕیی‌و پڕیی لە باسەکانیدا ڕەچاوکراوەو لەو سۆنگەیەشەوە وریایی وردبوونەوەی پێویستی گەرەکە!

# بابــەتی یەكەم:

# تەئویلكـردن لە نێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا

## خــاڵی یەكـــەم: چـــەمك و واتای وشـەی (تەئـویل):

بەڕێزان!

وشەی (تأویل) لە ئەصڵی زمانی عەرەبی دا لە (آل، یؤُلُ، مآلاً، وتأویلاً) هاتوە، واتە (رَجَعَ، یَرْجِعُ، مَرْجعاً) وشەی (مَرْجِع) واتە: ئەو شوێنەی كە ئینسان بۆی دەگەڕێتەوە (مآل)یش بە مانای (مَرْجع) دێت، (آل)ی ئینسان واتە: خزم و كەس و دۆست و نزیكان وە وشەی (تأویل) لە زمانی عەرەبیدا سێ واتایان دەگەیەنێت:

(ا) ئاكام و سەرەنجام، (العاقبة والمآل)، وە لە قورئانیدا بە زۆری خوای پەروەردگار وشەی (تأویل)ی بەم واتایە بەكارهێناوە، بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[1]، واتە: ئەی بڕوادارینە! فەرمانبەریی خوا بكەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، وەهی كاربەدەستێك كە لە خۆتانن، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە

(1) ( النساء - 59 ).

ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە بۆ ئێوە چاکترە، وە سەرەنجامی شی با شترە، (وأحسن تأویلاً) واتە: (وأحسن عاقبةً و مآلاً) سەرەنجامی ئەوە کە تۆ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خواو کارەبەدەستی مسوڵمانان بکەی، لە دونیاو قیامەتدا ئینسان سەربەرزو بەختەوەر دەبێت، کەواتە (تأویل) واتە سەرەنجام و عاقبەت. هەروەها فەرمووویەتی: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾[1] ئەم ئایەتە باسی ئەوە دەکات کە کافرەکان هەڵوێستیان لە بەرانبەر قورئاندا ئەوەیە کە بە درۆی دەزانن جا خوای بێ هاوەڵ دە فەرمویێ: بەڵکو بروایان بە شتێك نیە ـ مەبەست قورئانە کە زانیاری ئەوان دەورەی نەداوە واتە دەرکی گەورەیی و پایەبەرزیی قورئان ناکەن بۆیە ئیمانی پێ ناهێنن (ولما یأتهم تأویله) وە جارێ ئاکام و سەرەنجامی ئەو شتانەش کە قورئان دەفەرموێ، جارێ بۆیان نەهاتوە (وەك: شکستی کافرەکان و سەرکەوتنی بڕواداران و پەرەسەندنی ئیسلام و زاڵ بوونی بەسەر ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆمدا)، کەواتە (تأويلُهُ) یانی: سەرەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە قورئان داونی. هەروەها فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾[2]، واتە: ئایا کافرەکان چاوەڕێی چی

---

[1] ( یونس – 39 ).
[2] ( الأعراف – 53 ).

دەکەن هەر چاوەڕێی ئەوە ناکەن کە ئاکام و سەرەنجامی ئەوەی قورئان دەفەرموێ بێ! ئەو ڕۆژە کە سەرەنجامی ئەو شتانە کە قورئان دەفەرموێ دێ، ئەوانەی کە قورئانیان فەرامۆش کردوە لە ڕابردوودا دەڵێن: بە ڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان حەقیان هێنابوو! (دیارە ئەوە دوای ئەوەی کە ئەنجامی بەڵێنەکانی قورئان دێنە دی)، کەواتە (تأويل) واتە: ئاکامو سەرەنجامی شت، ئەمە واتای یەکەمی وشەی (تأويل).

(لا) وە بە مانای لێکدانەوەو تەفسیرکردن دێ، وەك خوای تاكو پاك (عزّوجلَّ) فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾[1]، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە قورئانی ناردۆتە سەرتۆ، هەندێك لە ئایەتەکانی (مُحْكَم)ن (واتە: مانایان ڕۆشن و ئاشکرایە) ئەوانە یان ئەسڵی کتێبی خوان (واتە: ئەسڵی قورئانن و ئەو بنچینەو بناغەیەن کە دەبێ ئایەتەکانی دی لە بەر تیشك و ڕۆشنایی ئەواندا تەفسیر بکرێن و لێکبدرێنەوە) وە لە ئایەتەکانی قورئاندا هەندێك ئایەتی دی هەن کە وێک چوون، (واتە: چەند

(1) ( آل عمران - 7) .

مانایەکی لێک چوویان هەیەو زیاتر لە مانایەکیان هەیەو هەڵدەگرن) جا ئەوانەی دڵیان لادان و نەخۆشی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە وێکچوون، بۆ ئەوەی کە ئاشووب (لە نێو مسوڵمانانندا) پەیدا بکەن، وە بۆ ئەوەی کە ئاکام و سەرەنجامەکەی بزانن، یاخود بۆ ئەوەی کە مانا و تەفسیرەکەی بزانن، بەڵام لێکدانەوەو ماناکەی جگە لە خوا، وە جگە لەوانەی رۆ چوون لە زانیاریدا کەس نایزانێ، هەندێ لە زانایانیش گوتوویانە: دەبێ لێرەدا بوەستین کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ﴾ واتە: تەفسیرو لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە تەنیا خوا دەیزانێ، وە ئەوەی دواتر رستەیەکی سەربەخۆیە کە دەفەرموێ: ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا﴾ واتە: ئەوانەی کە لە زانیاری دا رۆچوونو زۆر شارەزان، دەڵێن: بڕوامان پێی هەیەو هەموو ئایەتەکان ـ بە هەردوو جۆری (محکم)و (متشابه)ەوە ـ لە لایەن خواوەیە، دیارە خوای کاربەجێش لەبەر زۆر حیکمەت ئایەتی (متشابه)ی ناردوون، یەکیان ئەوەیە کە قورئان مانای زیاتر هەڵبگرێ، یەکی دیکەشیان تاقیکردنەوەی خەڵکە. جا لێرەدا ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ﴾ چ ﴿وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ی (عطف) بکەینە سەر وشەی بەرزو پیرۆزی (ألله) وە چ لەسەری بوەستین، هەرچۆن بێ تەئویل هەر بە مانای لێکدانەوەو تەفسیر دێ، ئنجا بەڵگەیەکی

دیکە لەسەر ئەوە کە وشەی (تأويل) بە مانای لێکدانەوەو تەفسیر هاتوە ئەم ئایەتەیە کە لەبارەی (یوسف) پێغەمبەر (علیه السلام)ەوە دەدوێ دوای ئەوەی باب و دایکی و یازدە برایەکەی چوون بۆ میسر، کە ئەوکاتە (یوسف) لەوێدا خاوەنی مەقام و پلەیەکی بەرز بوو، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّداً وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً﴾[1] واتە: وە باب و دایکی بردنە سەر عەرش (واتە ئەو کورسیو تەختەی کە هی دەستەڵاتیو حوکمڕانی ئەو بوو، لە سەر ئەو تەختە داینان، دیارە بۆ خۆی وەك خۆ بەکەمگرتن لەبەردەم باب و دایکی دا لە خوارەوە دانیشتوەو ئەوانی بەرز کردۆتەوە)، وە هەموویان کڕنووشیان بۆی برد (واتە: هەم دایك و بابی و هەم یازدە براکەی، کە دیارە لە شەریعەتی ئەواندا کڕنووشی ڕێزو حورمەت بۆ یەکتر بردن حەرام نەبووەو ئەوکاتە وەك سەلام لە یەکترکردن بەکاریان هێناوە)[2] ئنجا (یوسف) گوتی: (یا أبت هذا تأویل رؤیاي من قبل قد جعلها ربِّي حقاً) واتە: ئەی بابە ئەمە لێکدانەوە (تعبیر)ی خەونەکەم بوو، کە پێشتر ـ بە منداڵی ـ بینیبووم، خوا

---

(1) (یوسف - 100).

(2) دەشگونجێ کە مەبەست لە کڕنووش (سجدة) لێرەدا جۆرە چەمینەوەو ئاماژەیەکی ڕێزگرتن بێ، نەك سەر خستنە سەر زەوی.

خەونەکەمی بە ڕاست گێڕاو هاتە دی، کەواتە ڕوون بۆوە کە وشەی (تأويل) بە مانای لێکدانەوەو تەفسیرکردن هاتوە.

(٣) سێیەمین مانای وشەی (تأويل) بریتیە لە: لادانی وشەیەك لە مانا ڕواڵەتی، یان (حقیقي) خۆی، بۆ مانا یەکی پەنهان، یاخود (مَجازي)، لەبەر بەڵگەیەك کە ڕێگامان نادات، ئەو وشەیە بە مانای حەقیقی یەکەی، یاخود بە مانا ڕواڵەتی یەکەی بەکاربێنین. وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ کە دەگونجێ وشەی (تأويل) لێرەدا بەو مانای سێیەمیشیان بێت، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستیش دەڵێین: وشەیەك هەیە دوو واتای هەن، واتایەکی ڕواڵەتیو حەقیقی، وە واتا یەکی پەنهان و (مجاز)، بۆ وێنە: وشەی (أسد) واتە: شێر، مانا حەقیقی یەکەی یانی گیاندارێکی دڕندە کە پێی دەگوترێ شێر، مانا یەکی (مجازي)یشی هەیە کە بریتیە لە پیاوی ئازا، بۆ نموونە: ئەگەر ئێستا من بڵێم: ئەوە نەڕەشێر هات، کەس گومانی بەلای ئەوەدا ناچێ کە پێی وابێ من مەبەستم ئەوەیە شێرێکی دڕندەی نێو جەنگەڵەکان هات!، بەڵکو هەمووتان بیرو زەینتان بەلای ئەوەدا دەچێ کە دەبێ چ کەسێکی زۆر ئازا بەرەو ئێرە بێت!. مەبەست ئەوەیە کە هەندێك وشە هەن هەم مانایەکی ڕواڵەتیو حەقیقی یان هەیەو هەم مانایەکی پەنهان مەجازیش، جا جاری وا هەیە لەبەر نیشانەو

بەڵگەیەك ناگونجێ كە وشەیەك بەمانا ڕواڵەتی و حەقیقی‌یە كەی بەكاربێنیێو بە ناچاری دەبێ بڵێین، مەبەست پێی ما نا پەنهانو مەجازی‌یەكەیەتی، وەك ئەوەی كە بگوترێ: ئەوە شێرەكە هات، یاخود ئەوە ڕێوی یەكە هات، حەتمەن دەزانێ مەبە ست لە ڕ ێوی كەسێكی فێڵبازو ساختەچییە نەك ڕێوی (ثَعْلَب)ی ڕاستەقینە!!، جا ئایا بەڵگەمان چیە كە وشەی (تأو یل) ئەو ما ناو چەمكە شی هەیە؟! بەڵگەمان ئەوەیە وێرای ئەوەی كە ئا یەتی ژ مارە (٧)ی سوورەتی (آل عمران) ئاماژەی پێدەكات، ئەو دووعایەش پێغەمبەر ﷺ كە بۆ (عبدالله) كوڕی (عباس)ی كردوە، دەلا لەتی لە سەر دەكات كە فەرموویەتی: ﴿أللهم فقهه في الدِّين و عَلِّمْهُ التَّأْويل﴾[1] واتە: ئەی خوایە لە دیندا شارەزای بكە وە تەئویلیشی فێر بكە، جا (تأويل) چ بە وا تای تەفسیرو لێكدا نەوە بێت، چ بە وا تای لێكدانەوەی تایبەت بێت كە ئەو مانا یەی سێیەمیانەو هەموو كەس نایزانێتو كورتەكەی ئەوە یە كە تۆ و شەیەك بە ما نا ڕواڵەتییەكەی بەكاری نەهێنیو بە مانای مەجازی یەكەی بەكاری بێنی. لەبەر بەڵگەیەكو نیشانەیەك كە ڕێگەت لێ دەگرێ. ئە مە كورتەیەك لە بارەی واتای وشەی (تأويل)ەوە.

---

[1] رواه الأمام أحمد، وە (احمد شاكر) بە (صحيح)ی داناوەو (بخاري)یش بە تەعبیری: هێناویەتی: (اللهم علّمه الكتاب) هێناویەتی.

## حــاڵی دووەم: ئایـــا تەئویل بە گشــتی ڕەت دەکرێتــەوە؟!

هەیە دەڵێ: دروست نیە هیچ سیفەتێکی خواو هیچ ئایەتێك (تأویل) بکەین! جا ئایا ئەوە ڕاستە یان نا؟!! لە وەڵامدا دەڵێین: جارێ ئەگەر وشەی (تأویل) بە مانای یەکەم و دووەمی بەکاربێت، ئەوە بێگومان هەموو جۆرە تەئویلێك ڕەواو بەجێیە، واتە: ئەگەر تەئویل بریتی بێت لە ئاکام و سەرەنجامی شت، وە یان بریتی بێت لە تەفسیرکردن و لێکدانەوە، کە ئیمام (طبري) پێشەوای توێژەرەوانی قورئان لە تەفسیرەکەی خۆیدا هەرجارێك ئایەتێك تەفسیر بکات دەڵێ: (وتأویل هذه الآیة، وصار تأویلها) واتە: وە مانای ئەم ئایەتە، کەواتە: ئەگەر بە مانای یەکەم و دووەم بێت ئەوە تەئویل هەمووی ڕاست و بەجێیە، بەڵام ئەگەر مانای سێیەمی لێ‌بگرین کە بریتییە لەوەی و شەیەك یان ڕستەیەك مانایەکی ڕواڵەتی هەیە، وە مانایەکی پەنهان و مەجازیشی هەیەو تۆ ناچار دەبی مانا مەجازییەکەی لێ‌بگری و ناتوانی مانا ڕواڵەتی یەکەی لێ‌بگری و بەکاری بێنی، بەڵێ ئەگەر بەم چەمكو واتایە بێت، ئەوە (تأویل) دوو بەشە، بەشێکی مەقبووڵەو وەردەگیرێو پەسندەو بەشێکیشی وەرناگیرێ و ڕەتکراوەیە، وە ئەو جۆرەی کە پەسندو مەقبووڵە، ئەوەیە کە بەڵگەو نیشانەیەك هەبێت ئێمە ناچار بکات ئەو وشەیە، یاخود ئەو ڕستەو دەربڕینە بە مانا ڕواڵەتیو حەقیقی یەکەی

بەکار نەهێنین، جا دیارە ئەگەر ئەو جۆرە تەئویلە کە بەڵگە یەکی شەرعی، یان بەڵگەیەکی عەقڵی لەسەری هەبێ، ئەوە پێی دە گوترێ تەئویلێکی ڕەواو دروست و گونجاو، بەڵام ئەگەر بەبێ بەڵگەی شەرعی، یان بەبێ بەڵگەی عەقڵی، کەسێك هەر لەخۆوە بڵێ: ئەو مانا یەی لێدەگرم، یان بەم شێوەیە تەفسیری دەکەم، ئەوە بێگو مان شتێکی نارەواو ڕەتکراوەیە. ئنجا با سەرنج بدەین! خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾(تر) واتە: وە خوا لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن، یان لە هەر حاڵێك دابن، بەرێزان! لەگەڵ بوونی خوای پەروەردگار بۆ ئێمە دەگونجێ دوو واتایان بگەیەنێ، یە کەم: خوا بەزاتی خۆی لەگەڵمان بێ، دووەم: خوا بە سیفەتەکانی لە گەڵمان بێ، جا ئا یا دەگونجێ بڵێین: خوا بەزاتی خۆی لەگەڵمانە؟! بێگومان نەخێر، چونکە: ئەگەر خوا بەزاتی خۆی لەگەڵ ئێمە بێت، ئەوە ما نای وا یە خوای بێوێنە هاتۆتە ئەم دونیایەوەو لەمسەر زەوی یەیە!! کە بێگومان ئەوە نابێو ناگونجێ(یر)، بۆیەش هەموو زانایان، زانایانی هاوەڵان (أصحاب)و شوێنکەوتووان و ئەوانی دی کەش ئەم ئایە تەیان تەئویل کردوەو گوتوویانە: (وهو معكم أينما كنتم، أي، بعلمه وقدرته وسُلطانه) وا تە: خوا بە زانیاریی‌و توانایی‌و دەستەڵاتی لەگەڵتانە ـ نەك بە زاتی خۆی. کەواتە ئەو جۆرە تەئویلە بەجێ‌و ڕا ستو درو ستە، چونکە ناتوانین

---

(تر) ( الحديد 4 ).

(یر) بە زۆر بەڵگان کە یەکیان (ليس كمثله شيء) ە.

بڵێیــن: خوای کاربەجێ بە زاتی خۆیو ئێستا لەگەڵ ئێمەیەو لێرە یە، بەڵکو ئەوە ئەهلی (حُلولْ) وادەڵێن، ئەوانەی کە دەڵێن: خوای بەرزو مەزن دەچێتە نێو جەستەی ئادەمیزادەکانەوە، یان ئەهلی (إتّحاد) کە دەڵێن: خوای بێ وێنە بریتیە لە ڕووحی ئەم بوونەوەرەو ئەم بوو نەوەرەش جەستەی خوایە!! کە بێگومان ئەوانە ئەهلی کوفرن و لە دین دەرچوون. هەروەها نەصرانی یەکان کە دەڵێن: (إتَّحد اللاّهوت بالنّاسوت) وا تە: خوا لەگەڵ ئینساندا یەکی گرتوە، کە مەبەستیان ئەوەیە خوا هاتۆ تە نێو جەستەی (عیسی)وە!، کە ئەمەش جۆرێکە لە بیرۆ کەی (حـ لول)، کەواتە ئەگەر بڵێیــن خوا بەزاتی خۆی لێرەیەو لەگەڵمانە ئەوە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە سەردەکێشێ بۆ (حلول) و (إتّحاد)[tr] و ئەوەی نەصرانییەکان پێی دەڵێن: یەککگرتنی لاهوت و ناسوت، کە هەمووی درۆو دەلە سەو ئەفسانەیەو وە هەمووشی کوفرە. کەواتە تەئویل بە ما نای سێیەمی ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەکی ناچارکەری شەرعی یان عەقڵی لە گەڵ دابێت ئەوە مەقبووڵە، وەك کە وێنەمان بۆ هێنا یەوە، بەڵام ئە گەر بەڵگەی لەگەڵدا نەبێت ئەوە ڕەتکراوەیە، وەك تەئویل کردنەکانی زۆرێك لە ئەهلی تەصەووف یان ڕاست تر بڵێین (غُلاة) یان، ئەوا نەیان کە بڕوایان بە یەکیەتی بوون (وحدة الوجود) هەیە، وە یان هەر کە سێکی

(تر) جیاوازی نێوان (حلـول) و (إتحاد) ئەوەیە کە (حلول) ئەوەیە کە شـتێك بچـێتە نێو شـتێکی دیکە، بەڵام (إتحاد) ئەوەیە کە دووشت پێکەوە یەك بگرن و ئاوێتەی یەکدی ببن.

دی کە وابزانێ خوای پەروەردگار بە زاتی خۆی لەسەر زەوی‌یەو لە گەڵ دروستکراوەکانی خۆی تێکەڵ بووە: (سبحانەو تعالى عمّا يقولون علواً كبيرا). ئێستاش با چەند وێنەیەك بهێنینەوە لەسەر تەئویلکردنی نا مەقبووڵ و پووچ: لە هەندێك لە تەفسیرەکانی (شيعة)دا، ئەم چەند ئایەتە کە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَان. بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَان. فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان. يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾(1)، واتە: دوو دەریای تێکەڵی یەك کردوون دەگەنە یەك، بەڵام پەردەیەکیان لە نێواندا هەیەو هیچیان سنووری ئەوی دی کە نابەزێنێ، (واتە: دەگەنەیەك، بەڵام تێکەڵ بە یەك نابن، کە مەبەست ئاوی سوێرو ئاوی شیرینە کە دەگەنە یەك بەڵام تێکەڵ و ئاوێتەی یەك نابن) ئایا کام لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان (ئەی مرۆڤ و جند) بەدرۆ دەزانن!! پاشان لەو دوو دەریایە گەوهەرو مرواریی دێنە دەرێ، (کە دوو جۆرە بەردی زۆر بە نرخ وگرانبەهان). ئەمە مانای ڕاستەقینەو سادەی ئەو ئایەتانەیەو ناگونجێ هیچ مانایەکی دیکەی دوور لە مەیان هەبێ، بەڵام هەندێك لە شیعە ئاوا بەم شێوەی خوارەوە تەفسیریان دەکەن: دەڵێن: (مَرَجَ البحرين يلتقيان، أي علي وفاطمة) واتە: ئەو دوو دەریایەی کە دەگەن بەیەك، مەبەست پێیان (علي و فاطمة)ن - خوا لێیان ڕازی بێ-، (بينهما برزخ لايبغيان، أي النبي) واتە: ئەو پەردەیەی کە لە نێوانیاندا هەیەو ناهێڵێ هیچیان سنوورشکێنێ بکەن،

---

(1) ( الرحمن - 19، 20، 21، 22 ) .

ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ کە لە نێویان دایە، (یخرج منهما اللؤ لؤ والمرجان، أي الحسن و الحسين) واتە: ئەو گەوهەرو مرواری یانەی کە لەو دوو دەریایە دێنە دەرێ مەبەست پێیان لە (حسن و حسین)ە -خوا لێیان ڕازی بێ-!! هەڵبەتە ئەو ئایەتانە ما نا ڕوا ڵەتی یە کەیان زۆر ڕوون و ئاشکرایە بۆیە ئێمە پێویستە هەر بەگوێرەی ئەو ما نا ڕوا ڵەتی یە تەفسیریان بکەین چونکە هیچ بەڵ گەو نیـ شانەیەکی نا چارکەر نـیە ناچارمان بکات تەئویلیان بکەین، بەڵکو بە پێ چەوانەوە بەڵ گەی ناچارکەر هەیە کە ناهێ ڵێ تەئویلیان بـ کەین! یان لە سووڕەتی (البقرة)[ت]دا کە خوای بێوێنە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً﴾ هەندێك لە شیعە لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ(البـ قرة أي: عائـ شه) خوای پەروەردگار لەسەر زمانی (مو سی) (علـ يه الـ صلاة والـ سلام) فەرمان بە بەنی ئیسرائیل دەکات و پێیان دەفەرموێ: بۆ دۆزینـەوەی بکوژ (قاتل)ی جەنازەیەکی فڕێ دراو خوا فەرمانتان پێ دە کات کە مانگایەك سەر ببڕن و پاشان ئەندامێکی ئەو مانـ گا سەربڕاوە لەو جەنازەیە بخشێنن زیندوو دەبێتەوەو قسە دەکاو ناوی بکوژە کەیتان پێ دەڵێ، کەچی ئەوان لەبەر نەزانیی و کینەو بوغزی زۆریان بەرانبەر بە دایکی بڕواداران (عائشە) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێن: ئەوە فەرمانە بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە عائـ شەی هاو سەری سەربڕێ!! مەبە ست ئەوەیە کە ئەمە جۆرێکە لە (تأویل)و تەفسیرو لێکدا نەوەی نا بەجێ و

---

(ت) ( البقــرة  67 ).

ناماقووڵ، کە هەر بە ڕواڵەت (تأويل)ە، ئەگەرنا لە ڕا ستیدا گۆڕین (تحريف)ە، چونکە (تأويل) ئەوەیە بەڵگەی لەسەربێ، بەڵام کە بەڵگەی لەسەر نەبێ پێی دەگوترێ: (تحريف)، واتە: گۆڕین و دەستکاری کردنی بە ناهەق، هەروەها زۆر لە ئەهلی تە صەووف وەك پێ شتر ئاماژە مان پێکرد ئەوا نەی پێ یان دە گوترێ ( غُلاة) وا تە: زۆر ڕۆ چووەکان و تێپەڕێنەرەکانو لە سنووری شەرع دەرچووەکان، ئەوانیش ئەو جۆرە (تأويل)ەیان زۆرە، یەکێك لەوانە (محي الدين بن عربي)، کە دوو کتێبی ناوداری هەن بە ناوی: (الفتوحات المكية)و (فُصوص الحِكَم)، جا لەو دوو کتێبەدا ئەو جۆرە (تأويل)ە کە هەر بە ڕواڵەت (تأويل)ە، گەرنا لە حەقیقەتدا ئەو گۆڕین (تحر يف)ە زۆر زۆرەو پێی سیخناخ کراون! (الآلوسي)یش کە توێژەرەوەیەکی گەورەی قورئانەو خاوەنی تەف سیری (روح المعاني)یە، کە تەفسیرێکی زۆر با شە، بەڵام بەدا خەوە لەژێر ناوونیشانی (التفسير الأشاري)دا زۆر لە ق سەی ئەو جۆرە کە سانە دێنێت، بە تایبەت هەندێ شت لە (محي الدين بن عربي) نەقڵ دەکات، نەك شتی زۆر بێمانا، بەڵام هەندێ شتیشی هەر هێناوە، جا یەکێك لەو شتانەی کە (محي الدين بن عربي)[ت] لە قورئا نێدا تەئویلی کردوە ئەوەیە کە خوای بەرزو مەزن باسی فیرعەون دەکات کە دەخن کێ وەك

---

(ت) ئەهلی تەصەووف بە: (الشيخ الأكبر)ی ناودەبەن !!

فەرموویەتی: ﴿حَتَّى إِذا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ﴾(1) جا (إبن عربي) دەڵێ فیرعەون لە دەریای (توحید)دا نقوم بووە نەك خنكابێ، وە دەڵێ: هەركام لە (مووسا) (علیه الصلاة والسلام)و فیرعەون هەریەكەی بە جۆرێك لە خوا بەیەكگرتن حاڵی بوو بوون! دیارە لێرەدا مەبەستی (إ بن عر بي) ئەوەیە كە (مووسا) تەنیا خوای بە پەر ستراو (إ لە) زانیوە، بەڵام (فیرعەون) هەموو بوون (وجود)، چونكە بە حیسابی (إ بن عر بي) فیرعەونیش لەسەر بناغەی (وحدة الوجود) هەموو شتێكی بە خواو خوای بە هەموو شتێك زانیوە!! جا بە هەرحاڵ ئەو جۆرە بەناو تەفسیرانە كە لەلای ئەهلی خۆیان پێیان دەگوترێ: (تەئویل)، لە ڕاستیدا گۆڕین (تحریف)و لادان (إلحاد)ن‌و لە تەرازووی عەقڵ و شەرع دا كێشی چڵە پووشێكیان نیەو هیچ نین‌و هیچ زانایەكی ڕەسەنیش ئیعتیباری بۆ دانەناون‌و بە بەشێك لە كەلەپوور (تراث)ی ئیسلامیش حیساب نەكراون‌و بگرە زۆر لەو كەسانە كە ئەو جۆرە قسەو قاڵانەیان بووە هەر ئەهلی زەندەقەش بوون‌و فریان بەسەر مسوڵمانەتی یەوە نەبووە، بەڵام چونكە نەیانتوانیوە بەڕاشكاویی باسی بێدینی خۆیان بكەن‌و بڵاوی بكەنەوەو ڕەواجی پێ بدەن، هاتوون لەژێر پەردەی تەفسیری (باطني)و تەصەووفدا ئەو شتانەی خۆیانیان بڵاوكردۆتەوەو بانگەشەشیان بۆ كردوە! دیارە هەندێك لە زانایانیش ئەو شتانەیان بۆ پینەو پەڕۆكردوون، یەكێ لەوانە (سیوطي)یە كە كتێبێكی هەیە بە ناوی (تنبیه الغبي

---

(1) (یونس - 90).

في تَبْرِئَة ابن عربي)، هەروەها (عبدالوهّاب الشعراني) وە (إبن عابدين) خاوەنی کتێبی (الحاشية)ی ناودار لە مەزهەبی ئەبوو حەنیفەداو، ژمارەیەکی دیکەش! هەڵبەتە لە کتێبەکانی (إبن عربي)دا شتی باشیش هەیەو ڕەنگە هەندێك لەو زانایانە بەهۆی شتە باشەکانی یەوە ئەو هەڵوێستەیان وەرگرتبێ. هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: ئێمە دەربارەی (إبن عربي) هیچ ناڵێین و (توقُّف)ی تێدا دەکەین، یەکێ لەوانە مامۆستا مەلا سەعیدی نوڕسی یە - خوا لێی خۆش بێ - کە دەڵێ من پێم وایە (إبن عربي) پیاوێکی باشە، بەڵام کتێبەکانی بەکەڵکی خوێندنەوە نایەن، چونکە ڕەنگە هەندێك لەو شتانەی کە گوتوونی لە حاڵەتی (سُكْر)و نائاساییدا بووبێ، هەروەها (سيد أحمد السَّرهَنْدي) کە بە ئیمامی ڕەببانی بەناوبانگە، ئەویش بەرگری لێدەکات بەڵام دەڵێ: نابێ کتێبەکانی بخوێندرێنەوە، چونکە شتی بە ڕواڵەت کوفریان تێدایە! بەڵام (إبن تيمية) -ڕەحمەتی خوای لەسەربێ-، یەکسەر لە ڕیشەوە دەیبڕێ و ڕەفزی دەکات، بەندەش پێی وایە ـ بە پێی ئەو قسانەی کە لەو کتێبانەی دان کە ئاماژەم پێدان ـ ئەو کابرایە هەق‌و ناهەق‌و ئیسلام‌و کوفری تێکەڵ کردوەو دیارە کابراش تائێوارە باسی ئیمان و ئیسلام بکات، بەڵام کە ئێوارە کوفرێکی کرد، مانای وایە ڕیسەکەی بۆتە خوری‌و بۆتە سەپانی پووشێ!

## خاڵی سێیەم : تەئویل کردن لە نێوان زانایانی پێشین و پاشیندا

بەڕێزان!

هەندێك كەس پێیان وایە كە تەئویل كردن ـ بە مانای سێیەمی وشەكە وەك پێشتر، باسمان كرد ـ شتێكە تەنیا زانایانی پاشین (خَلَف) دایان هێناوە، وە پێیان وایە كە زانایانی پێشین ( سَلَف) هەرگیز سیفەتێك و ئایەتێك و ڕستەیەكیان (تأویل) نەكردووەو هیچ و شەیەك و هیچ (تعبیر)ێكیان لە مانا ڕواڵەتی یەكەی لا نەداوە بۆ مانا یەكی مەجازیی و پەنهان، بەڵكو پێیان وایە ئەوە بیدعەیەكەو زانایانی پاشین (خَلَف) دایانهێناوە!! بەڵام بە ڕاستی ئەوە وانیەو پێچەوانەی هەقەو پێچەوانەی واقیعە، بەڵكو زانایانی پێشین ( سَلَف) -ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ-، هەر لە هاوەڵان (أصحاب) هەتا شوێنكەوتووان و (تابعین) ئەوانەی دوای وانیش تەنانەت (إمام أحمد)و (إبن تیمیة)و (قرطبي)و (شوكاني)یش هەندێك جاران، هەندێك لە ڕستەو وشەكانی قورئانی بەڕێزو پڕ پیت و پیرۆزیان (تأویل) كردوە، وە هەندێك لە ناوو سیفەتەكانی خوا، كە خوای پەروەردگار بۆ خۆی بەكاری هێناون تەئویل كردووەو ئەوە شتێك نیە كە زانایانی پاشین (خَلَف) دایانهێنا بێت!. جا من لەوبارەوە چەند نموونەیەكتان بۆ دێنمەوە:

**وێنەی یەکەم:** ﴿وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾[1] مانا ڕواڵەتی یەکەی ئاوایە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوان، ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن، ڕووی خوا لەوێیە، بێگومان خوا فراوانی زانایە. بەڵام توێژەرەوانی قورئان ئاوا ئەم ڕستەیەیان (فأينما تولّوا فثمَّ وجْهَ الله) ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن، ڕووی خوا لەوێیە، تەفسیر کردوە:

( ﷺ ) (الطبـري) کە بە (إمام المفسِّرين) پێشـەوای توێژەرەوانی قورئان دادەنرێ، گوتوویەتی: (ومعنى الآية إذاً: ولِلّهِ مُلْكُ الخَلْق الذي بين المشرق والمغرب يتعبَّدهم بما شاء ويُحكمُ فيهم مايريد عليهم طاعته، فوَّلوا وجوهكم أيها المؤمنون نَحْوَ وجهي فأَيْنَ ما تولّوا وجوهكم فُهناك وجهي)[2] کە هەر بە مانای ڕواڵەتی خۆی هێناویەتی و دەڵێ: ئەو موڵکەی دەکەوێتە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوایە، خوای پەروەردگار بە هەر شێوەیەك لە طاعەتی خۆی کە لە سەری پێویست کردوون عەبدایەتی بە بەندەکانی خۆی دەکات، جا ئەی بڕوادارینە ڕوو بکەنە ڕووی من ئێوە لە هەر شوێنێك بن ڕووی من لەوێیە. ئاوا هەر لەسەر ڕواڵەتەکەی خۆی تەفسیری کردوە، پاشان گوتوویەتی: (ومُحْتَملَ، فأَيْنَما تولَوا من أرض الله فتكونوا بِها فَثَمَّ

---

[1] ( البقـرة – 115 ).

[2] تەفسیری (طبري)، بەرگی/1 ، لاپەڕە 704

قِبْلَةُ الله التي توجِّهون وجوهكم اليها)[تر] واتە: وە ئەوەش ڕێی تێدەچێ، کە ماناکەی بەم شێوەیە بێت: لە هەر شوێنێك لە زەوی خوابن و ڕوو لە هەر جێگایەك بکەن، ئەوە قیبلەی خوا لەوێیە کەواتە (وجه الله)ی بە (قبلة الله) مانا کردوە، کە بێگومان ئەوە (تأويل)ە، چونکە لە مانا ڕواڵەتی یەکەی ـ کە بریتیە لە ڕوو ـ لای داوە بۆ مانایەکی مەجازی کە بریتییە لە قیبلە، هەروەها گوتوویەتی: (وقال آخرون: ففي قول الله ـ عزّوجلّ ـ (فَثَمَّ وجْهُ الله) يعني: فثم الله تبارك وتعالى) واتە: وە هەندێکی دیکە گوتوویانە: خوای بەرزو مەزن کە فەرموویەتی: (فَثَمَّ وجْهُ الله) واتە: خوای پایە بەرز لەوێیە، کەواتە: لێرەشدا (وجْه)ی بە (ذات) تەفسیر کردوە، کە ئەوەش هەر جۆرێکە لە (تأويل)، ئینجا ڕایەکی دیکەش دێنێ و دەڵێ: (وقال آخرون: معنى قوله (فثم وجه الله) يعني: فثم تدركون بالتوجّه اليه رِضى الله الذي له الوجه الكريم)[یر] هەندێکی دیکەش گوتوویانە: مەبەست لە (فثم وجه الله) واتە: ئەگەر ڕووبکەنە هەر شوێنێك ڕەزامەندیی خوا لەوێیە، واتە (وجه الله)ی بە (رضى الله) لێکداوەتەوە کە ئەوەش هەر تەئویلە. دیارە (طبـري) هەر بۆ خۆی بە ڕای زۆربەی زانایان، دەکەوێتە بازنەی زانایانی پێشین (سلف)ەوە،

---

(تر) هەمان سەرچاوە، بەرگی/1 ، لاپەڕە 704

(یر) هەمان سەرچاوە، بەرگی/1، لاپەڕە 706

وە ئەگەر واش نەبێ، بێگومان یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێشین (سلف) وەك بینیشمان ڕاو بۆ چوونەکان هەموویان دێنێت، چ ئەوە کە (و جه الله) هەر بە مانای ڕوا ڵەتی خۆی بهێڵرێتەوە، وە چ بە قیبلە، یان بە زاتی خوا، یان بە ڕەزامەندیی خوا تەئویل بکرێ و ناشڵێ هیچ کام لەو ڕایانە هەرکە سێك بیڵێت گوناهەو گۆڕین (تحريف)ە! بۆچی؟ چونکە زمانی عەرەبی وەك چۆن بۆ وشەکان مانای ڕواڵەتی حەقیقی دادەنێ، بە هەمان شێوەش مانای پەنهان و مەجازیش دادەنێت، کەواتە دەگونجێ وشەکان بەو مانا مەجازییانەش بەکاربێن.

(●) (شوکاني)یش، کە بێگومان یەکێکە لەو زانایانەی بە دوای پێشینی صالح کەوتوە، ئەویش بە هەمان شێوە دەڵێ: (فأَيْنَما تولَوا وجوهكم فَثَّم وجْه الله، أي: ايَّ جهة تَسْتَقْبِلونَها فَهُناك وجْه الله، أي: المكانُ الذي يَرتَضي فيكم إسْتِقْبالُه)(تر) واتە: مەبەست لە (فأين ما تولّوا وجوهكم فثم وجه الله) ئەوەیە کە: ڕوو لە هەر شوێنێك بکەن ئەوە ڕووی خوا لەوێیە، واتە: ئەو شوێنەی کە خوا ڕازی یە ڕووی تێبکەن لەوێیە ـ کە قیبلەکەیەتی ـ هەروەها (شوکاني) لە (أبن أبي حاتم)ەوە هێناویەتی کە (ابن عباس) -ڕەزای خوا یان لە سەر

---

(تر) تەفسیری (فتح القدير)، بەرگی /1، لاپـەڕە 178..

بێت- فەرموویەتی (فَثَمَّ وجْهُ الله، قال: قبلة الله شرقاً وَغَرْ باً)(تر)
واتە: قیبلەی خوا بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

(ﷺ) (قرطبي)یش (وجه الله) بە لا (جهة) وە بە ڕوو گە (قبلة) لێکدەداتەوەو (تأویل) دەکات، وە بە: ڕەزامەندیی و پادا شتی خوا (رِضى الله وثوابه)ش (تأویل)ی دەکات(یر).

(ﷺ) (إبن کثیر)یش بە هەمان شێوە (وجه الله) بە ڕووگە (قبلة)و بە لا (جهة) تەفسیر دەکات(سە).

(ﷺ) (إبن تیمیة) لە (مجموعة الفتاوى)دا دە ڵێ: (قال مجاهد والشافعي: یعني: قبلة الله، فقلت: نعم هذا صحیح عن مجاهد والشافعي وغیرهما، وهذا حق، ولیست هذه الآیة من أیات الصِّفات، ومن عدَّها من الصِّفات فَقَد غَلَطَ)(□)، واتە بەڵێ، ڕاستە (مجاهد)و (شافعي)و زانایانی دیکەش گوتوویانە (فثم وجه الله) واتە ڕووگەی خوا لەوێیە، (فثم قبلة الله)، بەڵێ ئەوە ڕاستە کە ئاوایان تەفسیر کردوە، بەڵام ئەم ئایەتە لە ڕیزی ئایەتەکانی سیفەتەکاندا نییەو - هەرکەسێکیش وای گوتبێت هەڵەی کردوە.

---

(تر) (فتح القدیر)، بەرگی/1، لاپەڕە 180.

(یر) الجامع لأحکام القرآن، بەرگی /1، لاپەڕە (64،65).

(سە) مختصر تفسیر أبن کثیر، بەرگی/1، لاپەڕە (113 , 114).

(□) (مجموعة الفتاوى)، بەرگی/3، لاپەڕە (193).

( رحمهم الله ) بەلاَم (إبن القيِّم) ڕایەکەی (إبن تيمية) بەهەڵە دەزانێ و دەڵێ: (إنَّه لايُعْرَف إطْلاقُ وجْهِ الله علی القِبْلة لُغةً ولا شرعاً و لاعُرْفاً)[٣٢] واتە: نەخێر، (وَجْهُ الله) هەر مەبەست پێی ڕووی خوایە، چونکە (وجه الله) بە (قِبْلة) نەگوتراوە، نە لە زمانداو نە لە شەرعداو نە لە عورفدا. کەواتە وەك بینیمان زانایان بە پێشین (سلف)و بە پاشین (خلف)ێکی کە بە دوای ئەو پێشینە کەوتوون، هەندێك جار هەندێك شتیان (تأویل) کردوەو چاری وایە لە سەر (تأویل)ەکەش ڕێك نەکەوتوون!.

**(وێنەی دووەم):** ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[٣٣] مانا ڕواڵەتی یەکەی ئاوایە: خوا لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن، وە خوا بەوەی دەیکەن بینایە.

( رحمه الله ) (طبري) دەڵێ: (يقول: وهو شاهِدٌ لكم أيها الناس أينما كنتم يَعْلمكُمْ وَ يَعْلَم أعمالكم وَ مُتَقَلّبكم وَ مَثواكُمْ وهو على عَرْشِه فوق سَمواته السَّبع)[٣٤] واتە: دەفەرموێ: خوا دەتانبینێ لە هەر شوێنێك بن، دەتانزانێ و کردەوەکانیش شتان دەزانێ، وە هەڵسوکەوتیش شتان دەبینێ و دەزانێ، لە کاتێکیشدا بۆ خۆی لەسەر عەرشی خۆیەتی لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانی یەوەیە!. کەواتە (طبري) خوا

(٣٢) ( مختصر الصواعق المراسلة ) ، لاپەڕە / (354).

(٣٣) ( الحديد 4 ).

(٣٤) (جامع البيان) ، بەرگی / 13 ، لاپەڕە / (282).

لەگەڵتانە (وهو معكم)ی بەوە تەفسیر کردوە، کە خوا دەزانێ و دەتانبینێ، دیارە ئەوەش (تأویل)ە، ئەگەرنا خوا فەرموویەتی: خوا لەگەڵتانە، بەڵام (طبري)و زانایانی دی گوتوویانە: لەگەڵتانە، نەك بە زاتی خۆی، بەڵکو بۆ خۆی هەر لە سەر عەرشە وەك زات، بەڵام بە سیفەتی زانیاری و ئاگاداری و دیتن لەگەڵتانە.

(ﷺ) (شوكاني)یش دەڵێ (وهو معكم اينما كنتم، أي بُقْدَرتِهِ و سُلْطانِهِ وعِلمْه وهذا تَمْثيلٌ للأحاطة بما يَصْدُرُ مِنْهُم أَيْنُ ما داروُا في الأرض مِنْ بَرّ وَ بَحْرٍ)[تر] واتە: ((ئەو ـ خوا ـ لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن)) یانی: بە تواناو دەستەڵات و زانیارییەکەی، وە ئەمە وێنە هێنانەوەیە بۆ ئەوە کە دەوری کردارو جموجۆڵەکانیانی داوەو لە هەرجێیەك لە زەویدا بگەڕێن لە وشکانیی و دەریادا.

(ﷺ) (قرطبي)یش دەڵێ: (وهو معكم أين ما كنتم، أي بقدرتەو سلطانەو علمه وقَدْ جَمَع في هذه الآية بين (استوى على العرش) وبين (وهو معكم) والأخذ بالظّاهر تَناقُضٌ، فَدَلّ على أنَّه لا بُدَّ مِنَ التأويل، والأعْراضُ عَنِ التأويل إعترافٌ بالتّناقُضِ)[یر] ئەویش دیارە هەروەك (شوكاني) تەفسیری دەكات، دوایی دەڵێ: خوا (عزو جلّ) لێرەدا دوو شتی پێکەوە هێناون کە بریتین لە: (استوى على

(تر) (فتح القدير)، بەرگی/ 5، لاپەڕە: (204).

(یر) (الجامع لأحكام القرآن)، بەرگی / 9، لاپەڕە: (174).

العرش) لەگەڵ (وهو معكم أينما كنتم) جا دەڵێ: ئەو دوو ڕستەیە مانا ڕواڵەتییەکەیان پێکەوە دژە، (واتە ئەگەر خوا لەسەر عەرش بێت، نابێ لێرە بێت و لەگەڵ ئێمە بێت لە هەر شوێنێك بین) جا ئەگەر تەئویلی نەکەین دەبێ بە دژا یەتی و ناکۆکی دابنێ یىن، (واتە: دەبێ بڵێین: کتێبی خوا هەندێکی لەگەڵ هەندێکیدا ناکۆك و پێکەوە دژە!!). بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی قسەکانی (قرطبي) دە ڵێم: لەم ئایەتەدا خوای کاربەجێ دوو مەسەلەی پێکەوە کۆکردوونەوە کە بە ڕواڵەت پێکەوە دژو ناکۆکن، یەکیان: (ثم استوى على العرش)و ئەوی دیکەیان (وهو معكم أينما كنتم) بۆیەش دەڵێ یىن: ئەم دووانە پێکەوە دژو ناکۆکن چونکە (لەسەر عەرش بوونی خوا) (سبحانه و تعالى) لەگەڵ (لەگەڵ ئێمە بوونی خوا)و ئامادەبوونی لەگەڵمان لە هەر شوێنێك بین ناگونجێ پێ کەوە کۆبنەوەو ئەگەر لەسەر عەرش بێ ناکرێ لەسەر زەوی لەگەڵ ئێ مە بێت و ئەگەر لەگەڵ ئێمەش بێت ناکرێ لەسەر عەرش بێت! کەواتە بۆ ئەوەی ئەو ناکۆکی و پێکەوە دژبوونە ڕواڵەتییە چارە سەر بکەین، نا چارین یەکێك لەو دووانە (ثم استوى على العرش)، (وهو مع كم أين ما كنتم) بە جۆرێکی دیکە مانا بکەین، واتە بە غەیری مانا ڕواڵەتی یەکەی، کە ئەوەش لە زاراوی زانایان دا، پێی دە گوترێ (تأويل)، ئنجا کاتێك سەرنج دەدەینە ئەو دوو ڕستە قورئانی یە بۆ مان

دەردەكەوێ كە (لە سەر عەرش بوونی خوا) هیچ گرفتو ئیشكالێكی نیەو، بێجگە لەوەش لە شەش شوێنی دیكەی قورئانیشدا هاتووەو ئەوەش نیشانەی گرینگی پێدران و جەخت لەسەر كرانە، بەڵام: (لەسەر زەوی بوونو لەگەڵ ئێمە بوونی خوا) گرفتی گەورەمان بۆ دروست دەكات ـ ئەگەر هەروا بە ڕواڵەتەكەی وەری بگرین ـ لە زۆر ڕووەوە، بۆیە ناچارین تەئویلی بكەین و بڵێین: مەبەست لەو ڕستەیە مانایەكی دیكەی پەنهانە، وەك: خوا ئاگای لێتانە، یان: هەر لەژێر ركێفی دەسەڵاتی ویدان ... كە ئەوكاتە هیچ تێكگیرانێك لە نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا نابێ: خوا لە سەر عەرشی خۆیەتی و ئاگاداری بەندەكانیشیەتی لە هەر جێیەك بن.

(4) (قاسمي)یش، كە یەكێكە لە توێژەرەوە گەورەكانی قورئان و پابەندە بە ڕێبازی پێشینەی پاك (السّلف الصالح)ەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتە (وهو معكم أینما كنتم)دا گوتوویەتی: (( قال شیخ الأسلام (أبن تیمیة)، لَفْظُ المعیّة في سورة (الحدید)و (المجادلة) في آیَتَیْهما ثبت تفسیره عن السّلف بالعلم، قالوا: وهو معهم بِعلمه، وقد ذكر (الأمام أبن عبدالبَرّ) وغیره أن هذا إجماع من الصَّحابة (رضي الله عنهم) والتابعین لهم باحسان، ولم یُخالِفهْم أحد یُعْتَدُّ بِقَولِهِ، وهو مأثور عن أبن عباس، والضحاك، ومقاتل بن حیان، وسفیان الثوري،

واحمد بن حنبل و غيرهم)[تر] واتە: (شيخ الأسلام أبن تيميـــــــــة) -(ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ)، گوتوویەتی: تەفسیری لەگەڵ بوونی خوای پەروەردگار بۆ ئەم ئایەتەی سووڕەتی (الحديد)و ئایەتە کەی سووڕەتی (المجادلة) ـ کە بریتییە لە ﴿إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا﴾[یر]- ئیسپات بووە کە زانایانی پێشین بە (زانیاری) تەفسیریان کردوە، واتە: خوا بە زانیاری خۆی لە گەڵتان دا یە. وە (أبن عبدالبَرّ)و غەیری ویش گوتوویانە: ئەمە یەك دەنگی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی بە چاکی شوێنیان کەوتوون، لەسەری دامەزراوە، وە هیچ کەس پێچەوانەی ئەوە قسەی نەکردوە، وە ئەوە لە (إبن عباس)یشەوە گێردراوەتەوە هەروەها لە ( ضحّاك)و (مقاتل بن حيان)و (سُفيان الثوري)و (أحمد بن حنبل)و غەیری ئەوانیش.

(5) (سيد قطب)یش ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ، ئەو ئایەتە ئاوا تەفسیرو (تأويل) دەکات، دوای چەند قسەیەك دەڵێ: (و هي كلمة على الحقيقة لا على الكِناية و المَجاز، الله سبحانه مَعَ كلِّ أحدٍ، مَعَ كّلِ شيء، في كلِّ وقتٍ، وفي كل مكانٍ، مُطَّلِعٌ على ما يَعْمَل، بَصيرٌ بالعِباد)[سم] واتە: (وهو معكم أينما كنتم)، ئەمە و شەیەکە بە

---

(تر) (محاسن التأويل)، بەرگی/ 16، لاپەڕە (33).

(یر) ( المجادلة – 7 ).

(سم) (في ظلال القرآن)، بەرگی / 6، لاپەڕە (3481).

حەقیقەت، نەك بە كینایەو بە مەجاز، خوای پاك و بێگەرد، لەگەڵ هەر كەسێكەو لەگەڵ هەر شتێكە، لە هەر كاتێكداو لە هەر شوێنێكدا (بەڵام نەك بە زاتی خۆی بەڵكو) دەزانێ چی دەكەن و دەیانبینێ چی دەكەن. مانای وایە، ئەمیش هەر وەك ئەوانی دیكە (تأويل)ی كردوە.

(**وێنەی سێیەم**): ئایەتی ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(1) مانای ڕواڵەتی ئەم ئایەتە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ واتە: (وما عظَّموا الله حَقَّ عَظَمته) خوایان بە بەرز ومەزن نەگرتوە، وەك بۆ خوا شایستەیە، كێ؟! دیارە كافرو بێبڕوا كان، ﴿وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لە حاڵێكدا لە ڕۆژی دواییدا هەموو زەوی لە چەنگ (مشت) دە گرێ، ﴿وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾ ئاسمانەكانیش پێچراوەن بە دەستی ڕاستی‌یەوە، یان لە بن قۆڵی ڕاستی‌دا، ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پاكی و بەرزیی بۆ خوا لەوەی كە ئەوان دەیكەن بە هاوبەش بۆ خوا، ئینجا با بزانین توێژەرەوانی قورئان چۆن ئەم ئایەتەیان لێكداوەتەوەو تەفسیر كردوە:

(1) (طبري) هەر لەسەر ڕواڵەتی خۆی مانای ئایەتەكە دێنێت، بەڵام ڕاو بۆچوونەكانی دیكەش دێنێت، سەرەتا لە سەر ڕواڵەتی خۆی

(1) (الزمر - 67).

مانای دەكاتو دەڵێ: خوای پەروەردگار زەوی لە مستە دەگرێ ئاسمانەكانیش دەپێچێتەوەو بە دەستی ڕاستی دەیانگرێ، بەو شێوەی كە لە خوا دەوەشێتەوەو بۆ خوا شایستەیە. پاشان چەند فەرموودەیەك لەو بارەوە دێنێتەوە، كە یەكێك لە فەرموودەكان ئەمەیە: (عن عبدالله أبن مسعود قال: كنّا عند رسول ﷺ حين جاءَه حَبْرٌ مِنْ أحْبار اليهود، فجلس اليه، فقال له النبي ﷺ حَدِّثْنا، قال: انَّ الله تبارك و تعالى اذا كان يوم القيامة جعل السموات على أُصْبُعٍ، والأرضين على أُصْبُعٍ، والجبال على أُصْبُعٍ، والماء والشّجر على أُصْبُعٍ وجميع الخلائق على أُصْبُعٍ، ثم يَهُزُّهُنَّ، ثم يقول: أنا المَلِكُ، قال: فَضَحِكَ رسول الله ﷺ حتّى بَدَتْ نوا جِذُه، تَصْديقاً لما قال، ثم قرأ هذه الآية: وما قَدَرُوا الله حقَّ قَدْره..... الخ)[(تر)]

واتە: (عبداللّه ی كوڕی مسعود) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، یەكێك لە زانایانی جوولەكە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشت، پێغەمبەر پێی فەرموو قسەمان بۆ بكەو شتێكمان بۆ باس بكە، زانا جوولەكەكەش گوتی: خوای بەرزو پایە بڵند، لە ڕۆژی دواییدا، ئاسمانەكان لە سەر پەنجە یەكی دادەنێو زەوییەكان لەسەر پەنجەیەكی دادەنێو چیاكان لە سەر پەنجە یەكی دادەنێو ئاوو دارو درەختیش لەسەر پەنجە یەكی دادەنێو هەموو

(تر) ( رواه البخاري ) .

دروستکراوەکانیش بە گشتی لەسەر پەنجەیەکی دادەنێ، پاشان ڕایان دەوەشێنێو دەفەرموێ: منم دەستەڵاتدارو دەڵێ پێغەمبەر ﷺ یش پێکەنی هەتاکو ددانەکانی دەر کەوتن، (واتە: بە پێ کەنینی پشتگیریکردن پێکەنی و قسەکەی ئەوەی بە ڕاست دانا)، ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وما قدروا الله حق قَدْره....). بەڵام دوای ئەوە (طبري) دەڵێ: (وقال بعض أهل العربيّة مِنْ أهْل البصرة: (والأرض جميعاً قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه) يقولون: أي: قدرته، نحوقوله: (وما ملكت أيمانكم) أي: ما كان لكم عليه قدرة، ولَيْس المُلْكُ لليمين دون سائر الجسد، وقوله (قَبْضَتُه) نحو قولِكَ للرّجل: هذا في يدك وفي قبضتك، والأخبار التي ذكرناها عن رسول الله ﷺ وعن أصحابه وغيرهم تشهد على بُطُولِ هذا القول)[ت] واتە: وە هەندێك لەوانەی شارەزای زمانی عەرەبی هەن لە خەڵكی (بصرة) گوتوویانە: كە دەفەرموێ: (والأرض جميعاً قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه) دەڵێن: واتە: هەموو زەوی لەژێر دەستەڵاتی خوا دایە، وە دەڵێن: ئەوەش وەك ئەوە وایە كە كاتێك باسی كۆیلەو كە نیزەك دەكات، بە (مُلْكُ اليمين) ناو یان دەبات‌و دەفەرموێ: (أو ما ملكت أيمانكم) ئەوانەی موڵكی دەستی ڕاستتانن واتە: ئەوانەی لە ژێر دەستەڵاتتان دان، چونكە ئەو موڵكە

(ت) (جامع البيـان). بەرگی/ 12 ، لاپەڕە (34 ، 36).

كە بریتیە لە كۆیلەو كەنیزەك (مەرج نیە هەمیشە بە دەستی ڕاستیانەوە بێت و) بە تەنیا هی دەستی ڕاست نین، بەڵكو هی هەموو جەستەن، وە فەرمایشتی خوا: (قبضته) لە مستی گرتوە، ئەوەش وەك ئەوە وایە، كە تۆ بە كەسێك دەڵێی: ئەو شتە لە دەستی تۆ دایە، واتە لە ژێر ڕكێف و دەستەڵاتی تۆدایە (نەك لە چەنگی گرتبێ)!. دوایی (طبـري) دەڵێ: بەڵام ئەو هەواڵ و فەرموودانەی كە لە پێغەمبەر ﷺ و لە هاوەڵە بەڕێزەكانیەوەو لە غەیری ئەوانیش، هێنامانن بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە ئەم قسەیەی دوایی هەڵەیە. جا لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە (طـبـري) هەر چەندە ڕایەكەی دیكە بەهەڵە دەزانێ بەڵام زۆر بە جوانی دەیهێنێ و ڕوونی دەكاتەوە، نەك هەر لە ڕێ وە ژێر لێوی بخات! ئنجا دیارە ئەوانی دیكەش كە پشتگیریی تەئویل كردن دەكەن دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ كە تەصدیقو پشتگیریی زانایە جوولەكەكەی كردوە لەو ڕووەوە بووە كە ئەو قسەیە[تر] پێ شاندانی قودرەت و دەستەڵاتی خوای پەروەردگارەو شێوە دەربڕینێكە لەگەڵ عەقڵی مرۆڤـدا دەگونجێ و ڕواڵەتەكەی مەبەست نیە.

(2) (شوكاني) دەڵێ: (القبضة في اللغة ما قَبَضْتَ عليه بِجميع كفِّك، فَأَخْبر سبحانه عَنْ عِظَمِ قُدرَتِهِ بأَنَّ الأرض كُلَّها معَ عِظَمِها وكَثافتها

(تر) واتە: ئەو قسەیەی باسی لەسەر پەنجەدانانی خوا دەكات بۆ دروستكراوەكانی.

في مقدوره كالشيء الذي يَقْبِضُ عليه القابِضْ بِكفِّه كما يقولون: هو في يَدِ فُلانٍ و في قَبْضَتهِ للشَّيء الذي يَهُون عليه التصُّرف فيه وإنْ لَمْ يَقْبِضْ عليه) واتە: (قبضة) لە زمانی عەرەبیدا، ئەوەیە کە بە لەپە دەستی خۆت‌و بە پەنجەکانت بیی گری، جا خوای پاك دەر بارەی گەورەیی دەستەڵات‌و توانای خۆی دەفەرموێ: کە زەوی لە گەڵ ئەو هەموو زەبەلاحییەی‌و ئەو هەموو چـــڕیی‌و پڕیی‌یەی، لە دەستەڵاتی خوادا، وەك ئەوە وایە کە یەکێکتان شتێك لە مە شت دە گرێ، وەك چۆن کەسێك شتێکی بچووکی بە دەستەوەیە چەند ئاسانە هەر چی پێ‌ی بکات، زەویش بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵداکردن لە لایەن خواوە، هەر بەو شێوەیەیە، دوایی دەڵێ: ((وكذا قولُهُ: (والسموات مَطْوِيّاتَ بيمينه)، فأنَّ ذِكْر اليمين لِلمُبالَغة في ك مال ال قدرة، ك ما يَ طْوي الواحِدُ مِنّا الشيء المَقْدُور له طَيَّهُ بِيَمينه، واليَمينُ في كلام ال عَرَب، قد تكون بِمَعْنى القُدرة والمُلْك، قال الأخْفَشُ: بيمينه يقول في قدرته، نَحْوَ قَوْلِه: (أو ما مَلَكَتْ أيْمانُكُمْ) أيْ ما كانَتْ لكم قَدْرةً عل يه وليس المُلْكُ لليمين دون الشِّمالِ وسائر الجَسَد))[٣] واتە: ئەوەش کە دە فەرموێ (ال سموات مطو يات بيمي نه) بە هەمان شێوەیەو باسکردنی دەستی ڕاست (یمین) لێرەدا بۆ داکۆکی کردنە لەوەی کە خوا تەواوی دەستەڵاتی هەیە، وەك چۆن یەکێك لە ئێ مە ئە گەر

(٣) تفسير (فتح القدير). بەرگی/ 4 ، لاپەڕە (571).

دەستەڵاتی بەسەر شتێكدا هەبێت دەیپێچێتەوە بە دەستی ڕاست، وە دەستی ڕاست (یمین) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای دەستەڵات و بە مانای خاوەنداریێتی دێ، (ئەخفەش) ـ كە یەكێكە لە زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێ: (بیمینە) واتە: (في قدرتە) لەژێر دەستەڵاتی خۆیدا وەك چۆن فەرموویەتی: (أو ما ملكت أیمانكم) واتە: ئەو كۆیلەو كەنیزەكانەی دەستەڵاتتان بە سەریاندا هەیەو لەژێر ڕكێفی ئێوەدان، ئەگەرنا خۆ هەر هی دەستی ڕاست نین جیا لە چەپ و تێكڕای جەستە!

(3) (قرطبـــي)یش، هەرچەندە چەند دەق (نص)ێك دێنێت، كە بە پێی ڕواڵەتی تەفسیری بكات و (تأویل)ی نەكات، یەكێك لەو فەرموودانە ئەوەیە: (عن أبي هریرة رضی الله عنه، قال: قال: رسول الله ﷺ یَقبِضِ اللهُ الأرضَ یوم القیامة و یَطوي السماءَ بیمینه ثم یقول: أنا المَلِك أینَ مُلوكُ الأرضِ؟!)(تر)، واتە (أبو هریرة) - خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا (جل جلالە) لە ڕۆژی دواییدا زەوی بە مستەوە دەگرێت، وە ئاسمانەكانیش دەپێچێتەوە بە دەستی ڕاستیەوە، پاشان دە فەرموێ: من دەستەڵاتدرام كوان دەستەڵاتدارەكانی زەوی؟! بەڵێ (قرطبـــي) ئەوە دێنێت، بەڵام دوایی هەم ئایەتەكەو هەم فەرموودەكانیش

(تر) (متفق علـیە).

(تأویل) دەکات، وە وەك (شوكاني) و شەی (قبضة)و و شەی (مطويات بيمينه) تەفسیر دەكات[تر] .

(4) (سيد قطب)یش، بەهەمان شێوە، وەك (شوكاني)و (قرطبي) ئەو ئایەتە (تأویل) دەكات و دەڵێ: (وكلُّ ما يَردُ في القرآن و في الحديث من هذه الصور و المشاهد إنما هو تقريبٌ للحقائق التي لا يملكُ البَشرُ إدراكَها بغير أن تُوضَعَ لَهُ في تَعبيرٍ يُدركونه، وفي صورة يَتصوَّرونَها، ومنهُ هذا التصوير لجانب من حَقيقةِ القُدرةِ المُطلقة التي لا تَتَقَيَّدُ بشكل ولا تَتَحيَّزُ في حَيِّزٍ ولا تتحدَّد بحُدودٍ)[یر] واتە: هەموو ئەو دیمەن و تابلۆیانەی کە لە قورئان و لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ بەو شێوەیە دێن، هەموو بریتییە لە نزیك خستنەوەی حەقیقەتەکان بۆ عەقڵی ئینسان لە قاڵبو دیمەنێکدا کە عەقڵ و خەیاڵی ئینسان بتوانێ تێی بگات وە لە وێنەیەکدا کە بتوانن بیهێننە بەر خەیاڵی خۆیان، ئنجا دەڵێ: ئەمەش وێنەو دیمەن پێشاندانێکە بۆ لایەنێك لە حەقیقەتی دەستەڵاتی بێسنووری خوا، کە بە هیچ شێوەیەکەوە بەند نیە، وە لە هیچ چوار چێوەیەکدا جێگای نابێتەوەو لە هیچ سنوورێك سنووردار ناکرێت، واتە نابێ وا بزانی کە خوای پەروەردگار ئەگەر بیەوێ شتێك بکات، حەتمەن دەبێ

(تر) تفسیری (قرطبي): بەرگی/ 8 ، لاپەڕە (202 ، 203).

(یر) (في ظلال القرآن): بەرگی /5 ، لاپەڕە (3062).

بە دەستی ڕاستی بیکات و لە چەنگی بگرێت، بۆچی؟! چونکە ئەدی ئەوە نیە خوای زاڵ و کاربەجێ خۆی دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾[1] واتە: بێگومان فەرمانی خوا هەرکات ویستی شتێك بکات، بەس پێی بفەرمووێ ببە یەکسەر دەبێت. کەواتە ئەو جۆرە دەربرینانە وەك (سیِّد قطب) گوتوویەتی هەمووی پێشاندان و خستنە ڕووی گەورەیی و دەستەلاّت و بەرزیی خوای بێوێنەیەو نزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، ئەگەرنا خوای تاك و پاك پێویستی بەوە نیە کە زەوی و ئاسمان بە دەستی ڕاستییەوە بگرێ، ئنجا ئەو چەنگ و دەستە ڕاستە، ئەگەر گریمان تەئویلی شی نەکەین هەر دەبێ بڵێین: بەو شێوەیە کە لە خوا دەوەشێتەوە، چونکە ئەگەر بڵێین: وەك هی ئێمەیە، ئەوە بێگومان جەستاندن (تجسیم)ی خوایە کە دیارە ئەویش حەرامەو بگرە کوفریشە، چونکە یەکسەر لەگەڵ فەرمایشتی ڕاستی خوا، (ليس كمثله شيء)دا تێك دەگیرێ .

**(وێنەی چوارەم)** ئەم ئایەتە: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَا الثَّقَلانِ﴾[2]، ئەم ئایەتە بەپێزە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سیاقەی تێیدا هاتوە، مانا ڕوالەتییەکەی ئاوایە: ئەی کۆمەڵی مرۆڤ و جندا! لە مەودوا دە ستی

(1) ( یس – 82 ) .
(2) ( الرحمـن – 31 ).

خۆمتان بۆ خاڵی دەکەم! یان لەمەودوا خۆمتان بۆ یەکلادەکەمەوە یان: لەمەودوا (کە مەبەست ڕۆژی دوایی‌و کاتی لێپرسینەوەیە) هەموو ئیشێك واز لــێدەهێنم بۆ لێپرسینەوەی ئێوەو هیچ ئیشێك ناکەم تەنیا خەریکی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی ئێوە دەبم.

(1) (طبـري) دەڵــێ: ﴿سَنَفْرُغ لكم، أي: سَنُحاسِبكم وَ نأْخُذُ في أمركم أيها الجِنُّ والأنس، عن أبن عباس قال: وعيدُ مِنَ الله لِلعباد، وَ ليْسَ بالله شُغْلٌ وهو فارِغٌ﴾[تر]، واتە (سنفرغ لكم) واتە: لێتان دەپێچینەوە، وە ئەی جندو مرۆڤ دەست دەکەم بە لێپێچانەوەو لێپرسینەوەی ئێوە، (عبدالله ی کوڕی عەبباس) گوتوویەتی: ئەم ئایەتە هەڕەشەیە لە خواوە بۆ بەندەکانی، ئەگەرنا خوا بە هیچ شتێکەوە سەرقاڵ نیەو دەستی بە هیچ شتێکەوە نەگیراوە (تاکو دەستی بەتاڵ بکات بۆ لێپرسینەوەی بەندەکانی، چونکە ئەوە لە خوا ناوەشێتەوە). بەڵێ خوا ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾[یر]، هەمیشە خەریکی سەرپەرشتی کردنە، بەڵام وانیە کە بڵێی لەبەر شتێکی دی نای پەرژێتە سەر شتێکی دی، بڵێی جارێ خەریکی کارێکە با لــێ ببێتەوەو تەواوی بکات، ئنجا دەست بەوەی دی بکات!، نەخێر وانیە، چونکە خوای پەروەردگار: (لايَشْغُلُه شَأنَ عن شَأنِ)

(تر) تفسير (جامع البيان) بەرگی/ 13، لاپەڕە (177).
(یر) (الرحمــن - 29).

هیچ ئیشێك بێ ئاگای ناكات لە ئیشێكی دیكە، بەڵكو لە یەك كاتو ساتدا هەموو كارێك كە پێویست بە كات دەیكاتو هێزو توانای خوا بێ سنوورەو زانیاری و ویستی خوا بێ سنوورە. كەوا تە ڕواڵەتی ئەم ئایەتە لەگەڵ خوای بەرزو بێوێنەدا ناگونجێ و دەبێ تەئویلی بكەین، بەڵێ ڕستەی: (سَنَفرُغ لكم) واتە: (سَنَتفَرغُ لكم) لەمەودوا دەستی خۆمتان بۆ خاڵی دەكەمەوەو ئیشەكان هەموویان واز لێدەهێنم و خەریكی ئیشی ئێوە دەبم، ئا ئەم مانا ڕواڵەتە لەگەڵ خوای پاكو تاكدا ناگونجێ، بۆیە دەبێ بڵێین: مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە كە: ئەی مرۆڤ و جنۆكە! بە دڵنیاییەوە لێتان دەپرسمەوەو دەپێچمەوە، (ولله المثل الأعلى) وەك كەسێك كە وازی لە هەموو ئیشێك هێنابێت بۆ تەنیا ئیشێك، كە دیارە كارەكەی زۆر بە گرنگ دەزانێ و بە جیددی گرتوە!

(2) (قرطبـي)یش ئاوای تەفسیر دەكات و دەڵێ: ((والله تعالى ليس له شُغْلٌ يَفْرُغُ منه، انّما المَعْنى: سَنَقْصُدُ لِمجازاتِكم أو مُحَاسبَتكم، وهذا وعيدٌ و تهديدٌ لهم، كما يقول القائل لِمَنْ يريدُ تهديده: إذاً أتَفَرَّغُ لَكَ ))(ت)، واتە: خوای بەرز هیچ ئیشێكی نیە كە تەواوی بكات، ئنجا دوای ئەوە دەست بەئیشێكی دی بكات، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە بە تایبەتی لێتان دەپرسینەوەو سزاو پاداشتتان

(ت) تفسیری (القرطبي) بەرگی / 9 ، لاپەڕە (124).

دەدەینەوە، ئەوەش هەڕەشەیەو ترساندنە لە خواوە، وەك كە یەكێك بە یەكێكی دیكە دەڵێ: دوایی خۆمت بۆ یەكلایی دەكەمەوە، واتە واز لە هەموو ئیشێك دەهێنم و خۆمت بۆ تەنها دەكەمەوە، تاكو باش بتوانم پێت ڕابگەم!

(3) (شوكاني)یش، هەر بە هەمان شێوە تەفسیری كردوە(تز).

(وێنەی پێنجەم) ئەم دوو ئایەتە: كە خوا فەرموویەتی: ﴿وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ. تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ﴾(تر). ماناى ڕواڵەتىيەكەی ئاوایە، واتە: ئێمە (نوح)مان هەڵگرت (علیه الصلاة و السلام) لەسەر شتێك كە خاوەنی تەختەو بزماران بوو، (ألواح) كۆی (لَوْح)ە كە تەختەیە وە (دُسُر) كۆی (دَسْر)ە واتە: بزمار، هەڵبەتە مەبەست كەشتىيە كە لە تەختەدارو بزمار دروستكرا بوو، ئنجا دەفەرموێ: ﴿تجري بأعيننا جزاءً لِمَنْ كان كُفِرَ﴾ واتە: ئەو كەشتىيە بە چاوەكانی ئێمە دەڕۆیشت، ئەوەش پاداشتی كەسێك بوو كە سپڵەیی لەگەڵ كرابوو، (چونكە (نوح)و سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، گەورەترین نیعمەتی خوان بۆ بەشەرو دەبوایە سوپاس بكرێن، بەڵام (نووح) لە لایەن گەلەكەیەوە سپڵەیی و بێئەمەكیو بێوەفایی بەرانبەر كرا)0

(تز) (فتح القدير)، بەرگی/ 5، لاپەڕە (166).

(یر) (القمـر - 13، 14).

(1) (طبــري) ئاوا تەفسیری دەكات، دەڵێ: ((تجري بأعيننا، يقول (جلَّ ثناءُه) تجري السَّفينة الـتي حَمَلْنا نوحاً فيها، بمرأىً منّا وَ منْظَرٍ))[تر]، واتە: ئەو كەشتی یەی كە (نووح)مان تێدا هەڵگرتبوو لەژێر چاودێری و دیتنی ئێمەدا دەڕۆیشت، كەواتە: (طبـري) ئەم ڕستە قورئانییەی (تجري بأعيننا) تەئویل دەكات، چونكە با سی چاوەكان (بأعيننا) ناكات! بەڵكو وشەی (بأعيُننا) بەوە تەفسیر دەكات كە دەڵێ لەژێر چاودێریی و ئاگا لێبوونی ئێمەدا دەڕۆیشت.

(2) (قاسمي)یش، بەم شێوەیە تەفسیری دەكاتو دەڵێ: ﴿تجري بأعيننا، أي: بِمَرْأى مِنّا، كِنايةَ عن حِفْظها بِحِفْظِهِ تعالى و عِنايَتهِ﴾[یر]، واتە لەژێر چاودێری ئێمەدا دەڕۆیشت، ئەمە كینایەیە لەوەی كە خوا دەیپاراست بە پاراستنی خۆیو چاودێری دەكردو ئاگای لـێی هەبوو.

(3) (شوكاني)یش، هەر بە هەمان شێوە تەفسیری كردوە[سهم].

(4) (ابن كثيـر)یش، ئاوای تەفسیر دەكات و دەڵێ: ((تجري بأعيننا، أي بأمرنا بِمرأى مِنّا، و تَحْت حِفْظِنا و كَلائَتنا))[□]، دیارە ئەویش بە هەمان شێوە وەك ئەوانی دیكە تەفسیری دەكات.

---

(تر) جامع البيان: بەرگی / 13 ، لاپەڕە (125).

(یر) محاســن التأويل: بەرگی/ 5 ، لاپەڕە (267).

(سهم) (فتح القدير) ، بەرگی / 5 ، لاپەڕە (150).

(ثهم) مختصر تفسير أبن كثير للصابوني، بەرگی/ 3 ، لاپەڕە (430).

دیارە ئایەتەکانی دیکەش کە باسی ئەو جۆرە سیفەتانەی خوای پەروەردگار دەکەن، بە هەمان شێوە توێژەروانی قورئان چ لەو قسانەی کە لە هاوەڵان (أصحاب)و زانایانی پێشین و (تابعين)ەوە نەقڵ دەکەن، وە چ لەوانەی دوای ئەوانیش، بەم شێوەیەی خستمانە ڕوو تەفسیریان دەکەن و هەندێ جار هەر لە سەر ڕوا ڵەتی خۆیان دەیانهێڵنەوەو هەندێك جاریش تەئویلیان دەکەن، بە شێوەیەك کە پێیان وایە کە لەگەڵ بە پاك و بێگەردگرتنی خوادا گونجاوترە.

کەواتە: ئەو قسەیەی کە دەڵێ: ((زانایانی پێشین (سلف)، ئایەتەکان، یاخود هەندێك لەو شتانەی کە خوای بەرزو بێوێنە خۆی پێ وەسف کردوون لە قورئاندا، یان لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ، تەئویلیان نەکردوون، بەڵکو ئەوە بیدعەیەکەو داهێنراوە))، ئەم قسەیە ڕاست نیەو واقیعی زانایان وتوێژەروانی قورئان، ئەو جۆرە قسانە هەڵدەوەشێنێتەوە و پێچەوانەی ئەمانەتی زانیاری (الأمانة العلمية)یشە کە بەو جۆرە باسی هەڵوێستی زانایانی ئیسلام بکرێ لە پێشین و پاشین.

# بـابـەتی دووەم:

## سیفەتە خەبەریی یەکان لە نێوان تەئویل کران و بەڕێکراندا
## ( الصفات الخبـرية بين التأويل والتمرير )

وەك پێشتریش باسمان کرد ئەم با بەتی دووە مە لەم چوار خا ڵە سەرەکییە پێك دێ:

خـــاڵی یەکەم: تەوژمی سیفەت لابەرەکان (نفاة ال صفات)و سێ قوتابخا نە سەرەکییەکانی: جەهمی یەکان و ئە شعەرییەکان و ماتوریدییەکان.

خـــاڵی دووەم: سیفەتە خەبەرییەکان، هۆی ناونرانیان، جۆرەکانیان، ژمارەیان.

خاڵی سێیەم: سێ جۆرە هەڵوێ ست لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەکاندا: دووی چەوت و یەکی ڕاست.

خـــاڵی چوارەم: سەرنجێکی گشتی لە سیفەتە خەبەرییەکان لە ڕووی تەئویلکران و بەڕێکرانەوە.

# دەستپێك:

خوێنەری بەڕێز!

لە بابەتی یەکەمدا ڕوونمان کردەوە کە زانایانی ئیسلام بە پێ شین و پاشین (سلف و خلف)ەوە، کەم و زۆر بۆ ڕوونکردنەوەو تەفسیری هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پەیوەندییان بە سیفەتە بەرزو بێوێنەکانی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارەوە هەیە، پەنایان بردۆتە بەر تەئویل کردن. دیارە تەئویل بە مانای سێیەمی وەك لە بابەتی یەکەمدا خستمانە ڕوو کە کورتەی پێناسەی ئەو ماناو چەمکەی سێیەمی وشەی (تأویل) بریتییە لە: لادانی وشەیەك یان ڕستەیەك لە مانا ڕواڵەتی و ئاشکرایەکەی، بۆ مانایەکی پەنهان و مەجازیی لەبەر بەڵگەو نیشانەیەکی ناچارکەر. بەڵێ کەم و زۆر زانایان هەر لە سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکان (أصحاب)ەوە، - خوا لێیان ڕازی بێ -، تا ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، خۆیان بە ناچار بینیوە کە هەندێك لە دەقەکانی قورئان و سوننەت تەئویل بکەن، بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان بە سیفەتە بەرزەکانی خوای پەروەردگارەوە هەیە. لەبەرئەوەی کە لە زمانی عەرەبیدا گەلێك وشەو دەربڕین هەم مانای حەقیقی و ڕواڵەتییان هەیەو، هەم مانای پەنهانو مەجازیشیان هەیەو هەردوو ماناکانیش دەگونجێ ڕاست و دروست بن.

جا جاری وا هەیە کە بەڵگەو نیشانەیەك، وەزع و حاڵێك، دەبێتە پەرچ (مانع) لەوەی کە تۆ ئەو وشەو دەربڕین (تعبیر)ە بە مانا ڕوا ڵەتیو حەقیقی یەکەی لێك بدەیەوەو بە ناچاری دە بێ مانا یەکی پەنهانو مەجازیی لێ بگری. دیارە کە کاتی خۆی بەو شێوەو چۆنیەتی یەو ڕێبازە شەرعیو فیطری و عەقڵی یەی کە هاوەڵان - خوا لێیان ڕازی بێ - پێیدا ڕۆیشتوونو هەڵسوکەوتیان پێ لە گەڵ دە قەکانی قورئانو سوننەت کردوە، ئەگەر خەڵك لە دوای ئەوان هەر لەسەر ئەو ڕێبازە مابانەوە، بەڕاستی دووچاری هیچ گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیەك نەدەبوون لە تەفسیرکردن و لێکدانەوەو تێگەیشتن لەو دەقانەی قورئانو سوننەت کە پەیوەندییان بە ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگارەوە هەیە، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەو سێ پشت (جیل)و وەچەیەی کە پێغەمبەر ﷺ شاهیدیی بۆ داون کە باشترینی ئۆممەتن(تر)، ڕۆیشتن و وەچەکانی دوایی مسوڵمانان هاتن و کتێب و کە لەپووری یۆنانییەکانو هی فارسو هیندو چینو نەصرانییەکان تەرجەمەکران بۆ زمانی عەرەبی و لەنێو مسوڵماناندا بڵاوبوونەوە، کۆمەڵێك زاراوە (مصطلح)ی فەلسەفییو فیکریی نائیسلامیی بڵاوبوونەوە، کە سانێك کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو فیکرە نامۆو غەریبانە، وەك چۆن ئێستا خەڵکێك دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو فیکرەو بیردۆزانەی کە لە

(تر) وەك فەرمووییەتی: ((خَيْرُ أُمتِّي: القَرْنُ الذي بُعِثتُ فيهم ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم)) رواه البخاري و مسلم.

ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دێن، وەك (کاپیتالیزم، لیبڕالـیزم، سیکۆلاریزم، سۆسیالیزم، ناسیۆنالیزم) کە ئێستا کەمو زۆر کاریگەریی ـیان هەـیە لەسەر خەڵکانێك. ئنجا بە هۆی ئەو کەوتنە ژێر کاریگەریی فەلسەفی یۆنانیو فیکری ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییە، خەڵك لە رو حی قور ئان و سوننەت و لەو ڕێبازە شەرعی و فیطری و عەقڵییەی، کە پێ شینەکان دایانڕشتبوو دوورکەوتنەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا کۆمەڵێك بیـروبۆچوونی سەیرو سەمەرەو بێجێو لەگەڵ شەرع و فیطرت و عەقـڵدا نەگونجاو، هەم بەلای بەزایەدانداو هەم بەلای زیادەڕۆیی کردندا پەیدابوون دەربارەی ناو و سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن، بەڵام ڕێگا لێتێکچوونەکە ز یاتر بەلای بەزایەدان (تفریط)دا بوو، بەلای دارِنـیـن و کەمکرد نەوەی سیفەتەکان لە خوای تاكو پاك (سبحانەوتعالی)، وە چەند قوتابخانەیەك پەیدا بوون، کە هەموویان لەژێر ناوونیشانی سیفەت لابەرەکان (نُـفاة الصفات)دا بوون، کە هەموو، یاخود زۆر لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان لادەبرد، بە خەیاڵی خۆیان بۆ ئەوەی، کە بەرگری بـکەن لە یەکتایی خواو لە بێ کەموکوڕییو بێهەڵەیی خوای بێهەڵەو پەڵە.

ئێستاش با لە خاڵی یەکەمی ئەم بابەتەدا تیشـکێك بخەینە سەر سێ قوتابخانە سەرەکییەکانی ڕێرەوی لابردنی سیفەتەکان (إ تجاه نفي الصفات):

## خــاڵی یەکـــەم:

## تەوژمی سیفەت لابـــەرەکان (نفـــاة الصفات)و سێ قوتابخانــە ســـەرەکیی‌یەکانیی

ئەو قوتابخانانەی کە لەژێر ناوونیشانی سیفەت لابەرەکان (نفاة الصفات)دا خۆیان دەبینییەوە، سێ قوتابخانەی سەرەکی بوون:

(1) <u>قوتابخانەی یەکەم:</u> بریتی بوون لە جەهمی یەکان (الجهمیة): کە شوێنکەوتووانی (جهم ی کوڕی صفوان) بوون، کە کابرا یەك بووە زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانی، وە شارەزایی‌یەکی وای نەبووە لە قورئان و سوننەتدا، بەڵام کابرایەکی زۆر قسەزان و بیر تیژو وریا بووە، بۆیە لە لایەکەوە توانیویەتی خەڵك بخاتە ژێر کاریگەریی قسەکانی خۆیەوە، بەڵام لەبەر ئەوەش کە شارەزای دەقەکانی قورئان و سوننەت و ئیسلام نەبووە، بە باری هەڵەو نارێکدا کاریگەریی لەسەر خەڵك هەبووە، وە بەپێی قسەی زۆر لە مێژووزانان دوایی هەموو ئەو قوتابخانە لادەرانەی پەیدابوون، کەم و زۆر لە ژێر کاریگەریی قسەوباس و بیروبۆچوونەکانی جەهمی کوڕی صەفوان دابوونە، چ لە بواری ناو و سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزنداو، چ لە بوارەکانی دیکەدا، وەك پێناسەی ئیمان و ئیسلام، کە لە باسەکانی سەرەتادا باسمان کرد، وە چ لە بواری دوارۆژدا، بۆ

وێنە: (جهم ی كوڕی صفوان) گوتوویەتی: كاتێك دێت كە نە بەهەشت و نە بەهەشتی یەكان، وە نە دۆزەخ و نە دۆزەخی یەكان، هیچیان نامێننن!! ئاوا (جهم) كۆمەڵێك بیروبۆچوونی فیكریی و فەلسەفی خستنەڕوو لەنێو مسوڵمانانداو كەم و زۆر خەڵك كەوتە ژێر كاریگەرییان. جا یەكەمین قوتابخانەیەك كە لەژێر ناوونیشانی لابەری سیفەتەكان (نفاة الصفات)دا خۆیان دەبینەوە جەهمی یەكانن. جەهمی یەكان دەیانگوت: ئێمە نابێ خوای پەروەردگار بە هیچ سیفەتێك وەسف بكەین، كە ئەو وەسفە بۆ دروستكراوەكان بەكار هاتبێت، وەك: نابێ نە بڵێین: خوا زانیاری هەیە، نە بڵێین نیەتی، وە نە بڵێین: خوا دەبینێ، نە بڵێین نابینێ، وە نەبڵێین: خوا ژیانی هەیە، نەبڵێین: نییەتی، وە نەبڵێین، خەوی لێ دەوكەوێ، نەبڵێین: خەوی لێ ناكەوێ، ئاوا بەم شێوەیە، هەتا گەیشتنە ئەوەی گوتیان: نابێ نە بڵێین: خوا هەیە، نە بڵێین: نییە، چونكە بوون (وجود) سیفەتی دروستكراوەكانەو بۆ دروستكراویش دەگوترێ: هەیە، یان نیە، بۆیە نابێ سیفەتی بوون (وجود)یش پاڵ بدەینە لای خوا، دەیگوت خوا هەیە، بەڵام نابێ بڵێین خوا بوون (وجود)ی هەیە، واتە: نابێ سیفەتی بوون (وجود)ی پاڵ بدەینە لا!!، ئنجا نەك هەر ئەوەندە: بەڵكو دەیانگوت: وەك سیفەتی بوون (وجود)ی پاڵ نادەینە لا، سیفەتی نەبوون (عدم)یش نالێین: خوا (بوون)ی هەیە، وە ناشڵێین: خوا نەبوو (عدم)یشە، چونكە (بوون)

بۆ ئەو دروستکراوانەیە کە هەن، نەبوون ( عدم)یش بۆ ئەو دروستکراوانەیە کە نین، یان لەنێو دەچن، جا بە حیسابی خۆیان ئەوە هەمووی بۆ ئەوەی کە خوای پەروەردگار بە هیچ شێوەیەك لە دروستکراوەکان، وە لەو شەو دەربڕین (تعبیر)انەی کە بۆ دروستکراوەکان بەکاردێن، نزیك نەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە، دەیانگوت: دەبێ ئێمە بە هیچ کام لەوشتانە، خوای بەرزو مەزن وەسف نەکەین!!. هەڵبەتە بەم شێوە ڕەفتارکردنەش لە گەڵ سیفەتەکانی خوای مەزندا، هەم پێچەوانەی شەرعە، وە هەم پێچەوانەی عەقڵو فیطرەتە. کەواتە پێویست ناکات، ئێمە خۆمان بە بەرپەرچ دانەوەو پووچاندنەوەی ئەو بیرۆکەیەوە ماندوو بکەین! هەڵبەتە ئێمە ناڵێین: ئەوانە هەموویان یان زۆربەیان نیازیان خراپ بووە، بەڵکو بە حیسابی خۆیان ویستوویانە بێ عەیبیو بێ کەموکوڕییو بێهەڵەو پەڵەیی خوا دەربخەن وە بە پاكو بێخەوشی بگرن، بەڵام چونکە لە ڕێبازی شەریعەت ترازاون سەرەنجامیان بەوە گەیشتوە، کە تەنانەت نەتوانن بوونی خواش بسەلمێنن!!.

(2) <u>قوناغی دووەم:</u> ئەم ڕێچکەیەش هەر لەوانەن کە زۆر لە سیفەتەکانی خوایان لادەبرد، (جەهمی یەکان) هەموو سیفەتەکانی خوایان لادەبرد، بەڵام ئەم ڕێچکەیەی دووەم زۆر بەیانیان لادەبرد، بەتایبەتی سیفەتە خەبەرییەکان، جا ئەمانەش هەم (مُعْتزلة)کان بوون، کە ئەمان وەك سەرقافڵە وابوون، هەم (شیعة)کان بە گشتی،

بەتایبەتی شیعەی دوازدە ئیمامی، هەروەها فەیلەسووفە مسوڵمانەکانیش، وەك (ابن سینا)و (فارابي)و (إبن رشد)، ئنجا وەك گوتمان سەرقافلەی ئەو سێیانە (موعتەزیلە) بوون، کە دەیانگوت: ئێمە ناوەکان بۆ خوا بڕیار دەدەین و دەڵێین: خوای پەروەردگار (علیم، حکیم، رحیم، رحمن، عزیز... هتد)ەو ئەو ناوانە هەمووی بۆ خوا بڕیار دەدەین، بەڵام ئەو سیفەتانەی لەوناوانە وەردەگیرێن، بۆ خوایان بەکار ناهێنین و ناڵێین: خوا (علم و حکمة و رحمة و قدرة و عزة و عظمة)و ئەوانەی هەیە، بەڵکو تەنها بە شێوەی (ناو)، ئەو سیفەتانە بۆ خوا دەسەلمێنین و بەکاردێنین!! چا ئێمە پێشتر باسمان کرد، کە پاساوی ئەوانە بۆ ئەم هەڵوێستەیان ئەوەبوو کە: دەیانگوت: ئەگەر بێت و ئەو سیفەتانە هەموو بسەلمێنین دووچاری کێشەی (تعدُّد القدماء) دەبین! واتە: خوا (عزّو جلّ) یەکەمو بێ سەرەتایەو ئەگەر بڵێین: ئەو سیفەتانەش هەموویان سیفەتی خوان و سیفەتی خواش عەینی خودی خوان و لێی جیانابنەوەو لەگەڵ خوادان (عزّوجلّ)، کە بێ سەرەتایە، کەواتە: کۆمەڵە سیفەتێك هەن، کە ئەوانیش بێسەرەتان، وە لە ئەنجامدا چەند بێسەرەتا پەیدادەبن و ئەوەش دژو پێچەوانەی خوا بەیەکگرتن (توحید)ە! دیارە ئێمە لە شوێنی خۆیدا باسمان کرد کە ئەوە بیرێکی پووچەو لە ئەنجامی کەوتنە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانییەوە

ئەو جۆرە بیرکردنەوە پەیدابوو، چونکە لە ڕاستیدا هیچ کات زات بەبێ سیفەت نابێت، نە زاتی خوای پەروەردگار بەبێ سیفەتەکانی دەبێت، وە نە زاتی هیچ شتێکیش، هەموو شتێك بەهۆی نیشانەو سیفەتەکانی‌یەوە دەزانرێ کە بوون و خودی هەیە، بۆ نموونە: هێزی کێشندە ( قوة الجاذبية) ئەگەر بەهۆی شوێنەوارو نیشانەو سیفەتەکانی‌یەوە نەبێت، بێگومان هەست بە بوونی ناکرێت، بەڵام پەرێزو نیشانەکانی دیارن و (تەن)ەکان بەرەو خۆی دەکێشێ، کەواتە نەك هەر خوای بەرزو مەزن بەڵکو دروستکراوەکانیش زاتیان بەبێ سیفەتیان بە هیچ شێوەیەك بوونی نیە، وە لە ڕاستیدا سیفەت و زات، پێکەوە پەیوەست (متلازم)ن، وە ئێمە پێشتر باسیشمان کرد، کە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ڕازی نین بەوەی بگوترێ: سیفەتەکانی خوا، خودی زاتنی، چونکە بەوە قسەی (موعتەزیلە) ڕاست دەردەچێت، وە ئەوە ڕاست دەدەرچێت کە سیفەتەکانی خوای تاكو پاك مانایەکی زیادیان تێدانیە لە زاتی!. بەڵام دیسان زانایانی سوننەت و جەماعەت ڕازیش نین کە بە ڕەهایی (مطلق)ی بگوترێ: سیفەتەکانی خوا جیان لە زاتی خوا، چونکە ئەو کاتە چەند لە مێژینەیی (تعدّد القدماء) پەیدا دەبێت!، بەڵکو زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئۆممەت دەڵێن: لەو ڕووەوە کە سیفەتی خوا لە زاتی جیانابنەوە، ئەوە سیفەتەکانی خوا خودی زاتنی، لەو ڕووەشەوە کە

سیفەتەکان مانایەکی زیادەیان تێدایە لە زات، ئەوە جیان لە زات کەواتە: بە دوو ئیعتبارو ڕووی لەیەك جیا، دروستە هەرکام لەو دوو قسەیە بکرێن و بگوترێ: سیفەتەکانی خوا خودی خوانین بەڵام لێشی جیا نین (لا هي هو ولا هي غيره) بەڵام بە ڕەهایی ڕاست و ڕەوا نیە بگوترێ: سیفەتەکان خودی زاتی خوان، یان جیان لە زاتی خوا. جا (معتزلة) بەوە بەهەڵەدا چووبوون کە لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانی دابوون و لە فەلسەفەی یۆنانیشدا شتێك هەیە پێی دەڵێین (ماهیەت)، کە لە ڕاستیدا بوونی ماهیەت بەبێ نیشانەو سیفەتەکان (أعراض) تەنیا وەهمو خەیاڵە، وەك کە لە باسێکدا نموونەم هێنایەوە کە: تۆ دەتوانی لە مێشکی خۆت جوانیی (جمال) تەصەوور بکەی و بیهێنیە بەر خەیاڵ بەڵام ئەو جوانی یەی کە بە خەیاڵ تەصەووری دەکەی، لەسەر ئەرزی واقیع بوونی نیە، بەڵکو بۆ پەیدابوونی لە واقیعدا تەنیا دەبێ بڵێی: ئەو گوڵە جوانە، ئەو ئینسانە جوانە ئەو باڵندە جوانە، ئەو دیمەنە، واتە حەتمەن دەبێ شتێك هەبێ، بەڵام مێشك دەتوانێ جوانیی لە شتەکان دابڕێ و لە خەیاڵی خۆیدا دایبنێ بێئەوەی کە لە دنیای واقیعدا هەبێ دیاری بکات! با نموونەیەکی دیکەش بێنینەوە: و شەی دادگەریی (عَدْل)، تۆ دەتوانی دادگەریی (عدل) لە مێشکی خۆت تەصەوور بکەی، بەڵام بێگومان لەسەر ئەرزی واقیع دادگەریی

ڕووت نیە، دادگەریی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیەو دادگەریی ئەنۆشیروان و دادگەریی (عومەری کوڕی خەتتاب) - خوای لێی ڕازی بێ- هەیە بەڵام دادگەریی ڕەها ڕووت و دیاری نەکراوو لە کەسێکدا بەرجەستەنەکراو تەنها لە زەین و خەیاڵدا هەیە. بەڵێ (معتزلة) بەوە بەهەڵەدا چووبوون، کە پێیان وابوو ئەو شتە ڕووت (مجّرد)انەی کە لە مێشکدا هەن بوونێکی حەقیقی و واقیعی یان هەیە، بۆیە پێیان وابوو کە ئەگەر بێت و بۆ سیفەتەکانی خوای بەرزو بێوێنە سەر بە خۆیی دابنێین و بڵێین: (قدرة، علم، رحمة)و سیفەتەکانی دیکەی هەن، ئەوە چەند بێ سەرەتا (أزلي) یێك دان پێدادەهێنینو گرفتی (تعدّد القدماء) سەر هەڵدەدات! هەڵبەتە شیعەی دوازدە ئیمامیش زۆر کارتێکراو (متأثر)ن بە فیکرو بیروبۆچوونەکانی موعتەزیلە لە زۆر بواراندا کە یەکێکیان بواری ناوو سیفەتەکانەو هەر بۆیەش لە مەسەلەی ناوو سیفەتەکاندا ئەوانیش هەر هەمان پاساو دەهێننەوە، بەڵام فەیلەسووفەکان، کە دەیانگوت خوای بێوێنە سیفەتی نین، ئەوان لە ڕوویەکی دیکەوە وایان دەگوت، چونکە ئەوانە بڕوایان بە چەند بێسەرەتایەك هەیە!، بەڵێ ئەوان بڕوایان بە دە عەقڵەکان (العقول العشرة) هەیە[ت]و دەڵێن: خوا عەقڵی یەکەمی دروست کردوە، ئنجا عەقڵی یەکەم

(ت) ئەو مەسەلەیەکی دیکەیە لە ئەفسانەکانی فەلسەفەی یۆنانی.

عەقڵی دووەمی دروست کردوە، عەقڵی دووەمیش عەقڵی سێیەمی دروست کردوە، ئاوا هەتا عەقڵی دەیەم، عەقڵی دەیەم پێی دەگوترێ عەقڵی کارا (فعّال)، جا عەقڵی کارا هەموو بوو نەوەرو دروستکراوەکانی دیکەی دروست کردوە!! کەوا تە ئەوان (فەیلەسووفەکان) گرفتیان لەوەدا نەبووە کە چەند بێ سەرەتایەك هەبن، بەڵام ئەوان گرفتیان ئەوە بوو دەیانگوت: خوا (بسیط)ە، واتە سادەیەو بە شێوەیەك کە هەر خۆی بێت و لە گەڵ هیچ شتێکی دیکەدایەکی نەگرتبێت، واتە پێچەوانەی لێکدراو (مرکب)ە! جا ئەوان پێیان وابوو ئەگەر دان بێنن بەوەدا کە خوا، ئەو سیفەتانەی هەن، مانای وایە دەبێ خوای مەزن لێکدراو (مرکب) بێت، واتە لە زات و لە کۆمەڵێك سیفەت لێك درابێت و پێکهاتبێ! دیارە هۆی ئەو جۆرە بیرکردنەوەشیان ئەوە بوو، کە ئەوان لەسەر بناغەیەکی ماددی تەماشای خوای بێوێنەیان کردوەو، مرۆڤیش ئەگەر بەس بە عەقڵی و خەیاڵ بیر لە خوا بکاتەوە، بێگومان بەهەڵەدا دەچێت! بەڵێ ئەوان نەدەچووە عەقڵیان، کە دەگونجێ خوای بەرزو مەزن لە یەك کاتدا لێکدراو (مركّب)یش نەبێت و، زات و بوون (وجود)ێکی موتڵەق و سیفەتی بێسنووریشی هەبن، بێئەوەی پێویستبێ کە بگوترێ زات و سیفەتەکانی یەکیان گرتوە، پێیان وا بوو، کە وەك چۆن شتێکی ماددی لە کۆمەڵێك بەش و پارچە پێکدێ، خوای

پەروەردگاریش ئەگەر بگوترێ ئەو سیفەتانەی هەن، مانای وایە ئەویش دەچێتە حاڵەتی لێکدرانەوە! جا دەیانگوت بۆ ئەوەی نەڵێیــن: خوای پەروەردگار لێکدراو (مركّب)ەو لە چەند شتێك پێکهاتوە ناچارین کە بڵێیــن: خوا سیفەتی نین و تەنیا زاتە، بەڵێ زاتەکە (علم و قدرة و رحمة و... هتد)ی هەن، بەڵام ناڵێیــن خوای بەرزو بێوێنە سیفەتی هەن! ئەوەش دەربارەی قوتابخانەو رێچکەی دووەم، کە ئەمانیش زۆر بەی هەرە زۆری سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان لادەبردن. وە ئەمانە ئەسڵەن بەلای سیفەتە خەبەرییەکان (الصفات الخبرية)دا هەر نەدەچوون، ئەوەی کە خوا لەسەر بارەگا (عرش) بێ و ڕوو (وجه)ی هەبێ و لە ئاسمان بێت و بێتە خوار بۆ ئاسمانی یەکەم و... هتد، وەك لە خوا دەوەشێتەوە، بەڵێ بەلای ئەوانەدا هەر نەدەچوون، ئەوانە ئەگەر ڕازی نەبن خوا سیفەتێکی مەعنەویی هەبێت، وەك (علم، قدرة، رحمة)، ئەوە هەرگیز ڕازی نابن، کە خوای بەرزو بێوێنە ئەو سیفەتە خەبەرییانەی بۆ کار بهێنرێن، کە مانا ڕواڵەتییەکەیان ئەندام (عضو) دەگەیەنێ بۆ ئێمە، بەڵام بۆ خوای بێ هاوەڵ سیفەتێکی خوایی دەگەیەنێ، کە بێگومان لە قەدەر خوایەو بۆی شایستەیە.

(3) <u>قوتابخانەی سێیەم:</u> کە بریتین لە: ئەشعەرییەکانو ماتوریدییەکان، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین، کە ئەشعەرییەکانو

ماتوریدی یەکان، ئەوانەی سەرەتاو پێشــوو جیابوون لەوانەی دوایی. چونکە لە سەرەتاوە ئەشعەرییەکانیش بۆ وێنە هەرکام لە: (أبو الحسن الأشعري و أبوبكر الباقلاني) کە دوو لە پێشەواو ناودارانی قوتابخانەی (أشعري)ن، لە بارەی سیفەتەکانی خوای پەروەردگارەوە بە سیفەتی خەبەریشەوە، ڕایان وەك ڕای سەلەفی صالح وابووەو بەموو لەوانیان لانەداوە. هەڵبەتە کاتی خۆی (أبو الحسن الأشعري) لەگەڵ (معتزلة) دابووەو ماوەی چڵ ساڵ سەر بەو قوتابخانەیە بووەو قوتابی (أبو علي الجبّائي) بووە کە کابرا یەکی زۆر بلیمەت و عاقڵمەند بووەو لە سەردەمی خۆیدا پێشەوای موعتەزیلە بووەو لە شاری (بصرة) دانیشتوە، جا (أبو الحسن الأشعري) بەهۆی ئەوەوە لە موعتەزیلە جیادەبێتەوە کە دیارە یەکێك لە بنچینەی قوتابخانەی موعتەزیلە ئەوەیە کە: لەسەر خوا پێویستە چ شتێك بۆ بەندەکانی چاکە ئەوەیان بۆ بکات، کە بە (وجوب الأصلح للعباد على الله) وەك بنچینەیەك دایانڕشتوە! جا دیارە ئەوە بیرۆکەیەکی هەڵەیەو پاکیی بۆ خوا، کە شتێکی لەسەر پێویست بێ[تر]، مەگەر ئەوەی بۆ خۆی لەسەر خۆی پێویست کردبێت. بەڵێ بێگومان ئەو بیرۆکەیە لە ڕوانگەی عەقڵ و شەرع و فیطرەتەوە ڕا یەکی هەڵەیەو شتێکی

(تر) چونکە خوا (عزّوجلّ) زۆر لەوە بەرزو مەزنترە کە غەیری خۆی شتی لەسەر پێویست بکات، وەك فەرموویەتی: ﴿لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ (الأنبياء 23).

پووچەو هیچ شتێك لەسەر خوا پێویست نیە، چونكە هەموو شتێك دروستكراوی خوایەو هەموو ئینسانەكان بەندەی خوان، بەڵام ئەگەر خوا بە بەخشش و كەرەمی خۆی شتێك لەسەر خۆی پێویست بكات وەك فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾[1]، واتە: خوا رەحمەتو بەزەیی لەسەر خۆی پێویست كردوە، ئەوە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام هیچ كەسێك بۆی نیە بڵێ: ئەو شتە لەسەر خوا پێویستە! جا رۆژێك (أبو الحسن الأشعري) ئەو پرسیارەی لە (أبو علي الجبّائي) كرد كە مامۆستای بوو، گوتی: باشە ئەگەر سێ برا هەبن، یەكێكیان ئەهلی طاعەتەو مسوڵمانەو یەكێكیان ئەهلی (كفر)و سەرپێچی و تاوانە، یەكێكیشیان هێشتا باڵغ نەبووە، جا ئەوەیان كە مسوڵمانە باڵغ بووەو كردەوەی باشی زۆر كردوە، خوا مراندوویەتیو بردوویەتە بەهەشت، ئەوەشیان كە خاوەنی (كفر)و تاوان و خراپە بووەو باڵغ بووە، بەڵام كردەوەی خراپی زۆر كردوە، دوایی خوا مراندوویەتی و بردوویەتییە دۆزەخ، بەڵام ئەوەی كە منداڵەو بە نەباڵغی مردوە، دیارە مادام مسوڵمان بووەو لەنێو مسوڵمانان دابووە، دەچێتە بەهەشت، جا باشە ئەگەر ئەو مندا لە بچووكە، لە رۆژی دواییدا لە خوا بپرسێت، (بە پێی بۆ چوونی ئێوە)و بڵێ: ئەی خوایە بۆچی منت بە منداڵی مراند، لێم گەڕابای‌و

---

[1] (الأنعام 12).

وازت لێم هێنابایە تا گەورە دەبووم‌و کردەوە با شەکانم دە کردو وەك برایەکەی دیکەم بە پلە بەرزەکانی بەهەشت گەیشتبام؟ ئایا ئەگەر ئەو پرسیارە لە خوای پەروەردگار بکات خوای کاربەجێ ( بە پێی بۆچوونی ئێوە ) چۆنی وەڵام دەداتەوە؟! ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: خوا پێی دەڵێ: بۆ تۆ ئاوا باش بوو، کە بە منداڵی بت مرێنم، چونکە دەمزانی ئەگەر گەورەبی تووشی کوفرو گوناح و تاوان دە بی، ئاوا وەڵامی ئەو منداڵە دەداتەوەو بێقسەی دەکات! (أ بو الحـ سن) یش دەڵێ: مادام وایە لێرەدا برا کافرە کەش پر سیارێکی بۆ درو ست دەبێت و دەڵێ: ئەی خوایە، ئەگەر تۆ چ شتێك بۆ بەندەکانت چاکە ئەوە دەکەی و لەسەرت پێویستە، بۆچی منت بە منداڵی نەدەمراند، تاکو تووشی ئەو کوفرو تاوان‌و سەرپێچی یە نەبووبام کە دوو چاری دۆزەخی کردووم؟! ئایا خوا چۆنی وەڵام دەداتەوە؟ جا لێرەدا (أبو علي الجبّائي) ڕادەوەستێ هیچ وەڵامی بۆ نادرێتەوە! هەڵبەتە خوا وەڵامی پێیە، بەڵام بە پێی عەقڵی موعتەزیلە کە پێیان وابوو، لەسەر خوا پێویستە چ شتێك بۆ بەندەکانی باشەو قازانجە ئەوەیان بۆ بکات ئەو ئیشکالە دروست دەبێ، کەواتە بیرۆکەکە لە ڕیشەوە هەڵەیە.

دیارە پاش ئەو بێوەڵام بوونەی (أبو عـلي الجـبّائي). (أ بو الحـ سن الأشعري) واز لەو ڕێچکەیەی موعتەزیلە دێنێ و دە ڵێ خوا حافیزو جارێکی دی من لەگەڵ خۆتان نابینەوە چونکە ئێوە خوا لەسەر خۆتان

قیاس دەکەنو دین بە عەقڵ هەڵدەسەنگێنن، بەڵام عەقڵ زۆر لەوە بچووکترە کە جێگای هەموو ڕاستییەکان و نهێنییەکانی دینی تێدا ببێتەوە، خوا حافیز من دەچمەوە سەر ڕێبازی پێشینەی صالحمان! جا (أبو الحسن الأشعري) و (أبوبكر الباقلاني) کە لە سەرانی یەکەمی قوتابخانەی ئەشعەرییەکان (الأشاعرة) بوون، ئەمە بیروبۆچوونیان بووە. وە (أبو الحسن) کتێبێکی هەیە بە ناوی: (الأبانة عن أُصول الديانة) کە عەقیدەو بیروبڕوای وەك هی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بە تایبەتی وەك هی (أحمد بن حنبل)ە -خوا لێی خۆش بێ- هەڵبەتە هەندێك شتیشی هەیە، کە ڕیزپەڕەو جیایە لە هی پێشینەی چاك، وەك لە باسی ئیماندا پێشتر باسمان کرد، بەڵام بە هەرحاڵ بە گشتیو بە تایبەتی لە مەسەلەی ناوو سیفەتەکاندا لە سەر ڕێبازی پێشینی چاك (السلف الصالح) بووە. بەڵام دوایی زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانان کە بە (أهل السنّة) ناسراون لەژێر سایەی ئەو دوو قوتابخانەیەدا کۆبوونەوە، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، کە ئەوکات پێیان دەگوت: (علم الكلام) ئیدی خەڵك یان ئەشعەریی بوو یان ماتوریدیی. جا هەرچی (ابو الحسن الأشعري) بوو فیکرەکەی زیاتر لە ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبۆوە، هی (أبو منصور الماتريدي)یش زیاتر لە وڵاتی فارس و خوراسان و ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا سەقامگیر بوو. شایانی باسیشە کە دوادواکان (متأخِّرين)ی ئەو دوو ڕێبازە زۆر لە

ڕایەکانی موعتەزیلە نزیك کەتوونەوە، بۆ وێنە: (أبو حا مد الغزا لي، فخرالدين الرزاي، أمام الحرمين الجويني) کە مامۆ ستای (أ بو حا مد الغزالي) بووە ئەوانە بڕوایان وابووە، کە دەبێ هەموو سیفەتە خەبەریی یەکان تەئویل بکرێن، دیارە تەئویلی بێبەڵ گەو پا ساویش گۆڕین (تحريف)ە! دیارە وەك پێ شتریش با سمان کرد هە ندێك لە سیفەتە خەبەرییەکان پێوی ستە تەئویل ب کرێن و زانا یانیش لە سەر ئەوە یەکدەنگن، بەڵام لە ڕاستیدا هەموو سەلەفی صالح لەسەر ئەوەش یەك دەنگن کە هەندێکیان نابێ تەئویل بکرێن. جا ئەوانە کە نابێ تەئویل بکرێن هەرکات تەئویل کران ئەوە گۆڕین (تحر يف)ە، چونکە هەر تەئویلێك بەڵگەی شەرعیی یان بەڵگەی عەقڵی لە سەر نەبێ ئەوە گۆڕین و لادانە، جا ئەگەر تەما شای قوتابخا نەی ئە شعەریی یەکان (الأشاعرة)و ماتوریدییەکان (الماتريديون) بکەین، لەبەر ئەوەی کە ئێستاش زۆرێك لە زانایان و پێشەوایانی جیهانی ئیسلامی سەر بەو قوتابخانەیەن، هەرچەندە هەر لە بازنە (أ طار)ی ئەهلی سوننەت و جەما عەتیش دان، بەڵام بە زۆری لەژێر کاری گەریی قوتابخا نەی ئەشعەریی دان، بەڵام هی بیــروبۆچوونەکانی دوادوایەکان (م تأخرين) نەك هی خودی (أبو الحسن و الباقلاني)و هاو وێنەکانیان کە بە زۆری هەرە لەسەر ڕێبازی پێشینی چاك بوون، بەڵێ ئێستا شوێنکەوتووانی هەر کام لەو قوتابخانەیە بڕوایان وایە خوای تاكو پاك تەنیا بی ست

(20) سيفەتی هە یە، وە سيفەتەكانی دی كە (وەك لە با سەكانی پێشوودا باسمان كرد) پێیان وایە یان دەكەونە ن یو ئەو سيفەتانەوە، یاخود دەبێ تەئويل بكرێن!! جا ئەو بيست (20) سيفەتانەی كە ئەوان دەڵێن خوای بەرزو مەزن تەنيا ئەو سيفەتانەی هەن، چوار بەشن:

بەشی یەكەم: حەوتيان پێیان دەگوترێ: (صفات المعاني) كە بريتين لە:
(الحياة، القدرة، الأرادة، السمع، البصرة، العلم، الكلام) ژيان و توانایی و ويستن و بيستن و ديتن و زانياری و قسەكردن.

بەشی دووەم: پێنجيشيان پێیان گوتوون: (الصفات السلبيّة) واتە: ئەو سيفەتانە كە كۆمەڵێك كەموكوڕیی و ناتەواویی لە خوا وەدوور دەخەن، ئەوانيش بريتين لە: ((القدم، البقاء، الواحدانية، الغنى (يان: القيامُ بالذّات)، المُخالَفَةُ للحوارث (يان: المُخالفة للمخلق)) جا ئێستا با تيشكێك بخەينە سەر هەركام لەم پێنج وەسفە:

(1) (القِدَم) واتە: لە مێژينەیی، دێرينیی، شايانی باسيشە كە زانايان لەسەر ئەم وشەیە تێبينیيان هەیە، كە ئايا دروستە بڵێی: خوا (قديم)ە؟ زۆربەی هەرە زۆری زانايان دەڵێن(ت): دروست نيە، چونكە (قديم) واتە: زۆر دەمێكە هەیەو لەمێژە، بەڵام مەرج نيە بێسەرەتا بێت، بەڵام بوونی خوا بێسەرەتايە، خوا (الأول)ە (هو الأول و الأخر) بەڵام دروست نيە بگوترێ (قديم)ە، وە لە بەر ئەوەی خوای

(ت) منيش هەر ڕام وایەو گومانيشم لە ڕاستی ئەم ڕایەو هەڵەیی پێچەوانەكەی دا نيە.

پەروەردگار ناوی لە دروستکراویش ناوە ( قدیم)، وەك لە با سی مانگدا فەرموویەتی: ﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾(یس-39) واتە: مانگ، چەند قۆناغێکمان بۆ دیاری کردوە هەتا دوایی وەك لقە دارخورمای وشك و کۆنی لـێدێت، کە لە شەوانی کۆتاییدا، مانگ وەك کەوا نە خوار دەبێتەوە، لێرەدا (عُرجون) دروستکراو (مخلوق)ە، بەڵام خوای زاناو کاربەجێ سیفەتی (قدیم)یشی بۆ داناوە، بۆیە زۆربەی زانایان لەوەدا کە بە سیفەت بۆخوا دابنرێت تێبینییان هەیە.

(2) (البقاء) واتە: مانەوەو نەفەوتان، هە ندێك لە زانا یان دە ڵێن سیفەتی (بقاء)یش بۆ خوا ناگونجێ چونکە هەرکام لە ئەهلی بەهەشت و دۆزەخیش دەمێننەوەو نافەوتێن، بۆیە ناکرێ بڵێین ئەم سیفەتە تایبەتە بە خواوە، بە پێچەوانەی سیفەتی (الأخر)ەوە، واتە: کە دەکەوێتە کۆتایی دروستکراوەکان و برانەوەی نیە نە لە دنیاو نە لە دوارۆژداو لە مانەوەشیدا پێویستی بە کەس نیە! هە ندێکیش دەڵێن: وشەی (بقاء) بەکارهێنانی بۆ خوا دروستە، کە سیفەتەکەی دەبێتە (الباقي) چونکە هەم لە فەرموودەکەی (ترمذي)دا هاتوە، هەرچەندە تێبینییان لەسەر فەرموودەکە هەیە، وە هەم خوای زاڵ و زانا فەرموویەتی: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾(). دەڵێن

(تر) ( الرحمن – 27).

(ویبقی) ناوی (باقي) لـێهەڵدەهێنجرێ، جا بە هەرحاڵ ئە مەیان کەمتر مشت و مڕی لەسەرە.

(3) (الوحدانية) واتە: تاکێتی و یەکبوونی، ئەمیان ئاشکرایەو ئایەتی زۆری لەسەرن[تر].

(4) (الغِنى) واتە: بێنیازیی، یان (القیام بالذات) وا تە: بە خۆوە ڕاوەستاون و پێویستی بە کەس نەبوون، ئەمیش ئا یەتی زۆری لەسەرن[یز].

(5) (المخالفة للخلق) یان (المخال فة لل حوادث) وا تە: پێ چەوانەو جیاوازبوون لە درو ستکراوەکان کە هەر هەموویان نەبوون و پەیدابوون، کەموکوڕییان بە سەردا د یێت، دە مرن و دە خەون، دەستەوەستانن، هەڵەو پەڵەیان زۆرە، گۆڕانیان بەسەردا دێت بەڵام خوای بەرزو بێنیاز دوورەو پاكو بێ گەردە لەو شتانەو غەیری ئەوانیش، ئایەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾[سم]، و ڕستەی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[□] لەوبارەوە بەسن.

(تر) ﴿... أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ؟!﴾ (يوسف □ 39) .
(یز) ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ (الأخلاص □ 2)، ﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ...﴾ (البقرة □ 255) ، ﴿وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾ (محمد □ 38) .
(سم) (الأخلاص □ 1) .
(□) (الشورى – 11) .

بەشی سێیەم: ئینجا حەوت سیفەتی دیکەش کە پێیان دەگوترێ (الصّفات المعنویة) کە ئەمانەن: (الحّي، القادر، المرید، السمیع، البصیر، العالِم، المتکلم) واتە: زیندوو، توانادار، ویستەر، بیسەر، بینەر، زانا، قسەکەر، دیارە ئەمانیش هەر حەوت سیفەتە (معاني)یەکانن و بە صیغەی (أسم الفاعل)و بە شێوەی (ناو) دووبارە بوونەتەوە. بەڵام دووبارەبوونەوەی ئەو سیفەتانە بەم شێوەیە شتێکی بێ پاساو و هەڵەیە، وە لە ڕاستیدا کە دووبارەش بوونەتەوە بەمشێوەیە نابنە سیفەت، بەڵکو ئەوانە ناو (اسم)ن!.

بەشی چوارەم: سیفەتی بیستەم و کۆتاییە کە پێی دەڵێین: سیفەتی نەفسی (الصفة النفسیة)، کە ئەویش بریتیە لە بوون (الوجود).

دیارە سەرجەم ئەو سێ کۆمەڵەش: هەم جەهمی یەکان، هەم موعتەزیلەو شیعەی دوازدە ئیمامی و فەیلەسووفە مسوڵمانەکان، وە هەم ئەشعەریی یەکان و ماتوریدیی یەکان، هەر سێکیان لەژێر ناونیشانی (نُفاة الصفات) (لابەرانی سیفەتەکانی خوا)دا کۆدەبنەوە، چونکە کەم و زۆر سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان لابردوون، جا یان کەمیان کردوونەوە، یان هەر نەیانهێشتوون، دیارە ئەوەش بۆ ئەوە نەبووە کە دژایەتی لەگەڵ خوا بکەن، بەڵکو بە حیسابی خۆیان ئاوا بەو شێوەیە، خوا بە پاك و بێهەڵە دەگیرێ و (تنزیە)و (تقدیس) دەکرێت! بەڵام بێگومان کارەکەیان نەك هەر

بنەتۆوی خۆی نەکردۆتەوە. بگرە زۆریشی لەسەر قەرزدار بوونەوە! پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەو پێرو تاقمانە جگە لە ناوی: (نُفاةُ الصفات)، ناوی: (المُعَطِّلة)شیان بۆ بەکارهێنراوەو لەسەر ئەو جۆرە تەئویلکردنە بێبەڵگەو پاساوەش نازناوی (المحرِّفة)شیان وەرگرتوە! جا بەرێزان! بە پێی ئەو بنچینە (قاعدة)یەی کە دەڵێ: هەموو کارێك کاردانەوەیەکی هەیە لە ئەندازەدا بارتەقایەتی و لە ئاڕاستەدا پێچەوانەیەتی (لکل فعل رد فعلٍ يساويه في المقدار و يعاكسه في الأتجاه) کە هەر چەندە یا سایەکی فیزیایییە، بەڵام زۆرجاران لە دنیای بەشەریشدا ڕاست دەردەچێ، هەمیشە لە بەرانبەر شتێك دا کە تێدەپەڕێنێ، لەولاشەوە بەرانبەرەکەشی دیسان تێدەپەڕێنێ، ئەگەر یەکێکیان کورتی هێناوەو (تفريط)ی کردوە، ئەوی دیکەیان تێدەپەڕێنێ‌و (إفراط) دەکات! جا لە بەرانبەر ئەو سیفەت لابەرانە (نفاة الصفات)دا، کە ئەو سێ قوتابخانە سەرەکییە بوون، کەسانێکیش پەیدابوون کە بەولای دیکەدا شکانەوەو ئەگەر سیفەت لابەرەکان کەمتەرخەمییان کردبوو و بەزایەیان دابوو، ئەوانەی بەرانبەرو پێچەوانەیان زێدەڕۆییان کردبوو و تێیانپەڕاندبوو! جا هەندێك لەوانە هەر یەکسەر خوای بێوێنەو هاوەڵیان وەك ئینسان تەماشا دەکردو دەیانگوت: وەك چۆن ئێمە چاومان هەیەو دەستمان هەیە، خواش ئاوا دەست و چاوی هەیە، بەڵام

دەستو چاوی خوا زۆر لە هی ئێمە گەورەترن! وە وەك چۆن ئێمە لەسەر کورسیو شت دادەنیشین، خواش ئاوا لە سەر ( عرش) دانیشتوە!! واتە، خوای بەرزو مەزنیان لە شێوەی ئینسانێکدا تەصەوورِ دەکرد، وە ئەوانە پێیان دەگوترا: (المُجَسِّمَة) واتە: ئەوانەی خوای پاك و تاك دەجەستێنن و جەستەو لاشەی بۆ بڕیار دەدەن، وە پێشیان دەگوترا: (المُشَبِّهَة) واتە: ئەوانەی خوای بێوێنە بە دروستکراوەکان دەشوبهێنن و وەك دروستکراوەکانی سەیری دەکەن! بەڵام هەشیان بووە یەکسەر نەیگوتوە: ئەندامەکانی ئێمە چۆنن خواش ئاوا ئەندامی هەن و وەك هی ئێمە وان، بەڵکو هەر دەقێکی دەستکەوتبێت و هەر ئایەت و فەرمایشتێکی بینیبێ ئاماژەیان بە سیفەتێکی خوا کردبێ بێئەوەی سەرنج بدەن داخۆ مانا ڕوالەتی یەکەی لەگەڵ خوا (عزّو جّل) دەگونجێ یان نا، یەکسەر ئەو سیفەتەیان بۆ خوای گەورە (سبحانە و تعالی) بڕیارداوەو بۆیان چەسپاندوەو هیچ دەقێک یان هەر چەندە بە بەڵگەی شەرعی و عەقڵییش پێویست بووبێ تەئویل بکرێ و لە مانا ڕواڵەتییەکەی لابدرێ بۆ مانایەکی پەنهانو مەجازیی هەر تەئویلیان نەکردوەو بەو جۆرە خۆیان گیرۆدەی جۆرێك لە وێچواندن (تشْبیە)ی خوا بە دروستکراوەکانی کردوە!

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بچینە سۆراغی سیفەتە خەبەرییەکان:

## خـاڵی دووەم:

## سـیفەتـە خەبەرییەكان: هۆی ناونرانیان، جۆرەكانیان، ژمارەیـان

### (1) هــۆی ناونرانی سـیفەتە خەبەرییەكان بەو ناوە:

سەرەتا پێویستە بزانین ئەو جۆرە سیفەتانەی خوا (عزَّ جَلَّ) بۆ چی ناویان لێنراوە سیفەتە خەبەریی یەكان (الصفات الخبرية)؟! لە وەڵامـدا دەڵێین: لە سۆنگەی ئەوەوە كە سیفەتەكانی دیكەی خوای بێوێنە (سبحانه و تعالى) عەقڵ دەزانێ كە دەبێ خوای پەروەردگار ئەو سیفەتانەی هەبن و تارادەیەك عەقڵ پێیان ئاشنایەو لە گەڵ چەمك و واتاكانیان دەگونجێ، بەڵام سیفەتە خەبەریی یەكان، مەرج نیە عەقڵ بە پێویستی بزانێ كە خوای كاربەجێ ئەو سیفەتانەی هەبێت، واتە: نە لە عەقڵدا جێگایان دەبێتەوە كە بزانێ چۆنن(تر)، وە نە عەقڵ پێویستیشیان دەكات و ئەگەر گریمان خوا بۆ خۆی نەیفەرمووبایە من ئەو سیفەتانەم هەیە، عەقڵ نەیدەزانی كە هەینی! كەواتە: بۆیە پێیان دەگوترێ سیفەتە خەبەریی یەكان: (الصفات الخبرية)، چونكە ئەو سیفەتانە لە ڕێگای خەبەرو هەواڵی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ بە ئێمە گەیشتوون و ئێمە دەزانین كە خوا ئەو كۆمەڵە سیفەتەشی هەیە،

(تر) بەڵام هەڵبەتە ئەمە خاڵی هاوبەشی دیوان سەرجەم ناوو سیفەتەكانی خوای بەخشندەیە.

ئەگەرنا عەقڵ ئەو سیفەتانە پێویست ناکات و مەرجیش نیە هەرشتێك عەقڵ پێویستی نەکرد، بۆ خوا پێویست نەبێت، چونکە عەقڵ زۆر لەوە بچووکترە کە خوا وەك پێویست بناسێ و سیفەتەکانی خوا بناسێ وەك لە باسەکانی پێشوودا بە درێژی باسمان کرد، بەڵێ هەندێك لە سیفەتەکانی خوا عەقڵ دەتوانێ بیانزانێ و بیانناسێ بۆ وێنە، عەقڵ دەتوانێ بوونی خوای بەرزو بێوێنەو بەدیهێنەرایەتی خواو پەروەردگاریێتی خواو زۆر لە ناوە چاك و سیفەتە بەرزەکانی خوا دەرك بکات، بەڵام سیفەتە خەبەرییەکان وەك گوتمان، مەرج نیە عەقڵ بە پێویستیان بزانێ، هەندێك لە زانایانیش پێیان گوتوون: (الصفات السَّمعية) واتە: ئەو سیفەتانەی کە لە ڕێی بیستنەوە بە ئێمە گەیشتوون کە خوا ئەو سیفەتانەی هەیەو ئێمە بیستوومانە لە خوای پەروەردگارو لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە خوا ئەو سیفەتانەی هەیە.

## (2) جۆرەکانی سیفەتە خەبەرییەکان :

سیفەتە خەبەرییەکان دوو جۆرن:

(یەکەم) سیفەتە خەبەرییە زاتییەکان (الصفات الخبرية الذاتية).

(دووەم) سیفەتە خەبەرییە کردەییەکان (الصفات الخبرية الفعلية).

سیفەتە خەبەرییە زاتییەکانی خوای بەرزو مەزن، ئەوانەن کە لە ڕێی هەواڵ و بیستن (الخبر و السمع)ەوە بە ئێمە گەیشتوون و پەیوەستن بە زاتی خواوە، وك چۆن سیفەتە غەیرە خەبەرییەکانی وەك (علم، قدرة، إرادة، حياة، سمع، بصر، كلام... هتد) کە گوتمان

ئەو سیفەتانە زاتیین، چونکە ناگونجێ زاتی خوا هیچ کاتێك ئەو سیفەتانەی نەبێت و هەمیشە لەگەڵ زاتی خوادا هەن و پێیەوە پەیوەستن. وە بە هەمان شێوەش وەك پێشتر گوتمان خوا (عزّو جلّ) هەندێك سیفەتی دیکەی هەن کە سیفەتە کردەیی یەکان (الصفات الفعلیة)یان پێ دەڵێن وەك: دروستکردن، ڕزقدان، ژیاندن، مراندن، بەخشین، نەبەخشین، دیارە ئەو سیفەتانە (خبریة)ش نین و عەقڵ دەزانێ کە دەبێ و پێویستە بۆ خوای پەروەردگار هەبن، وەك چۆن شەرع ڕایگەیاندوە عەقڵیش ئەوە دەزانێ و بە پێویستی دەزانێ بەڵام دیارە ئەو سیفەتە کردەیی یانە زاتیی نین و مەرج نیە کە هەمیشە لەگەڵ زاتی خوادا بن ، وەك پێشتر باسمان کرد کە ئەگەر خوای بەدیهێنەر هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ زاتیدا سیفەتی دروستکردن (خلق)ی هەبووایە(تر) دەبوو دروستکراوەکانی بێ سەرەتا بن! وە ئەگەر لەگەڵ زاتیدا سیفەتی ڕۆزیی دان (رازق)ی ببووایە دەبوایە ڕزق پێدراوەکانی خوا بێسەرەتا بن! وە ئەگەر لەگەڵ زاتیدا، سیفەتی ژیێنەر (محیي) لە خوادا ببووایە دەبوو ئەوانەی کە خوا دەیانژێنێ بێسەرەتا بن!! بۆیە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام گوتوویانە: ئەو سیفەتانە کردەیی (فعلي)ن، واتە: هەرکاتێك کە خوا ویستی لەسەر بوو ئەوجار ئەو شتانە دەبن، واتە: ئەو کاتە خوا (عزّو جلّ) دروست دەکاتو دەژیێنێو دەمرێنێو ڕزق دەداتو بەرز دەکاتو نزم

(تر) واتە: بە کردەوەو شوێنەوار لێ دەرکەوتن هەبوونایە، ئەگەرنا بێگومان خوای بەرزو مەزن وەك ئامادەیی و (بالقـوة) سەرجەم سیفەتەکانی هەر هەبوو ون!

دەكات... هتد، جا وەك چۆن لە سیفەتە غەیرە خەبەرییەكاندا زاتیو كردەیی هەن، لە سیفەتە خەبەرییەكانیشدا بەهەمان شێوە، سیفەتە خەبەرییە زاتییەكان (الصِّفات الخبرية الذاتية) ئەوانەن كە ناگونجێ خوا هیچ كاتێك نەیبووبن، وەك سیفەتی: (وجه، يد، عين) ڕوو، دەست، چاو، ئەوە لە سەر ڕای ئەو زانایانەی كە دەڵێن: ئەو سیفەتانە هیچیان تەئویل ناكرێن، ئەوكاتە دەڵێن: خوا هەر كاتێك لە (ڕوو، دەست، چاو)ی هەیە، بەڵام ڕوویەك و دەستێكو چاوێك كە لە خوای پەروەردگار دەوەشێتەوەو بۆ ئەو شایستەیەو بە تەئكید وەك هی دروستكراوەكان نیە، ئەوا نە سیفەتی خەبەریی زاتین، سیفەتە خەبەریی یە كردەیی یەكان (الصفات الخبرية الفعلية)یش، وەك چوونە سەر (عرش)، كاتێك بووە كە نە (عرش) بووەو نە خواش لەسەر (عرش) بووە، نە ئاسمان و بەرزییەك بووەو نە خواش لە ئاسمان و بەرزییەك بووە، بەو چەمك و واتایەی كە ئێمە تێی دەگەین، نە ئاسمانێكی دونیا بووەو نە هاتنەخوارەوەی خوا بووە، بۆ ئاسمانی دونیا، بەو شێوەیەی كە لە خوا دەوەشێتەوە، ئەوانە سیفەتی خەبەریی كردەیی (الصفات الخبرية الفعلية)یان پێ دەڵێن، واتە: ئەو سیفەتانەی كە لە ڕێی خەبەرو هەواڵی خوای مەزن و پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئێمە گەیشتوون كە خوا ئەو سیفەتانەی هەیە، وە ئەو سیفەتانەش لەگەڵ خوادا بێسەرەتا (أزلي) نین، بەڵكو لەوكاتەدا كە خوا ویستوویەتی و ویستی لەسەر بووە پەیدابوون.

## (3) ژمــارەی ســیفەتە خــەبەریی یەكان:

بەڕێزان!

دوای سەرنجدانی زۆر لە دەقەكانی قوڕئان و سوننەت و سەرجەم ئەو كتێب و بەرهەمانەی كە زانایان لەو بارەوە نووسیویانن، من دەوری چل و نۆ (49) سیفەت لەو سیفەتانەی كە زانایان بە (الصفات الخبرية) ناویان هێناون، سەرژمێرم كردوون، كە بە ڕیز بۆتان باس دەكەم بەڵام ئەو سیفەتانەم كردوە بە سێ بەشەوە:

أ ـ بەشێكیان ئەو وشانەن كە لە بەكارهێنانی ڕۆژانەی ئێمەدا بۆ ئەندامەكان (الأعضاء) بەكار دێن، واتە: ئەو وشانەی كە ئەگەر ئێمەومانان بەكاریان بێنین، مەبەستمان پێیان ئەندامە، وەك (وجه) واتە: دەموچاو، ڕوو، (يد) واتە: دەست، (عَيْن) واتە: چاو، ئەم وشانە لە بەكارهێنانی ئێمەدا بە مانای ئەندامەكانی جەستە دێن، بەڵام دیارە ئەگەر بۆ خوای پەروەردگار بەكاربێن، مانای ئەندام ناگەیەنن، بەڵكو سیفەتێك دەگەیەنن كە بۆ خوا شایستەیەو لێوەشاوەیە.

ب ـ بەشی دووەمیان، ئەو وشانەن كە لە بەكارهێنانی ئێمەومانا ندا ناون بۆ جموجۆڵ و هەڵسوكەوتەكان.

ج ـ بەشی سێیەمیشیان، ئەو وشانەن كە لە بەكارهێنانی ئێمەدا ناون بۆ حاڵەتە دەروونی و جەستەیی یەكان.

**بەشی یەکەم: لە سیفەتە خەبەرییەکان:**

(1) ( سیفەتی یەکەم، لە بەشی یەکەم) بریتیە لە: (وَجه) واتە: ڕوو، یان دەموچاو، وەك خوای بێوێنە دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ. وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلالِ وَالْإِكْرَامِ﴾[1] واتە: هەرچی لەسەر زەوییە لەنێو دەچێ بێجگە لە ڕووی پەروەردگارت کە خاوەنی دەسەڵات و ڕێزگرتنە. دیارە لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئان و فەرموودەدا باسی ڕوو (وجه) کراوە.

(2) (سیفەتی دووەم) بریتیە لە: (يَدْ) واتە: دەست وەك خوای زانا و توانا فەرموویەتی: ﴿قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾[2]، واتە: خوا فەرمووی ئەی ئیبلیس چ شتێك ڕێگەی لێگرتی کە کڕنووش بەری بۆ کەسێك کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە؟!

(3) (سیفەتی سێیەم) بریتیە لە: (عَيْن) واتە: چاو، کە لە چەند شوێنێکدا هاتوە، یەکێك لەو شوێنانە خوا دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾[3]، واتە: وە ئارام بگرە بۆ حوکمی پەروەردگارت، بێگومان تۆ بە چاوەکانی ئێمەی (هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: واتە: تۆ لەژێر چاودێری

---

(1) ( الرحمن – 27 ، 28 ) .
(2) ( ص – 75 ) .
(3) ( الطور – 48 ) .

ئێمە دای و ئێمە دەتبینین) وە پەروەردگارت بە پاك بگرەو ستایشی بکە لەو کاتەدا کە هەڵدەستی.

(4) (سیفەتی چوارەم) بریتیە لە (صورة) واتە وێنە، دیمەن. لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: ((اذا ضَرَبَ أ حدكم فَلْيَتَجنَّبِ الوَجْهَ، فأنَّ الله عزّوجلَّ خَلَقَ آدم على صُورَتِه﴾(٣٨)، وا تە: ئەگەر یەکێکتان لە کەسێکی دا، با خۆی لە دەم و چاوی بپارێزێ، چونکە خوای زاڵ و پایەبەرز، (ئادەم)ی لەسەر دیمەن و وێنەی خۆی دروست کردوە.

(5 و6) (سیفەتی پێنجەم و شەشەم) (رِجْلٌ و قَدَمٌ) وا تە: لاق و پێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((فأمّا النّارُ فلا تَمْتَلِيءُ حتى يَضَع اللهُ فيها رِجْلَهُ فَتقُولُ: قَطّ، قَطّ، قَطّ﴾(٣٩)، واتە: ئاگری دۆزەخ پڕ نابێت تا خوا لاقی خۆی تێدا دانەنێ، ئەو کاتە ئاگری دۆزەخ دەڵێ: (قط، قط، قط) واتە: هەرگیز جارێکی دی داوا نا کەم کە بڵێم پڕ نەبووم، وە هەندێك دەڵێن: ئەوە دەنگی دۆزەخە، کە خوای پەروەردگار لاقی لێ دادەنێ، ئەو دەنگەی لێ دێت دەر بارەی پێ (قدم)یش، هەر بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا تزالُ جهنَّم تَقُولُ هَلْ مِنْ مزيد!، حتّى يَضَعَ ربُّ العِزَّة فيها قَدَمَهُ

---

(٣٨) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه.

(٣٩) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه.

فَتَقُول: قطّ، قطّ، و عِزَّتِك و يُزْوى بَعْضُه الى بَعْضٍ))(٣٢)، واته: دۆزەخ بەردەوام دەڵێ: (هل من مزيد!) هی دیکەش ماوە بۆم بێنن! هەتا پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات پێی خۆی تێدا دادەنێت، ئەوکاتە دۆزەخ دەڵێ: (قط، قط) واتە: هەرگیز هەرگیز سوێند بە دەسەڵاتی تۆ داوا ناکەم، وە دۆزەخ هەندێکی دەچێتەوە نێو هەندێکی و بچووك دەبێتەوە.

(7) (سیفەتی حەوتەم) (ساق) واتە: لاق، قاچ لە ئەژنۆ بەرەو خوارەوە، هەڵبەتە بۆ ئێمە ئەوە دەگەیەنێ، نەك بۆ خوای بێوێنە چونکە بۆ خوا یان تەئویل دەکرێ، یاخود سیفەتێکە کە لە خوا دەوەشێتەوە، خوای بێوێنە دەربارەی (ساق) دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلا يَسْتَطِيعُونَ﴾(٣٣)، واتە: ئەو ڕۆژە کە لاق دەردەخرێ، وە بانگ دەکرێن بۆ کڕنووش بردن، بەڵام ناتوانن. (هەڵبەتە دوایی ڕوونیان دەکەینەوە کە مەبەست پێیان چیە؟!).

(8 و9) (سیفەتی هەشتەم و نۆیەم) (ساعِدٌ و كَفٌّ) باسك، لەپەدەست، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((فكل ما آتاك اللهُ لَكَ حِلٌّ وساعِدُ الله أشَدُّ مِنْ ساعِدِكَ، ومُوسى الله أحَدُّ مِنْ مُوساكَ))(٣٤)، واتە: هەرچی خوا بە تۆی داوە، بۆ تۆ حەڵاڵە، وە باسکی خوا لە

(٣٢) رواه البخاري و مسلم عن أنس بن مالك .
(٣٣) ( القلـم – 42 ) .
(٣٤) (إمام أحمد) لە (ابن الأحوصْ) ئەویش لە بابی یەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕاویانەتەوە.

باسكی تۆ بەهێزترە، وە تیغی خوا لە تیغی تۆ برِەندەترو تیژترە.
دەربارەی (كفّ) لەپەدەستیش، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[1]، واتە: وە وەك پێویست خوایان بە مەزن نەگرتوە، لە حاڵێكدا كە هەموو زەوی لە رِۆژی دواییدا خوا لە مستی گرتوەو لە دەستی وی دایە.

(10) (سیفەتی دەیەم) (أُصْبُع) واتە: پەنجە، قامك، لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما مِنْ قَلْبٍ الاّ وهو بين أُصْبَعَيْن مِنْ أصابِعِ ربِّ العالمين))[2]، واتە: هیچ دڵێك نیە، مەگەر لە نێوان دوو پەنجە دایە لە پەنجەكانی پەروەردگاری جیهانەكان.

(11) (سیفەتی یازدەهەم) (جَنْب) واتە: تەنیشت وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ وَإِنْ كُنْتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ﴾[3]، واتە: (تۆبە بكەن) نەوەك نەفسێك بڵێ: داخ و خەفەت بۆ من لەسەر ئەوەی كە لە تەنیشت (جنب)ی خوادا بەزایەمدا یان لە حەقی خوادا بە زایەمدا، وە من گاڵتەم بە دینی خوا دەكرد.

---

[1] ( الزمــر – 67 ) .
[2] امام احمد وابن ماجه والدارمي وابن خزيمة وابن حبان، وصحَّحه الحاكم و وافقه الذهبي، برِوانە كتێبی (الشريعة) الآجريّ، بەرگی/ 3 ، لاپەرە (1162).
[3] ( الزمــر – 56 ) .

(12) (سیفەتی دوازدەهەم) بریتیە لە: (حِقْو) واتە: کەلەکە، (حِقْو) بۆ ئێمە (کەلەکە)یە، بۆ خوای پەروەردگاریش سیفەتێکە کە لەو دەوە شێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ((إنَّ الله عزَّوجلّ خَلَق الخَلْقَ حتّى اذا فَرَغَ منهم قامَتِ الرَّحِمُ فأ خَذَتْ بِ حِقْو الرَّحمن، فقال: مَهْ، فقالَتْ هذا مَكانْ العائِذ مِنَ القطيعة، قال: نعم، أما تَرْضَيْنَ أنْ أصِلَ مَنْ وَصَلَك، وأقْطَعَ مَنْ قَطَعَك، قالت بلى، قال: فَذلك لكِ﴾(تر)، واتە:کاتێك خوای زاڵ و پایەبەرز هەموو شتەکانی دروست کردن و تەواوی کردن، پەیوەندی خزمایەتی (رحم) هەستا دەستی بە کەلەکە (حقو)ی خوا گرت، ئەویش فەرمووی: چیە؟! بۆچی وادەکەی؟! گوتی: ئەوە منم پەنام هێناوەتە بەر تۆ لەوەی کە بپچڕێنرێم و جێبەجێ نەکرێم، ئەویش فەرمووی: باشە، ڕازی نابی کە هەر کەسێك تۆی گەیاند، منیش بە ڕەحمەتی خۆمی بگەیەنم و وە هەرکەسێکیش تۆی پچڕاند، منیش ڕەحمەتی خۆمی لێ بپچڕێنم؟ گوتی: با ئەویش فەرمووی: دەتۆ ئەو مافەت هەبێت. هەڵبەتە دوایی باسی هەرکامێك لەو سیفەتانە دەکەین کە مەبەست چیەو زانایان چۆن تەئویلیان کردوون.

(تر) رواه البخاري و مسلم: عن ابي هريرة رضي الله عنه.

**بەشـی دووەم: لە سیفەتە خەبەرییەكان :**

كە وەك پێشتر گوتمان: ئەو وشانەن كە لە بەكارهێنانی ڕۆژانەی ئێمەدا ناون بۆ جموجۆڵ بەڵام بۆ خوای پەروەردگار ئەگەر بەكار بهێنرێن، سیفەتێكن كە لە خوا دەوەشێتەوەو مانای جموجۆڵ ناگەیەنن.

(1) (سیفەتی یەكەم) (الإستواء علی العرش) بەرزبوونەوە، یاخود چوونە سەر (عرش)، وەك خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾[1]. شایانی باسە لە (7) جێگا لە قورئاندا ئەم ڕستەیە دووبارە بۆتەوە.

(2) (سیفەتی دووەم) (النّزول الی السماء الدنیا) هاتنەخوار بۆ ئاسمانی نزیك، یاخود ئاسمانی سەر زەوی، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ینزل ربُّنا كلَّ لیلةٍ الی السماء الدُّنیا، حتّی حین یَبقی ثُلُث اللیل الآخر، یقول مِنْ یدعوني فأسْتَجیبَ لَهُ، مَنْ یَسْألُني فَأُعْطِیَه، مَنْ یَسْتَغْفِرني فَأغْفِرَ لَهُ))[2]، واتە: پەروەردگارمان هەموو شەوێك كاتێك سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنێ، دێتە خوار بۆ ئاسمانی دونیا، دەفەرموێ: كێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە، كێ داوام لـێدەكات تا پێی ببەخشم، كێ داوای لێخۆشبوونم لـێ دەكات تا لێی خۆش بم و لێی ببوورم.

---

[1] ( الأعراف 54 ) .

[2] رواه البخاري.

(3) (سیفەتی سێیەم) (المجيء والأتيان يوم القيامة) هاتن لە ڕۆژی دوایی‌دا وەك خوا (عزَّوجَّل) دەفەرموێ: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفّاً صَفّاً﴾[ ]، واتە: پەروەردگارت هات، وە فریشتەکان ڕیز ڕیز هاتن، دیارە لە ڕۆژی دوایی‌دا هاتنی فریشتەکان شتێکی ئاساییە، بەڵام ئێمە نازانین هاتنی خوای پەروەردگار چۆنە، بێگومان بە شێوەیەکە کە بۆ ئەو شایستەیە، وە خوا دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ﴾[ ]، واتە: ئایا چاوەڕێی چ دەکەن، جگە لەوەی کە خوا بێت لە چەند سێبەرێك لە هەوردا، وە فریشتەکانیش بێن وکاروبارەکان هەمووی تەواو ببڕێن (کە مەبەست لە ڕۆژی دوایی یە).

(4) (سیفەتی چوارەم) (العلو والفوقية) بەرزیی و لە سەروو بوون. وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾[ ]، واتە: ئایا دڵنیان لەو کەسەی کە لە ئاسمانە (لە سەرروویە) کە بە زەویتاندا بەرێتە خوارێ و لە کاتێکدا کە زەوی دەخولێتەوە؟! وە فەرموویەتی: ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[ ]، (باسی فریشتەکانە) واتە: لە سەروویانەوە

---

( ) ( الفجـر 22 ) .

( ) ( البقـرة – 210 ) .

( ) ( الملـك – 16 ) .

( ) ( الـنحـل – 50 ) .

لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن، وە هەر فەرمانێکیان پێ بکرێت ئەنجامی دەدەن.

(5) (سیفەتی پێنجەم) (الأحاطة) دەورەدان، دیارە ئێمە دەزانین کە بۆ ئێمە چ دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بۆ خوای بەرز سیفەت بێ، بە شێوەیەکە کە لە خۆی بوەشێتەوە. وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطاً﴾(تر)، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، هی خوایە، وە خوا دەورەی هەموو شتێکی داوە.

(6) (سیفەتی شەشەم) (المعّیة) لەگەڵ بوون، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا﴾(یر)، واتە: سرکەسرك‌و چپەی سێ کەس نیە، مەگەر خوا چوارەمیانە، وە هیچ پێنج کەسێك نین کە چپەو قسەی نهێنی بەیەکەوە بکەن، مەگەر شەشەمیان خوایە، کەمتر لەوەو زیاتر لەوەش نیە، مەگەر خوا لەگەڵیانە لە هەر شوێنێك و هەر جێگایەك بن.

(7) (سیفەتی حەوتەم) (قِبَلَ الوَجْه) بەرەو ڕوو بوون، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ أحَدَكُمْ اذا صلَّى، فأنَّ الله تعالى قِبَلَ وَجْهِهِ،

---

(تر) ( النســاء - 126 ).

(یر) ( المجـادلة - 7 ).

فلا يَتنَخَّمنَّ أحَدٌ منكم قِبَلَ وَجْهه في الصلاة))[تر]، واتە: کاتێك یەکێکتان نوێژ دەکات، خوای بەرزو بێوێنە بەرەو ڕوویەتی بۆیە با هیچ کەس بەرەو ڕووی تف فڕێ نەدات.

(8) (سیفەتی هەشتەم)و کۆتایی لە بەشی دووەم، (الهرولة) ڕا کردن، وە گورگەلۆقەشی پێدەڵێن، کە جۆرێکە لە ڕا کردن، بەڵام بە نەرمونیانی وەك لە فەرموودەی (قُدْسي)دا هاتوە، کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿مَنْ تقرَّب مَنّي شْبراً، تَقرَّبْتُ مِنْه ذراعاً، ومَنْ تقّربَ مِنّي ذِراعاً تقَّرْبتُ منه باعاً، ومَنْ أتاني يَمْشي أتَيْتهُ هَرْوَلةً﴾[ير]، واتە: هەر کەسێك بستێك لەمن نزيك بێتەوە، من باسكێك لێی نزيك دەبمەوە، وە هەر کەسێك باسكێك لە من نزيك بێتەوە، من باڵێك لەو نزيك دەبمەوە، وە هەرکەسێك بە ڕۆیشتن بۆ لای من بێت، من بە ڕاکردن بۆ لای دەچم، (کە ئەوەش بە تەئکید دەبێ تەئویل بکرێت، وەك دوایی باسی دەکەین).



(تر) رواه البخاري و مسلم عن عبدالله بن عمر رضى الله عنها .

(ير) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة (رضي الله عنه) .

## بەشـــی سـێیەم: لە سیفەتە خەبەرییە یەکان :

ئەو وشانەن کە لە بەکارهێنانی ئێمەدا ناون بۆ حاڵەتە دەروونیی و جەستەیی یەکان، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار ئەگەر بەکاربێن، چەند سیفەتێك دەگرنەوە کە لە خوا دەوەشێنەوەو بۆ ئەو شایستەن.

(1) سیفەتی یەکەم: (الكلام) قسەکردن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً﴾(تر)، واتە: وە خوا قسەی لەگەڵ مووسادا کرد بە قسەکردن.

(2) سیفەتی دووەم: (الضحك) پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يَضْحَكُ ربُّنا عزَّوجلّ الـى رَجُلَيْن يَقتُل أحَدَهُما الآخر، كلاهما يَدْخُل الجَنَّة، يَقاتِلُ هذا في سبيل الله تعالى فَيُقْتَلُ، ثم يَتُوب اللهُ عزّوجل على القاتِلِ، فيُقاتِل في سبيل الله فَيُستَشْهَدُ))(یر)، واتە: پەروەردگاری بالادەستو پایەبەرز بە دوو کەس پێدەکەنێت، (پێکەنینی ڕەزامەندیی) یەکێکیان ئەوی دیکە دەکوژێ، بەڵام هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت، یەکێکیان لە ڕێی خوادا جەنگ دەکاتو دەکوژرێ بە دەستی کافرێك (مادام لە ڕێی خوادا کوژراوە دەچێتە بەهەشت) دوایی خوای بالادەست ئەو کافرە بکوژەش هیدایەت دەدات بۆ ئیسلامو تۆبە دەکات، خواش تەوبەکەی گیرا دەکاتو لێی خۆش دەبێت، ئەویش لە ڕێی خوادا جەنگ دەکاتو شەهید دەبێتو

---

(تر) (النسـاء 164).

(یر) رواه البخاري ومسلم وأحمد ومالك وغيرهم عن أبي هريرة، بڕوانە کتێبی (الشريعة) للآجري بەرگی/ 2، لاپەڕە (1052).

هەردووکیان دەچنە بەهەشت!

(3) سیفەتی سێیەم: (الفَرح) خۆشحاڵیو شادمانی، بۆ ئێمە ئەوە دەگەیەنێت بۆ خوای پەروەردگاریش سیفەتێکە کە لە خۆی دەوەشێتەوە، کە نازانین چۆنە، گرنگ ئەوەیە بە شێوەیەکە بۆ خوا شایستە بێت. وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ((اَللَّهُ أَشَدُّ فَرَحاً بِتوبَةِ عَبْدِه مِن احدكم يَستَيْقِظُ علی بَعيرِه، قَدْ أضَلَّه بِأرضٍ فَلاةٍ))(3)، واتە: بێگومان خوا خۆشحاڵترە، بە گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی بەندەکەی بۆ لای لە یەکێك لە ئێوە کە وشترەکەی ون کردوە لە بیابانێکدا کە هاواری ناگاتە کەس،(لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: هەرچی خواردن و خۆراك و ئاو و پێداویستی هەیە، هەمووی لەسەر پشتی ئەو وشترەیە، بەڵام لێی بزر دەبێت) دوایی دەخەوێتو کە خەبەری دەبێتەوە سەیر دەکات و وشترەکەی بە بارەکەیەوە لە بەردەمی دایە، بێگومان زۆر خۆشحاڵ دەبێت.(وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێ لە خۆشیان دەڵێ: ئەی خوایە! تۆ بەندەی منیو من پەروەردگاری تۆم، لە خۆشیان لێی تێك دەچێت)، جا خوای پەروەردگار لەو کەسە زۆر خۆشحاڵترە بەوەی کە عەبدەکەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ لایو تۆبە دەکاتو واز لە تاوان دێنێت.

(3) رواه البخاري ومسلم عن أنس: والبيهقي في (الأسماء والصفات) بەرگی/2،لا پەڕە (229).

(4) سیفەتی چوارەم: (الصبر) خۆڕاگریی، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((لَيْسَ أَحَدٌ، أو قال: ليس شيءٌ أصْبَرَ على أذىً يَسْمَعُهُ مِنَ اللهِ عزَّوجل، إنَّهم ليدَّعون لَه ولداً، وإنَّه ليُعافيهم وَيرزُقُهم))[٦٢]، واتە: هیچ کەس، یان هیچ شتێك خۆڕاگرتر نییە لە بەرانبەر ئازارێکدا یان قسەیەکی ناخۆشدا کە دەیبیستێ، لە خوای باڵادەستو پایەبەرز، ئەوان ڕۆڵەی پاڵدەدەنە لا، (دەڵێن خوا کوڕو کچی هەیە) کەچی لەگەڵ ئەوەشدا (کە خوا ئەو قسە بێتامانەیان لێ دەبیستێ) سەلامەتیان دەکاتو ڕزقو ڕۆزیی یان دەدات!.

(5) سیفەتی پێنجەم: (الغَضَبْ) تووڕەیی. وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَوَلَّوْا قَوْماً غَضِبَ اللَّهُ عَلَيهِم﴾[٦٣]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، دۆستایەتی کۆمەڵێك مەکەن کە خوا لێیان تووڕە بووە. وە لە فەرموودەیەکی (قدسي)دا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿سَبَقَتْ رحمتي غَضَبي﴾[٦٤]، واتە: بەزەیی من پێش تووڕەییم کەوتۆتەوە.

(6) سیفەتی شەشەم: (التَعَجُّبْ) سەرسام بوون، سەر سوڕمان. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((عَجِبَ الله عزَّوجل مِنْ قَومٍ بأيديهم السَّلاسِلُ حتّى يَدخُلوا الجنَّة))[٦٥]، واتە: خوای باڵادەست و پایەبەرز،

---

(٦٢) رواه البخاري و مسلم عن ابي موسى الأشعري .

(٦٣) (الممتحنة 13) .

(٦٤) البخاري و مسلم، کتێبی (السنة) لابن ابي عاصم، بەرگی/ 1 ، لاپەڕە (417) .

(٦٥) البخاري عن ابي هريرة .

سەرسام بوو، سەری سوڕما، لە کۆمەڵێك زنجیریان لە دەست و پێیان دایەو دەچنە بەهەشتیش (ئەوانە کەسانێکن کە لە شەڕی مسوڵمانان بەدیل دەگیرێن‌و کەلەپچە دەکرێن، دواییی مسوڵمان دەبن‌و دەچنە بەهەشت، یاخود هەر بەدیلی مسوڵمان بوون‌و هەر بەدیلی کەلەپچەیان لە دەست‌وپێ دایە دەمرن‌و دواییی خوای بەبەزەیی دەیانباتە بەهەشت)، دیارە (تعجُّب) بۆ ئێمە واتە: سەرسام بوون، ئێمە بە شتێك سەرسام دەبین، کە پێشتر نەمانزانیبێت‌و دوایی بۆمان دەرکەوتبێت، ئنجا پێی سەرسام دەبین، جا بێگومان خوا هیچ شتێك نیە نەیزانێت و دوایی بۆی دەربکەوێت، ئەدی ئەوە مانای چیە؟! دیارە حەتمەن دەبێ تەئویل بکرێت.

(7) سیفەتی حەوتەم: (الرِّضى) ڕازی بوون، خوای مەزن لە زۆر ئایەتی قورئاندا ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ یەکێ لەو شوێنانەی لە سورەتی (التوبة) کە باسی کۆچکەران (مهاجرين)و پشتیوانان (أنصار) دەکات، وە ئەوانەی بە چاکی شوێنیان کەوتوون، دەفەرموێ: ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە[*]: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾.

---

(*) (التوبة - 100).

(8) سیفەتی هەشتەم: (المحبّة) خۆشویستن وەك خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾(تر)، واتە: خوا ئەوانی خۆش دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت. بۆ ئێمە خۆشویستن بە دڵە و دەزانین چۆنە، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار چۆنە؟ خوا هەر بۆ خۆی دەزانێ، گرنگ ئەوەیە خوا لە چەندین ئایەتدا، وە پێغەمبەر ﷺ لە زۆر لە فەرموودەکانیدا ئەم سیفەتی خۆشویستنی خوا بۆ بەندەکانیو خۆشویستراني خوا لەلایەن بەندەکانی یەوەیان ڕاگەیاندوە.

(9) سیفەتی نۆیەم: (الكراهية) ڕق لێبوونەوە، بوغزاندن وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا الْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُ عُدَّةً وَلَكِنْ كَرِهَ اللَّهُ انْبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُوا مَعَ الْقَاعِدِينَ﴾(یر)، واتە: ئەگەر دەغەڵەکان (منافقين) ویستبایان دەربچن بۆ جەنگی تەبووك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێداویستی یەکانیان بۆی ئامادە دەکرد، بەڵام خوا پێی ناخۆش بووو ڕەقی لەوە بوو کە دەربچن، بۆیە دڵی خاو کردنەوەو پێیان گوترا: دانیشن لەگەڵ دانیشتووان. (وە هەڵمەستن لەگەڵ جەنگاوەران و مەڕۆنە دەرەوە).

(10) سیفەتی دەیەم: (الغَيْرَةَ)، ئەم وشەیە ماناو واتایەك کە پڕ بە پێستی بێت بۆم نەدۆزیوەتەوە، بەڵام (غیرة) بەوە دە گوترێ کە پیاوێك پێی ناخۆش بێت خەڵك سەیری هاوسەرەکەی بکات، یان

(تر) (المائدة 54).

(یر) (التوبة 46).

ئافرەتێك پێی ناخۆش بێت پیاوەكەی سەیری ئافرەتێكی دی بكات، ئەگەر بە كوردی بڵێین: بەتەنگ نامووسەوە بوون، بە تەنگ ئابڕووەوە بوون، بە تەنگ كەرامەتەوە بوون ڕەنگە، گونجاو بێت. من بۆیە ئەو واتاو تەعبیرە كوردی یەی و شەی ( غیرة)م بۆ خوای پەروەردگار بەكارنەهێنا، چونكە بۆ خوا شایستە نیە، مەگەر بڵێین: بە تەنگ قەدەغەكراوەكانەوە بوون، چونكە ئەو فەرموودە یەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەگەیەنێت كە فەرموویەتی: ((ان الله تبارك و تعالى یَغارُ، وإِنَّ المُؤْمِنَ یَغارُ، وغَیْرَةُ اللهِ أَنْ یأتي المُؤمِن ما حرَّم الله علیه))(تر)، واتە: خوای بەرزو مەزن (غیرة)ی هە یەو ئیما نداریش (غیرة)ی هەیە، (غیرة)ی خوا ئەوەیە كە ئیماندار شتێك بكات كە خوا لێی حەرامو قەدەغە كردوە.

(11) سیفەتی یازدە یەم: (النِّسیان) لەبیرچوونەوە، بۆ ئێ مە لەبیــرچوونەوە، بەڵام بۆ خوای بەرزو بێوێنە كە لە چەند شوێنێك بەكار هێ نراوە، حە تمەن دە بێ تەئویل بكر ێت، چونكە خوا لەبیــرچوونەوەی نیە. خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الفَاسِقُونَ﴾(یر)، واتە: مونافیقەكان خوا یان لەبیــرچۆوە، وە خواش ئەوانی فەرامۆش كرد، (نابێ ب ڵێین: خواش

(تر) البخاري و مسلم عن أبي هريرة (رضى الله عنه).

(یر) ( التوبــة – 67 ).

ئەوانی لەبیــرچۆوە، خوا هیچی لەبیــرناچێتەوەو هیچی لــێ پەنهان نابێت).

(12) سیفەتی دوازدە یەم: (المَکر) فێڵ، وەك خوای باڵادە ست فەرموویەتی: ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾[1]، واتە: ئەوان فێڵیان کرد، خواش فێڵی کرد، بێگومان خواش باشترین فێڵ زانە. لێرەدا و شەی (فێڵ) بۆ ئێمە ئەوە یە کە شتێك بە کەی بەرانبەرەکەت پێت نەزانێت، خوای مەزن کە ئەم و شەی فێڵ (مکر)ی بەکارهێناوە، زانایان دەڵێن: ئەم وشەیەو هاو واتاکانی ئەم وشەیە (مکر، کید، خداع) ئەوانە هەمووی لەگەڵ بەرانبەرەکانیاندا نەبێ دروست نیە بەکاربهێنرێن بۆ خوا، دروست نیە بگوترێ: خوا فێڵ (مکر)ی کرد، دەبێ بگوترێ: ئەوان فێڵیان کردو خواش فێڵی کرد، جا لێرەدا، واتە پووچاندنەوەی فێڵی ئەوان یان وەلامدانەوەی فێڵی ئەوان، ئەگەرنا خوا فێڵ ناکات بەو چەمك و واتایەی کە ئینسان فێڵ دەکات، چونکە ئەوە سیفەتێکی پەست (مذموم)ە، بەڵام خوا فێڵی کافران هەڵدەوەشێنێتەوە.

(13) سیفەتی سێزدەیەم: (الکَید) پیلان، کە لەگەڵ (مەکر) لە یەك نزیکن، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْداً. وَأَكِيدُ كَيْداً﴾[2]، واتە: ئەوان پیلان دەگێڕن، وە منیش پیلان دەگێڕم،

[1] ( آل عمـران 54 ).

[2] ( الطارق - 15،16 ).

(پیلان گێڕانی ئەوان دیارە، بەڵام پیلان گێڕانی خوا بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی پیلانی ئەوان‌و جگە لەو مانایە دروست نیە بۆ خوا بەکاربهێنرێت).

(14) سیفەتی چواردەیەم: (الخِداع) فریودان، هەڵخەڵەتاندن. وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ﴾(تر)، واتە: مونافیقەکان (بە خەیاڵی خۆیان) خوا فریودەدەن‌و هەڵدەخەڵەتێنن، بەڵام خوا ئەوان فریو دەدات. وەك لە باسی ناوە چاکەکانی خوادا باسمان کرد، کە هەر کامێك لەو سیفەتانە (مکر، کید، خداع)، ئەوانە دەبێ بگوترێ: سیفەتێکن بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیەو ناگونجێ بکرێنە ناو بۆ خوا، واتە: ناگونجێ بگوترێ خوا ناوی (ماکر)ە، یان (کائد)ە، یان (خادع)ە.

(15) سیفەتی پازدەیەم: (الأرصاد) لەکەمین دابوون، لە بۆسە دابوون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ﴾(یر)، واتە: بێگومان پەروەردگاری تۆ لە بۆسە دایە (بۆ کافرو تاوانباران)، لە بۆسەو کەمین دابوونی ئێمە دیارە چۆنە، بەڵام لە بۆسەو لە کەمین دابوونی خوای بێ‌وێنە، یان دەبێ بگوترێ: بە شێوەیەکە کە خوا بۆ خۆی دەزانێ، یان دەبێ تەئویلی بکەین و بڵێین: لە بۆسەدابوون واتە: خوا چاوەڕێیە بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی بەندەکانی.

---

(تر) (النساء: 142).
(یر) (الفجر: 14).

(16) سیفەتی شازدەیەم: (النَّفَس) هەنا سە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ألا إنَّ الأيمانَ يمانٌ، والحكمَةَ يمانٌ وأجِدُ نَفَس ربكم مِنْ قِبَلِ اليَمنِ))(تۆ)، واتە: ئاگاداربن ئیمانەکە یەمەنی یە، حیکمەت و لێزانی یەکەش یەمەنی یە، وە من هەست بە هەناسەی پەروەردگارتان دەکەم لەلای یەمەنەوە، هەناسە (نَفَس) بۆ ئێمە دیارە چۆنە، بەلاَم هەناسەی خوای بەرزو بێوێنە، بە تەئکید دەبێ تەئویلی بکەین، بۆیە سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن و ئەمەیان تەئویل کردووەو دەڵێن: مەبەست لە هەناسە واتە: دەروو لێکرانەوەو لە فریا هاتن، چونکە لە جەنگەکانی هەڵگەڕانەوە (رِدَّة)دا، مسوڵمانانی یەمەن زۆرباش لە فریای ئیسلام هاتن و خوای بە بەزەیی بەهۆی ئەوانەوە دەرووی لە مسوڵمانان کردەوە.

(17) سیفەتی حەڤدەیەم: (التـردّد) دوو دڵی، دڵ لە دڵ دان، بۆ ئێمە دیارە وەك ئەوە کە جاری وا هەیە لە دوو دڵی دای لە بەرانبەر کردنی ئیشێك و نەکردنیدا، بەلاَم ئەوە بۆ خوای مەزن دروست نیەو دەبێ تەئویل بکرێ، وەك لە فەرموودەی (قدسي)دا هاتوە، کە خوای بەخشندە فەرموویەتی: ((وما تردَّدْتُ عن شيء أنا فاعِلُهُ تَرَدُّدي عن قَبْضِ نفسِ المؤمن يكره الموت وأكره مسائتَهُ))(یه)، واتە: لە هیچ

(تۆ) الأمام أحمد عن أبي هريرة، والبخاري في (التأريخ الكبير) وصحيح كما قال مؤلّف (مجمع الزوائد).

(یه) البخاري عن أبي هريرة.

شتێك دوو دڵ نەبووم كە كردبێتم، وەك دوودڵیم لە گ یان كێ شانی بڕوادارێدا، ئەو پێی ناخۆشە بمرێ و منیش پێناخۆش بوونی ئەوم پێ ناخۆشە، بەڵام هەردەبێ بشیمرێنم. زانایان هەموو یەك دەن گن كە دەبێ ئەوە تەئویل بكرێت، كە مەبەست ئەوەیە خوای بێ هاوەڵ لە لایەكەوە پێی ناخۆشە ئەو بەندە بڕوادارەی ئازار بدات، وە لە لایەكیشەوە هەر پێویستە گیانی بكێشێت، چونكە ژ یانی دون یای كاتی‌یە، جا ئەو حاڵەتەی بە (تردّد) ناو بردوە، كە ئێمە ئاوای لێ حاڵی دەبین، بەڵام بێگومان بە نسبەت خوای بەرزو مەز نەوە ئەو واتایەی هەیە كە باسمان كرد، واتە: شتێك دوو پاڵنەری دژ بەیەكی هەبن، پاڵنەرێك كە دەبێ بكرێ، پاڵنەرێكیش كە دەبێ نەكرێ دیارە ئەوە وەك دوو دڵی دەچێت.

(18) سیفەتی هەژدەیەم: (الأستحیاء) شەرم كردن، ئەمەش دیارە بۆ ئێمە چۆنە، ئەوەیە كە ئینسان ڕووی نایەت شتێك بكات.، بۆ خوای پەروەردگاریش دەبێ بڵێین: سیفەتێكە كە لە خوا دەوەشێتەوە، یان دەبێ تەئویل بكرێت، كە زۆرینەی زانا یان وا یان كردوە لەوا نە (بیهقي)یە، ئەم فەرموودەیەش لەو بارەیەوەیە: ((بینما ر سولُ الله ﷺ قاعدٌ في أصحابه إذ جاءه ثلاثة نَفر، فأمّا رَجُلٌ فوجَد فُرجةً في الحَلقةِ فَجلَس، وأما رَجُلٌ فَجلَس، يعني: خَلْفَهُمْ، وأمّا رَجُلٌ فَانْطَلق، فقال رسولُ الله ﷺ : ألا أُخبِرُكم عن هؤلاءِ النَّفر!، أما الرجل الذي جلَس في الحلقة فَرجلٌ أوى فآواه اللهُ، وأما الرجُل الذي جَ لَس خَ لْف

الْحَلْقَة فَآستحْى، فَآستَحْى الله منه، وأما الرَّجل الذي آنْط لَقَ فر جل أَعْرَضَ فَأَعرضَ الله عَنْهُ))(٣٢)، واته: له کاتێ کدا پێغەمـ بەر ﷺ لەنێو هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، سێ کەس هاتن بۆ لای، پیاوێک یان بۆشاییەکی لە کۆڕەکەدا (لە بازنەی دانیشتنەکەدا) بینی و لەوێدا دانیشت، ئەوەی دووەمیشیان دانیشت: واتە جێگای نەبۆوەو لە پشت بازنەی دانیشتنەکەوە دانیشت، ئەوەی سێیەمیـ شیان کە زا نی جێگەی نەبۆوە یەکسەر ڕۆیشت، پێغەمـ بەر ﷺ فەرمووی: ئا یا هەواڵی سێ کە سەتان پێ ب ڵێم؟ (وا تە: لە ڕووی شەرعەوە هەڵوێستەکانیان چۆن هەڵدە سەنگێنرێ؟!). ئەوەیان کە لە ن ێو بۆشایی بازنەکەدا دانیشت، ئەوە پیاوێکە پەنای بۆ خوا هێناو خواش پەنای دا، ئەوەشیان کە لە پشتی باز نەی دانیـ شتنەکەوە دانیـ شت شەرمی کرد، خواش شەرم (حـ یاء)ی لـێ کرد، بەڵام ئەوەی سێیەمیان کە ڕۆیشتو پشتی هەڵکرد، خواش پـ شتی تێکرد.

بێگومان هەم ڕستەی: (خوا شەرمی لـێ کرد) وە هەم ڕستەی (خوا پشتی تێ کرد) دەبێ هەردووکیان تەئویل بکرێن، جا هەندێك لە زانایان ئاوای (تەئویل) دەکەنو دەڵێن: وەکو چۆن ئەو پـ یاوە ڕووی نەبوو جێگا بەو خەڵکە سەغڵەت و نارەحەت ب کات، وەك ب ڵێی: خوای پەروەردگاریش ڕەحمەتو بەزەیی یەکەی ڕێگای نادات کە لێی

(٣٢) رواه البخاري ومسلم عن أبي واقد الليثي.

خۆش نەبێت‌و سزای بدات‌و بەزەیی پێیدا نەیەتەوە، دیارە مەبەست لە (پشت تێکردن)یش گوێ پێ نەدان و ئەمیەت پێنەدانە.

(19) سیفەتی نۆزدەیەم: (السخرية و الأستهزاء) گاڵتەو گەمەپێکردن. خوای کاربەجێ و زاڵ لە چەند شوێنێکدا ئەو دوو وشەیەی هێناون، بۆ وێنە: فەرمووویەتی: ﴿اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ﴾[ت] ، واتە: خوا گاڵتە بە دەغەڵەکان (منافقين) دەکات، وە دەفەرموێ: ﴿فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[ث]، واتە: مونافیقەکان گاڵتە بە ئیمانداران دەکەن (کە ماڵ دەبەخشن، ئەوەی زۆری بەخشی بایە دەیانگووت ڕیابازیی دەکات، ئەوەی کەمیشی بەخشیبایە دەیانگوت خوا پێویستی بەو کەمە نیە)، جا دەفەرموێ: گاڵتەیان پێ دەکەن، بەڵام خوا گاڵتەیان پێ دەکات (یاخود خوا گاڵتەیان پێ بکات) وە سزایەکی سەختیان بۆ هەیە، دیارە گاڵتەو گەمە پێکردنیش لەو سیفەتانەیە وەك: (مکر، کید، خداع) کە لە بەرانبەر (مقابل)دا نەبێت، دروست نیە بۆ خوا بەکاربهێنرێن، واتە خوا سزای گاڵتەو گەمە پێکردنەکەیان دەداتەوە، یاخود خوا بە شێوەیەك ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکات وەك کە سێك کە گاڵتەیە بە کە سێك بکات، مونافیقەکان بەوەی کە مسوڵمانەتییان بە ڕواڵەت دەربڕیوە، چونکە لە ژیانی دنیادا بە پێی شەریعەتەکەی چاوپۆشییان لێ دەکات‌و

(ت) ( البقرة 15 ).
(ث) ( التوبة 79 ).

وەك مسوڵمان مامەڵەیان لەگەڵ دەكات. بەڵام لە دوارۆژدا سزایان دەدات!

(20) سیفەتی بیستەم: (الـ ظِّل) سێبەر وەك لە سەرەتای فەرموودەیەكی درێژدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((سبعة يظِلُّهم الله في ظِلِّه يوم لاظِلَّ الاّ ظِلُّه))(١)، واتە: حەوت جۆرە كەس خوا سێبەریان لێ دەكات، بە سێبەری خۆی، لە ڕۆژێكدا كە جگە لە سێبەری خۆی سێبەرێكی دی نیە. بێگومان خوای بێوێنە جەستە (جسم) نیە، تاكو سێبەری هەبێت ئەدی ئایا ئەو سێبەرە مەبەست پێی چیە؟! زۆرینەی زانایان یەك دەنگن لەسەر تەئویل كردنی وەك دەڵێن: كە دەگوترێ فلان دەستەڵاتدارە فلان كەسی خستە ژێر سایەو سێبەری خۆیەوە، واتە: لە پەنای بەزەیی خۆیدا حاواندییەوەو پەنایدا لە مەترسی، خوای پەروەدگاریش دەیانخاتە ژێر پەناو بەزەیی خۆیەوەو دەیانپارێزێ لە سزاو ئازارو مەینەتییەكانی ڕۆژی دوایی. ئەگەر سێبەریش هەر بە ڕواڵەتی خۆی بیهێڵینەوە دەبێ بڵێین: سێبەرێك كە بۆ خوا شایستەیەو هەر لەو دەوە شێتەوەو وەك سێبەری دروستكراوە مادديیەكان نیە.

(21 و 22 و 23 و 24) سیفەتی (بیست و یەكەم، بیست و دووەم، بیست و سێیەم، بیستو چوارەم): بریتین لە ( صیرورته سبحانهُ: سَمعاً، و بَصَراً، وَیَداً، و رِجلاً) واتە: خوای پاكو بێ گەرد، ببێتە:

---

(١) رواه البخاري ومسلم عن أبي هريرة.

بیستن و دیتن و دەست و لاق. لە فەرمووودەیەکی درێژدا کە بە کورتی ماناکەتان بۆ دەکەم، کە فەرمووودەیەکی (قدسي)یە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: هەرکەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکات، ئەوە جەنگی لەگەڵ من پەرپا کردوە، وە بەندەی من بە هیچ شتێك خۆشەویست تر لەلای من لە من نزیك نابێتەوە بەوەی کە لە سەرم فەرز کردوە، وە بەردەوام بەهۆی ئەنجامدانی سوننەتەکانەوە لێم نزیك دەکەوێتەوە تاکو خۆشم دەوێت، جا ئەگەر خۆشم ویست، ((كنت سَمْعَهُ الذي يَسْمَعُ به، وبَصَرَهُ الذي يُبْصِرُ به، وَ يَدهُ التي يُبْطِشُ بِها، و رِجْلَه التي يَمشي بِها))[؟]، واتە: (هەرکاتێك خۆشمویست)، دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە شتی پێدەگرێ و ئەو لاقەی کە پێی دەڕوات و هاتوچۆی پێ دەکات. دیارە لێرەش هەموو زانایان یەك دەنگن کە خوا نابێتە گوێ و چاو و دەست و لاقی ئینسان، وە هەموویان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەم فەرمووودەیە ئەوەیە کە: ئینسان بە هۆی جێبەجێکردنی فەرزەکان و پاشان جێبەجێکردنی سوننەتەکانەوە دەبێتە خۆشەویستی خواو، کاتێك بوو بە خۆشەویستی خوا، ئیمانەکەی وا دامەزراوو مەحکەم دەبێت کە ئەندامەکانی: چاوی، گوێی، دەستی، لاقی، وە هەموو ئەندامەکانی دیکەشی لە ڕەزامەندیی خوادا نەبێ کار ناکەن و، چاو

(؟) رواه البخاري عن أبي هريرة رضي الله عنه.

هەر بۆ ئەو شتانە دەڕوانێ کە خوا پێی خۆ شەو گوێی هەر ئەوشتانە دەبیستێ کە خوا پێی خۆشە و دەست هەر ئەو جموجۆڵانە دەکات کە خوا پێی خۆشن و لاقیش هەر بۆ ئەو شتانە هەنگاو دەنێ کە خوا پێی خۆشن... هتد، تێکڕای زانایان ئاوا تەئویلیان کردوە.

(25 و26 و27) سیفەتی (بیستو پێنجەم، بیستو شەشەم، بیستو حەوتەم): کە بریتین لە (المَرَض، الجُوع، العَطَش) نەخۆ شییو برسێتیو تینوێتی. لەو بارەشەوە فەرموودەیەکی قودسی هەیە کە ئەمە ماناکەیەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو یەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا خوای زاڵ و پایەبەرز دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد، نەخۆش بوومو سەردانت نەکردم! ئەویش دە لێ: ئەی پەروەردگارم چۆن سەردانی تۆ بکەم کە تۆ پەروەردگاری جیها نەکانی؟ دە فەرموێ: ئەدی نەتزانی کە فلان بەندەی من نەخۆش بوو، سەردانت نەکرد، ئاگاداربە، ئەگەر سەردانت کردبایە منت لەلای ئەو دەبینی (وا تە: پاداشتی من و ڕەزامەندی منت لای ئەو دەبینی، دەبێ ئاوا تەئویل بکرێت). (هەروەها دەفەرموێ) ئەی ئادەمیزاد! داوای خواردنم لێ کردو خواردنت پێ نەدام!، دەڵێ: پەروەردگارم چۆن خواردنت پێبدەم کە تۆ پەروەردگاری جیهانەکانی؟ دەفەرموێ: ئەی نازانی، فلان بەندەیەم داوای خواردنی لێکردیو خواردنت پێ نەدا، ئاگادار بە ئەگەر خواردنت پێی دابا یە، ئەوە پادا شتی ئەوەت لای ئەو

دەبینییەوە، (وە دەفەرمویَ:) ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوم لێ کردو ئاوت پیَ نەدام! ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم چۆن ئاوت پێ بدەم کە تۆ پەروەردگاری جیهانەکانی، دەفەرمویَ: فلان بەندەیەی من داوای ئاوی لێ کردیو ئاوت نەدایە، ئاگاداربە، ئەگەر ئاوت دابایە، پاداشتی ئەوەت لای من دەبینییەوە(٣٣)، کەواتە: خوای پەروەردگار لەم فەرموودە (قدسي)یەدا ئەو وشانەی کە بەکاری هێناون و ئەو سیفەتانە دەگەیەنن کە لێی ناوەشێنەوە، هەر بۆخۆشی تەئویلی کردوون، واتە: خوای کاربەجێ فێری کردووین کە چۆن ئەو جۆرە شتانە تەفسیرو مانا بکەین، مەبەست لە نەخۆش بوونی خوا، واتە: بەندەیەکی خوا نەخۆش بوو، وە برسی بوونو تینووبوونی خوا، واتە: بەندەکانی خوا برسیو تینوو بوون. کەواتە، ئەوە ڕێبازێ کە بۆ تەئویل کردنی هەموو ئەو سیفەتانەی دیکەش کە لە خوا ناوەشێتەوەو بۆی شایستەنین، دەبێ بەم شێوەیە مانایان بکەین، ئەگەرنا واتا ڕواڵەتییەکەیان لەگەڵ خوادا ناگونجێ.

(28) سیفەتی بیست و هەشت: (التَقدُّر) بێز لێبوونەوە، قێزەونی، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویَ: ((ستكون هجرة بعد هجرة، فخيار أهل الأرض أَلزَمَهُم مَهاجِرَ إبراهيم، وَيبقى في الأرض شرار أهلها تَلفَظُهُم أَرضهُم تَقذِرُهُم نَفسُ الله (عزّوجلّ) وَتحشُرهم النار مع القِرَدَة

(٣٣) رواه مسلم عن أبي هريرة رضى الله عنه، بڕوانە: (صحيح مسلم ص (1389)، برقم: 2569).

والخَنازِير﴾[تر]، واتە: کۆچ لە دوای کۆچ دەبێت بۆ بڕواداران (بڕواداران هەمیشە دەبێ لە کۆچ و باردابن، وەك سەردەمی ئەمڕۆ) جا باشترینی خەڵکی سەر زەوی ئەوانەن کە پەیوەست دەبن بەو شوێنانەی کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێ) کۆچی بۆیان کردوە (ئیبراهیم کۆچی بۆ شام و میسرو حیجاز کردوە، واتە مسوڵمانانی باش بەزۆری لەو شوێنانە دەمێننەوە) ئەمجا دەفەرمویێ: خراپترینی خەڵکی لەسەر زەوی دەمێننەوە، لەوکاتەدا، زەوی فڕێیان دەدات (وەك کە پارووێك بێزت لێی هەڵدەستێ و فڕێی دەدەیەوە دەرێ زەویش ئاوا فڕێیان دەدات) (تَقذِرُهُم نَفسُ اللهِ) نەفسی خوای زاڵو پایەدار بێزی لێیان دەبێتەوە (لەو خەڵکە خراپە) ئاگری ڕۆژی دوایی، ئەوانە لەگەڵ مەیموون و بەرازەکاندا کۆدەکاتەوەو ڕێك یان دەدات. جا دیارە بێز لێ‌هەڵسانیش بۆ ئێمە دەزانین چۆنە بەڵام بۆ خوای بەرزو مەزن بە تەئکید دەبێ تەئویل بکرێت، ئەویش ئەوەیە: کە خوا پێیان ڕازی نیەو ڕقی لێیان دەبێتەوە.

(29) سیفەتی بیست و نۆیەم: (المَلال) بێزاریی. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿علیکم بما تُطیقون، فَواللهِ لا یَمَلُّ اللهُ حتی تَمَلُّوا﴾[یر]، واتە: ئەوەندە کردەوەی باش بکەن کە لە تواناتاندا هەیە، سوێند بە خوا، خوا بێزار نابێت، تا ئێوە بێزار نەبن (واتە: خوا

(تر) رواه أبو داود عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما.

(یر) رواه البخاري ومسلم عن عائشة رضي الله عنها.

بێــزار نابێت لە پاداشت دانەوەتان، تا ئێوە لە طاعەتکردن ماندوو نەبن) چەمکی پێچەوانە (مفهوم المخالفة)ی ئەم فەرموودەیە، ئەوەیە کە کاتێك ئێوە بێــزار بوون لە عیبادەت و طاعەت، خواش ماندوو دەبێت لە پاداشت دانەوەتان!، بەڵام بێگومان خوا بێــزار نابێ، بۆیە سەرجەم زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەم فەرموودەیە تەئویل بکرێت بەوەی کە مەبەست ئەوەیە: خوا هەرگیز بێــزار نابێت، هەرچەندە ئێوە هەر کارو کردەوەی باش بکەن، خوا هەر بێــزار نابێت و نابێ ئەو چەمکە پێچەوانەیەی لــێ بگیرێت کە لە ڕواڵەتەکەیدا دیارە.

جا بەڕێزان!

ئەوە سەرجەم ئەو (49) چل‌ونۆ سیفەتە خەبەرییە (الصفات الخبــرية) بوون، کە پاش سەرنج‌و تەماشای زۆر لە قورئان‌و سوننەت بەرچاوم کەوتوون‌و ناشڵێم هیچ دیکەشیان تێدانین، بەڵام ئەمانە زەق و دیارەکانیان‌و زۆربەی هەرە زۆریان.

## حاڵی سێیەم:

## سێ جۆرە هەڵوێست لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەكاندا

## دووی چەوت و یەكی ڕاست

خوێنەرانی خۆشەویستو سەنگینم!، وەك پێشتر باسمان كرد، لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەكان (الصفات الخبرية)دا، كە بریتین لەو سیفەتانەی خوای پەروەردگار كە لە ڕێگەی (وحي) یەوە پێمان گەیشتوون، لە بەرانبەر ئەو سیفەتانەدا كە ئایا تەئویل بكرێن؟! یان نەكرێن؟ وە ئایا (إثبات) بكرێن بۆ خوا، یاخود لێی (نفي) بكرێن؟ بە گشتی سێ جۆرە هەڵوێست هەن، جا یەكێك لەو هەڵوێستانە هەڵوێستێكی ڕاست و میانەیەو دوو هەڵوێستیشیان هەڵەو دژ بەیەكن كە یەكێكیان تێپەڕێنەرەو یەكێكیان كورت هێنەرە (موقفان متضادان مفرِط و مفَرّط). جا ئێمە سەرەتا ئاماژە دەكەین بە دوو هەڵوێستە دژ بەیەكە هەڵەكان بە كورتی، پاشان دێینە سەر هەڵوێستی ڕێكو ڕاستو دروست و شەرعی، كە هەڵوێستی زاناو پێشەوایانی ئیسلامە، كە بە زاناو پێشەوایانی (ئەهلی سوننەت) (أهل السنة) ناسراون، خوا پاداشتیان بداتەوە.

**هەڵوێستی یەکەم:** هەڵوێستی بەزایەدەران و کورتهێنەران، (المُفرِّطون)، کە پێشتر باسمان کرد، لەژێر ناوونیشانی (نفاة الصِّفات)دا ئەوانەی کە سیفەتەکان لە خوا نەفی دەکەن و لادەبەن‌و بە بیانووی تەئویلەوە سیفەتەکان لە خوای بەرزو مەزن دادەرِنن. جا هەندێکیان هەر هەموو سیفەتەکان لە خوا لادەبەن، نەك تەنیا سیفەتە خەبەرییەکان، وەك جەهمییەکان و موعتەزیلەکان، هەندێکیشیان تەنیا سیفەتە خەبەرییەکان، ئەویش بە ناوی تەئویل کردنەوە، چ ئەوانەی کە تەئویل هەڵدەگرن، چ ئەوانەی کە هەڵی ناگرن، دێنن لە خوای پەروەردگاریان لادەبەن. جا لەبەر ئەوەی کە پێشتر باسی ئەو کۆمەڵەمان کرد، بە هەر سێ بەشەکانیانەوە: بە جەهمییەکان و موعتەزیلەکان‌و شیعەی دوازدە ئیمامی‌و فەیلەسووفەکان، وە بە ئەشعەریی و ماتوریدیی یەکانیشەوە، بۆیە حەواڵەی دەرسەکانی رِابردووتان دەکەم‌و لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

**هەڵوێستی دووەم:** هەڵوێستی تێپەرِێنەران (المُفْرِطون)، ئەگەر تاقمی پێشوو سیفەتەکانی خوایان لادەبرد، چ بە بیانوی تەئویلکردنەوە، وە چ بەبێ بیانووی تەئویل، ئەمانەی دووەم چەند شتێك بۆ خوا بە سیفەت دادەنێن، کە لە رِێگایەکی رِاستەوە ئیسپات نەبووە کە ئەوانە سیفەتی خوای پەروەردگار بن، یاخود زیادەرِۆیی دەکەن لە

سیفەتە خەبەرییەکانداو ئەوانەش کە (تەئویل) هەڵدەگرن‌و پێویستە تەئویل بکرێن تەئویلیان ناکەن، وە سەرەنجام بە شێوەیەك سیفەتەکان بۆ خوا بڕیار دەدەن، کە سەری لە جەستاندن‌و وێچواندن (تجسیم و تشبیە)ەوە دەردەچێت!. ئێستاش چەند نموونەیەك دێنینەوە کە بریتین لە چەند بەناو فەرموودەیەك، کە ئەوانەی زیادەڕۆیی (افراط)یان کردوە لە چەسپاندن (إثبات)ی سیفەتە خەبەرییەکاندا بۆ خوای بەرزو بێوێنە، کردوویانە بەڵگە بۆ بڕیاردانی چەند سیفەتێك بۆ خوا کە سەردەکێشن بۆ جەستاندن‌و وێچواندنی خواو لە هەندێ کتێبی باش‌و موعتەبەریشدا هێنراون. بەڵام بێگومان ئەو جۆرە فەرموودانە ڕاست (صحیح) نین، چ لە ڕووی زنجیرەی ڕاویان (سند)ەوەو چ لە ڕووی نێوەڕۆك (متن)یشەوە! یەکێ لەو بەناو فەرموودانە دەڵێ: ((لما قضى اللهُ خَلقَه آستَلقى ثم وَضَعَ احدى رِجلَيهِ على الأُخرى ثم قال: لايَنبغي لأحد أن يَفعَل مثل هذا))[٣٠]، شێخ (ناصرالدین الألباني) لە بەرەیەوە گوتوویەتی: (اسنادُهُ ضعیف، و المتن منکر، کأنه من وضع الیهود) واتە: (سند)ەکەی لاوازە و دەق (متن)ەکەیشی بەکەڵك نەهاتوویەو وەك هەڵبەستراوی جوولەکە (یهود)ەکان دەچێت!. مانای بەئەو ناو فەرموودەیەش ئاوایە:

(٣٠) السنة، لابن أبي عاصم، بەرگی/ 1 ، لاپەڕە (388 . 389).

کاتێك خوا لە دروستکرانی دروستکراوەکان تەواو بووو لـێبۆوە، لەسەر پشت ڕاکشا، وە لاقێکی خستە سەرلاقێکی، وە فەرمووشی: نابێ هیچ کەس ئاوا بەم شێوەیە ڕاکشێو لاقی لە سەر لاقی دابنێت، چونکە خوا وای کردوە!! پێشم وایە هەرکەسێك تۆزێك شارەزای قورئانو سوننەت بێتو عەقڵی بەشت بشکێ دەزانێ کە ئەمە قسەیەکی هەڵبەستراوەو فڕی بەسەر سوننەتەوە نیە. یەکی دی لەو بەناو فەرمودانە، دەڵێ: ((ان الله عزّوجلّ يتجلّى يَضحَكُ زاد وسَمِعتُ رسولَ الله ﷺ حتى تبدوَ لَهوا تُهُ و أضرا سُه))[٣٣]، واتە: خوای زاڵ و پایە بەرز، خۆی پێشان دەدات و پێدەکەنێ، وە ئەوەشی زیاد کردوە کە گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە ﷺ فەموویەتی: خوا پێدەکەنێ تاکو پووکو ددانەکانی دەردەکەون!! واتە: کتومت خوای بێوێنە وەك مرۆڤ دانراوە! دیارە ئەم بەناو فەرموودەیش هەم (متن)ە کەی بەکەڵك نایەتو هەم (سند)ەکەشی هیچ نیە. یەکی دی لەو بەناو فەرموودانە، دەڵێ: ((كَتَبَ اللهُ التَّوراةَ لِموسى بِيدِه وهو مُسنِدٌ ظَهرَه الى الصَّخرة))[٣٤]، واتە: خوا تەوراتی بۆ (مووسی) نووسی بەدەستی خۆی، لەوکاتی دا کە دەینووسی پشتی بە صەخرەوە دا بوو ((کە

[٣٣] الأيمان: لابن مندة، لاپەڕە (77، 78).
[٣٤] كتاب السنة: لعبدالله بن أحمد بن حنبل.

شوێنێکە لە (بیت المقدس)دا))، (بیهـقي)[تر]. لە (هـشام)ەوە، ئەویش لە (عروة بن زبیر بن عوام) خوا لێیان ڕازی بێت، هێناویەتی، دەڵێ: ڕۆژێك (زبیری کوڕی عوام) گوێی لە پیاوێك بوو، کە فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کاتێك تەواوی کرد، (زبیر) پێی گوت: ئایا ئەو فەرموودەیەت لە دەمی پێغەمبەر بیستوە؟ کابرا گوتی بەڵێ، (زُبَیر) گوتی: برای خۆم منیش لەوێ بووم و ئەو فەرموودەیەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستوە، بەڵام تۆ لێی حاڵی نەبووی و ئاگاداری سەرەتای فەرموودە کە نەبووی، پێغەمبەر ئەوەی دەگێڕایەوە لە یەکێك لە زانایانی جولەکە (یهود)و، فەرمووی: یەکێك لە زانایانی جوولەکە ئاوای گوتوە، بەڵام تۆ کە سەرەتا باسی جوولەکەی دەکرد لەوێ نەبووی، دوایی هاتی، کە تۆ لە دواییدا گوێت لێبوو، واتزانی کە هەر فەرموودەی خۆیەتی، نەخێر لە زانا یەکی جوولە کەکانی دەگێڕایەوە. فەرموودەکەش، ئەو بەناو فەرموودەیەی یەکەم بوو کە باسمان کرد، کە دەڵێ: ﴿لما قضی الله خَلقَه آستَلقی﴾، ئەوە کە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ فەرموو بیشی، لە دەمی جوولەکەیە کەوە گێڕاویەتەوە کە جوولەکەکان بۆچوونیان ئاوایە، چونکە جەستێنەر (مجسم)ن و خوا وەك ئینسان سەیر دەکەن. جا ئەوە پوختەی هەردوو

---

(تر) الأسماء والصفات: للبیهقي، بەرگی / 2، لاپەڕە (92).

هەڵوێستە دژ بەیەکەکان بوو، هەم ئەوانەی کە سیفەتەکانی خوا لادەبەن و هەم ئەوانەش کە زیادەڕۆیی لە سیفەتەکانی خوادا دەکەن، واتە لە چەسپاندن (إثبات)یاندا ئەگەر بە فەرموودەیەکی هەڵبەستراو (موضوع)یش بێت!!.

**هەڵوێستی سێیەم:** هەڵوێستی ڕاستو میانەی زانایانی ڕەسەن و ڕۆچوو:-

زانایانی ڕەسەنو هاوسەنگو ڕۆچوو لە زانیاریدا، نە بە ڕەهایی (مطلق)ی سیفەتە خەبەرییەکان (الصفات الخبرية) یان تەئویل کردوەو، نە بە ڕەهایی تەئویلکردنیشیان واز لێهێناوە، واتە نە تێیان پەڕاندوە نە کورتیان هێناوە، بەڵکو هەوڵیان داوە ئەو دەق (نص)انە، چ ئایەتی قورئان بن، چ فەرمایشتی ڕاست (صحيح)ی پێغەمبەر ﷺ بن، وەك ڕواڵەتەکەی خۆیان تەفسیریان بکەن و لێکیان بدەنەوە، بەڵام ئەگەر ڕواڵەتی ئایەتەکانو فەرموودەکان لەگەڵ خوای بەرزو بێوێنە گونجاو نەبووبێتو بەڵگەیەکی شەرعی، یان بەڵگەیەکی عەقڵی ناچاری کردبن، ئەو کاتە ئەو دەقە شەرعییانەیان تەئویل کردوە. ئەوە بە کورتی هەڵوێستی ڕێكو ڕاستی زانایانی ڕەسەنی ئیسلامە، بۆ نموونە: (بیهقي) کە یەکێکە لەو زانا بەڕێزانە، لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی: (الأسماء والصفات)، کە ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاری هێناوە بە تایبەتی سیفەتە خەبەرییەکان، وە زۆر بە میانە ڕەوانە لەوبارەوە دواوەو

باسی پەنجە (أصبع)و چەنگ (قبضە) دەكات و تەئویلیان دەكات، دوایی دەڵێ: ئەگەر یەكێك بپرسێ: بۆچی هەركام لە دەست و ڕوو (ید، وجە)یش تەئویل ناكەی، كە بڵێی: (ید) مەبەست (قدرة)و توانایەو (وجە)یش مەبەست (ذات)یان ڕەزامەندیی خوا یە؟! لە وەڵامدا دەڵێ: ﴿إنَّ هذه الصِّفات المذكورة في كتاب الله عزَّو جل بأسمائها وهي صِفاتُ مَدْحٍ، و الأصل أنَّ كلَّ صفةٍ جاءَ بِها الكتابُ، أو صَحَّت بأخبار التواتر، أو رُوِيَت مِن طريق الآحاد وكان لها أصلٌ في الكتاب، أو خرجت على بَعض مَعانيه، فأنّا نقول بِها ونُجريها على ظاهِرها، مِن غَيرِ تكييفً، وما لم يكن له في الكتاب ذكره، ولا في التواتر أصلٌ، ولا لَه بمعاني الكتاب تَعلُّقٌ، وكانَ مجيئهُ من طريق الآحاد، وأفضى بِنا القولُ إن أجريناهُ على ظاهِرهِ الى التشبيه، فأنّا نَتأوَّلُهُ على مَعنىً يَحتَمِلُهُ الكلامُ، ويَزُول مَعَهُ معنى التَشبيه﴾[٣]، ئا ئەمە پووختەی بیروڕاو هەڵوێستی زانایانی ئەهلی سوننەتە لە بەرانبەر سیفەتە خەبەرییەكان، دەڵێ: ئەم ناوو سیفەتانە كە خوای بەرزو مەزن لە قورئاندا بۆ خۆی بەكاری هێناون مەدح و ستایشی خوا دەگەیەنن، چونكە ئەسڵ ئەوەیە كە هەر سیفەتێكی خوا لە قورئانیدا هاتبێ یان لە دەقێكی موتەواتیری سوننەتدا یاخود لە فەرموودەیەكی (آحاد)دا هاتبێ، بەڵام ڕاست (صحیح) بێت و ئەسڵ و بنچینەیەكی هەبێت لە

(٣) الأسماء والصفات: بەرگی/ 2 ، لاپەڕە (88 ـ 89).

قورئاندا ( واتە: خوای پەروەردگار باسی دەست (ید) دەکات، ئەوە ئەسڵە، ئینجا فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ با فەرموودەی (آحاد)یش بێت کە باسی (ید) دەکات، چونکە ئەسڵی هەیە لە قورئاندا با خۆشی فەرموودەی (آحاد) بێت، ئەوە بەهێزتر دەبێ) جا دەڵێ: ئەوانەی بەم شێوەیە بوون، ئێمە بە پێی ڕواڵەتی خۆیان دەقەکان لێك دەدەینەوەو بەڕێیان دەکەین بێ دیاریکردنی چۆنیەتی یان، (لەگەڵ بە پاك گرتنی خوادا، وە لەگەڵ ئەوەی کە خوا وەك هیچ شتێك ناچێ و هیچ شتێکیش وەك خوا ناچێ). بەڵام ئەگەر دەقەکە وا نەبێت و نە ئایەت بێت و نە فەرموودەی (مُتواتر) بێتو نە فەرموودەیەکی (آحاد) بێت کە ئەسڵی هەبێت لە قورئانو لە فەرموودەی (مُتواتر)[تر]دا، وە ئەگەر بە پێی ڕواڵەتەکەیشی مانای بکەین سەر بکێشی بۆ وێچواندن (تشبیه) ئەوە لەو حاڵەتەدا تەئویلی دەکەین، بەڵام شێوەیەك کە مانا کەی هەڵیبگرێت، وە مانای وێچواندنیشی تێدا نەمێنێ. ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە: باشە مادام سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگ بوون، کە لەکاتی پێویستدا ئەو دەقانەی ئایەتو فەرموودە کە باسی سیفەتە خەبەرییەکان دەکەن، تەئویلیان بکەن، واتە: بە جۆرێك مانایان لێبدەنەوە لە

---

(تر) جیاوازی نێوان (متواتر) و (آحاد) بە کورتیو پوختی ئەوەیە کە (متواتر) ڕاوییەکانی کۆمەڵ (جماعە)ن و هی (آحاد) یش یەك یەك.

ڕواڵەتەکەی لای بەدەن بۆ مانایەکی دیکەی پەنهان یان مەجازی، ئایا بۆچی زانایانی پێشین لە هاوەڵان (أصحاب)و شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعین)، کەمتر تەئویلیان کردوە؟! بۆ چی گوتوویانە: (أمِرُّوها كما جاءَت) واتە: ئەو سیفەتانە بەڕێ بکەن‌و بەسەریاندا تێپەڕن وەك چۆن هاتوون، یانی: دەستکارییان مەکەن و تەئویلیان مەکەن، یاخود گوتوویانە (أمِرُّوها بِلا كيفٍ) واتە: بەبێ چۆنیەتی بۆ دیاریکردن بەڕێیان بکەن. یاخود (سوفیانی کوڕی عویەینە) لێی گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: ((كلُّ ما وَصَفَ اللهُ تعالى به نَفسَه في كِتابهِ فَتَفسيرُهُ تلاوته و السكوت عليه))[٣١]، واتە: هەرشتێك کە خوای بەرزو مەزن خۆی پێ وەسف کردوە، لە قورئاندا لێکدانەوەکەی ئەوەیە کە بیخوێنیەوەو لێی بێدەنگ بی بەڵێ ئەم پرسیارە دەکرێ کە ئایا بۆچی زانایانی پێشوو تەئویلیان کەمتر کردوە، جار جار کردوویانە، بەڵام کەمتر بووە، وە بۆ چی زانایانی دوایی زیاتر بە پێویستیان زانیوە (تەئویل) بکەن؟! جا ئەم پرسیارە وەڵامەکەی ئاوایە: بێگومان پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ((خيـر الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم))[٣٢]، واتە: باشترینی خەڵك ئەوانەن کە هاو چەرخ بوون

(٣١) بڕوانە: (الدرّ المنثور) بەرگی/ 5، لا پەڕە (336)، وە (الأسماء والصفات) للبهيقی بەرگی/ 2 ، لاپەڕە (62).

(٣٢) رواه البخاري و مسلم.

لەگەڵ پێغەمبەردا کە هاوەڵانن، ئجا ئەوانەی دوای ئەوان، پا شان ئەوانەی دوای ئەوان، وا تە ( تابعین و تابعي الـ تابعین). کە پێغەمبەر ﷺ ئاوای فەرمووە، مانای وایە خەڵکی ئەو سێ چینەو ئەو سێ وەچەیە بە گ شتی لە خەڵکی وە چەکانی دی کەی مسوڵمانان ئیمانیان تەواوتر بووەو مـ سوڵمانەتییەکەیان با شتر بووەو تێگەیشتنیان زیاترو قوڵتر بووە لە قورئانو سوننەت، وە دڵو عەقڵیان سافتـرو ساغتر بووە لە بواری دینداریی و مسوڵمانەتیدا. جا کاتێك ئینسان ئیمانی دامەزراوتر بێو تەقوای با شتر بێو پابەندیی چاکتـر بێ بە قورئانو سوننەتەوەو بەرچاوی ڕوونترو دڵی ساغ و سافتـر بێ، وە خڵتەو خاڵو ژەنگو ژار بە دڵ و دەروون و بە مێشکییەوە نەبێ، لە ڕاستیدا کەمتر پێویستی بە تەئویل دە کات بۆچی؟! چونکە کاتێك ڕستەی: ﴿يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾(ٿ). دەبیستێ ئەسڵەن زەین و بیـری بەلای دەستی ئینسان دا ناچێت، چونکە بە شێوەیەك خوای ناسیوە کە خوای بێوێنە وەك هیچ کەس و هیچ شتێك ناچێ، وە کە ڕ ستەی: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾(ٹ). دەبیستێ، بەهیچ شێوەیەك زەین و بیری بەلای دەم و چاو و ڕووی ئینـ سانان دا نا چێ، وەکاتـێك ڕ ستەی: ﴿فَإِنَّكَ

---

(ٿ) ( الفتـح  10 ).
(ٹ) ( الرحمـن  27 ).

**﴿بِأَعْيُنِنَا﴾**(1)، دەبیستێ، بەهیچ شێوەیەك بیــرو خەیاڵی بەلای چاوی ئینسانانندا ناچێت، چونكە چاك دەزانێ كە خوای پەروەردگار نە زاتیو نە سیفەتی وەك هی دروستكراوەكانی نین. جا ئەوان كە بەم شێوەیە بوونو لەو ئاستە بەرزەی ئیمانو تەقوادا بوونە، زەینو بیــرو هۆشیان هەرگیز بەلای وێچواندن (تشبیه)دا نەچووە، بۆیە بە زۆری بە پێویستیان نەزانیوە كە ئەو جۆرە دەقانەی قورئانو سوننەت تەئویل بكەن. بەڵام دوایی كە مسوڵمانان ئەندازەی ئیمانو تەقوایان لە كەمیی داو خوا ناسین (معرفة الله) لە دڵیاندا كزو لاواز بوو و ئاشنایی و پەیوەندییان لەگەڵ خوای پەروەردگاردا كەم بۆوە و شارەزایییان لە قورئان و سوننەت كەم بۆوەو خڵتەو ژەنگ لەسەر دڵو مێشكیان پەیدابوو، لە ئەنجامی ئەوەدا زۆربەیان یان بەشێكیان هەر كە ئایەتێك یان فەرموودەیەكی پێغەمبەریان ﷺ دەخوێندەوە، كە باسی سیفەتێكی خوای بەرزو مەزنی دەكرد، زەین و بیریان بەلای سیفەتی ئینسانەكان و دروستكراوەكاندا دەچوو! بۆیە زانایانی ئەو كاتی خۆیان بە ناچار بینیوە، كە ڕوواڵەتی ئەو ئایەت و فەرموودانەی ئەوەیان تێدا دەبینرێ كە وێچواندن (تشبیه)یان بۆ خوا تێدایە، خۆیان بە ناچار بینیوە كە تەئویلیان بكەن، تاكو خەڵك دووچاری وێچواندن (تشبیه) نەبێتو وابزانێت كە خوای

(1) ( الطور 48 ).

بێهاوەڵێش وەك ئینسان وایە!! (سبحانەو تعالی). ئەوەتا (بیهقي) لە باسی کورسیدا کە خوای مەزن دە فەرموێ: ﴿وَ سِعَ كُرْ سِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾[ت]، دەڵێ: ((وأمّا المتقدِّمون مِن أ صحابنا فأنَّهم لم يُفَسِّروا أمثال هذه، ولم يشتَغِلوا بِتأويلها مع آعتـقادِهم أنَّ الله تعالى واحدٌ غَيرُ متبَعِّضٍ ولا ذي جارِحَةٍ))[ی]، واتە: زانا یانی پێش ئێمە ئەم جۆرە دەقانەیان تەفـ سیر نەکردوە، وە خۆ یان بە تەئویل کردنیانەوە ماندوو نەکردوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە عەقیدەیان وابووە خوای بەرز تا کەو لە چەند بە شێك پ ێك نا یەت، وە ئەندامیشی نین وەك ئینسان. کەواتە: لەبەر ئەوەی کە عەق یدەیان وا بووەو خەڵکیش بە زۆری عەقیدەی وابووە بە پێویستیان نەزانیوە کە ئەو جۆرە سیفەتانەی خوا تەئویل بکەن، هەڵبەتە هە ندێکیان تەئویل هەر هەڵناگرن، بەڵام هەندێکی دیکەیان کە تە ئەویلیش هەڵدەگرن، ئەوانیشیان کەمتر وایە تەئویل کردبێ چونکە کەمتر پێویست بووە! دیسان هەر (بیهقي) دەربارەی پێکەنین ( ضُحك)ی خوای بەرزو مەزن دەڵێ: ((فأما المتقدِّمون من أ صحابنا فأنَّهم فَهِموا مِن هذه الأحاديث ما وقع الترغيب فيه من هذه الأع مال، وما وقع الخَبَرُ عنه مِن فَضل الله سبحانه، ولم ي شتَغِلوا بتف سير (الضُّحك) مع آعتقادهم أنَّ الله لَيسَ بذي جوارح و مخارج، وأ نَّه

---

(ت) ( البقـرة  255 ).

(ی) الأسماء والصفات: بەرگی / 2، لاپەڕە (90).

لايجوز وصفُهُ بِكَشْرِ الإسنان وفَغْرِ الفَمِ، تعالى الله عَن شَبَهِ المَخلوقين عُلّواً كبيراً﴾(تر)، باسی پێکەنینی خوای پەروەردگار دەكاتو تەئویلی دەكات، دوایی دەڵێ: پێشوەكانمان (زانایانی پێش ئێمە) لەم فەرموودانە ئەوەیان وەرگرتوە كە ئینسان هان دەدەن بۆ كردەوەی باش، وەك ئەو فەرموودەیەی كە باسی ئەوە دەكات كە خوا بە دوو كەسان پێدەكەنێت، دەڵێ: ئەو فەرموودەیە بەس مەبەستی ئەوەیە كە تۆ هان بدات بۆ كردەوەی باش، وە خوای بەخشندە هەواڵو خەبەر دەدات كە ئەو كردەوە باشانە پاداشتیان چەندە، بەڵام خۆیان بەوە ماندوو نەكردوە كە بڵێن: پێكەنینی خوا چۆنە، چونكە چاك زانیویانە كە خوای بێوێنەو هاوەڵ ئەندامی نین (تا بگوترێ: لێوو زمانو ددانی هەیە!) وە شوێنی دەرچوونی پیتەكان (مخارج الحروف)ی نیە، وە ناگونجێ خوا بەوە وەسف بكرێت كە لە پێكەنیندا ددانی دەردەكەوێت یاخود دەمی دەكاتەوە، ئەو پەڕی بەرزییو پاكی بۆ خوا، لەوەی كە وەك درووستكراوەكانی بچێت.

كەواتە، پوختەی مەبەست: دوای ئەوەی كە ئاستی دینداریيو تێگەیشتنی خەڵك لە قورئانو سوننەت و ئاستی ئیمانو تەقوایان نزم بۆتەوە، ئەوجار زانایان بە پێویستیان زانیوە كە هەندێك لەو دەقانە، چ ئایەت بن چ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەكی گونجاوو چاك تەئویل بكەن، تاكو خەڵك زەینو بیرو هۆشی بەلای

(تر) الأسماء والصفات: بەرگی/ 2، لاپەڕە (224).

وێچواندن (تشبیه)دا نەچێت‌و لە ناسینی خوای بەرزو بێوێنەدا دووچاری هەڵە نەبێ! بەڵێ وەك گوتراوە: ((تَحِدُّ للناس من الأقضية بِقَدر ما تَجِدُّ لهم من القضايا)) بە ئەندازەی ئەوەی کە کێشەو گرفت بۆ خەڵکی سەرهەڵدەدەن پێویستە حوکم‌و بڕیاریشیان بۆ پەیدا بکرێن. پێشتر خەڵك زەین‌و بیریان بەلای وێچواندن (تشبیه)دا نەدەچوو، لەبەرانبەر ئەو ئایەت‌و فەرموودانەدا کە باسی سیفەتە خەبەرییەکان دەکەن بۆیە، زاناکان دەیانگوت: (أمِرُّوها كما جاءَت) چۆن هاتوون هەر ئاوا بەڕێیان بکەن و تەئویلیان مەکەن، بەڵام دوایی کە زانرا خەڵك بە هەڵە لێیان تێدەگات، زانایان بە پێویستیان زانی کە بۆیان ڕوون بکەنەوە، تاکو بە هەڵە حاڵی نەبن. جا لەوەدا دەگەینە ئەو ئەنجامە کە: فراوانکردن، یان تەسککردنەوەی بازنەی تەئویلی شەرعیی و بەڵگەدار، تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەستە بە حاڵ‌وباڵی مسوڵمانان‌و ئەندازەو چۆنیەتی‌و ئاستی دینداری و مسوڵمانەتی و شارەزایی و قووڵ بوونەوەیان بە قورئان و سوننەتدا. ئینجا وەك گوتراوە: ((الضَّرورة تُقَدَّرُ بِقَدَرِها)) ناچاریی بە ئەندازەی خۆی دەبێ ڕەچاو بکرێ، ئەمە بنچینە (قاعدة)یەکی (أصولي)یە کە زانایانی (أصول الفقه) دایانناوەو لە ڕاستیدا ئەم مەسەلەیەش دەگرێتەوەو بە ئەندازەی ئەوەی کە بە پێویست بزانرێ، بۆ ئەوەی کە خەڵك لە ناسینی خوادا بە هەڵەدا نەچێ، ئەو دەقانەی کە تەئویل

هەڵدەگرن و بەڵگەی شەرعیی، یان بەڵگەی عەقڵیی نا چارت دەکات کە تەئویلیان بکەی، پێویستە تەئویلیان بکەی، لەکاتێکدا هەستت پێکرد کە خەڵك خەریکن بە هەڵە لێیان حاڵی ببن، زانایان ئاوایان کردوە. دیارە هەر لە سەرەتاوە پرەنسیپ (مبدأ)ی تەئویل هەبووە، بۆ نموونە: (ابن عباس) -خوا لێی رازی بێت- کورسی خوای بە زانیاری (علم) تەفسیر کردوە. وە وەك لە پێشدا باسمان کرد (ابن تیمیة) دەڵێ: هاوەڵان (أصحاب)، وە شوێنکەوتووان (تابعین) یان، لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە رستەی: ﴿وهو معكم أينما كنتم﴾یان بەم شێوەیە تەئویل کردوە کە گوتوویانە (أي: بِعلمه و قُدرتِه و سُلطانِه)، هەموویان یەك دەنگن لەسەر ئەوە کە دەبێ هەندێك شت (تەئویل) بکرێت، بەڵام زانایانی دوایی، هەندێك شتی دیکە کە ئەوانی پێشوو تەئویلیان نەکردوە، بەڵام تەئویل هەڵدەگرێ، تەئویلیان کردوە بۆ ئەوەی خەڵك بەهەڵەدا نەچێت، یان بۆ نموونە: کاتی خۆی قورئان نە نوختەی هەبووە، نە سەرو بۆرو ژێر (فتحة، ضمة، کسرة)ی هەبووە، ئەوانەی هیچ نەبووە، وە ژمارەی ئایەتەکانیش نەنووسراوە، بەڵام دوایی زانایان سەیریان کردوە خەڵك بەهەڵە قورئان دەخوێنێتەوە زانایەك گوێی لە تازە مسوڵمانێك بوو کە ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە، کە دەفەرموێ: ﴿أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ

﴿وَرَسُولُهُ﴾[] ، واتە: خواو پێغەمبەری خوا لە هاوبەش پەیدا کەران بەریین، بەڵام کابرا ئاوای نەخوێندەوە، بەڵکو خوێندیەوە (وَرَسُولِهِ) واتە: خوا لە هاوبەش پەیداکەران‌و لە پێغەمبەرە کەی بەری‌یە!، کە زاناکە گوێی لێبوو، گوتی: کابرا ئەوە چی دەڵێی‌و چۆنی دەخوێنییەوە؟! خوا چۆن لە پێغەمبەری خۆی بەری‌یە؟! تۆ بە هەڵەت خوێندەوە!. لە ئەنجامی ئەوەدا زانایان گوتیان ئەگەر بێت‌و نوختەو سەرو بۆرو ژێر، بۆ قورئان نە کەین، خەڵك لێی تێك دەچێت‌و بە هەڵە دەیخوێنێتەوە. یان ئەو ئایەتە کە دە فەرموێ: ﴿وَلا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا﴾[]، واتە: ئافرەت مارە (نکاح) مەکەن و مەدەن بە هاوبەش پەیدا کەران تاکو ئیمان دێنن، ڕۆژێك کابرایەك خوێندیەوە (ولاتَنكِحُوا)،(أعرابي) یەك لەوێ بوو لێی وەدەنگ هات‌و گوتی: کاکە ئەوە تۆ دەڵێی چی؟! بە هەڵەت خوێندەوە، پیاوان چۆن مارە (نکاح) دە کرێن؟!، چونکە (ولاتَنكِحُوا) واتە: مارە (نکاح)یان مەکەن، بەڵام (ولاتُنكِحُوا) واتە: لێیان مارە (نکاح) مەکەن! بۆیە زانایان هەستان گوتیان پێویستە شتێك بکەین تاکو خەڵك لە خوێندنەوەی قورئاندا بەهەڵەدا نەچێ، ئیدی سەرەتا (نوختە)یان دانان، پاشان گۆڕرا بۆ سەرو بۆرو ژێرو نیشانەکانی دیکە.

---

(تر) ( التوبة – 3 ) .

(یر) ( البقرة – 221 ) .

## پوختەی ڕای زانایانی ڕەسەن دەربارەی سیفەتە خەبەرییەکان

ئێستاش لە چەند خاڵێکدا بە کورتی و گو شراویی ڕای زانایان و پێشەوایانی ڕەسەنی مسوڵمانان کە قوتابخانەی فراوانی: ( ئەهلی سوننەت) کۆیان دەکاتەوە دەخەینەڕوو، سەبارەت بە سیفەتە خەبەریی یەکان، دەتوانین بڵێین: گرنگترین بنەماو بنچینە کە زانایانی ڕەسەن لە بواری سیفەتە خەبەریی یەکان لە سەریان ڕێک کەوتوون و یەکدەنگ بوونە ئەم چوارەن:

(1) سەرجەم ناوو سیفەتەکانی خوا، مادام بە دەقێکی شەرعیی ڕێكو ڕاست ئیسپات بووبن، پێویستە دانیان پێدابهێنرێ کە ئەوانە ناوی خواو سیفەتی خوای پەروەردگارن.

(2) مانا لێکدانەوەو تەفسیرکردنی ئەو دەقانەی کە ئەو سیفەتانەیان تێدا هاتوون پێویستە بە پێی ڕواڵەت (ظاهر)ی دەقەکان بێ، مادام هیچ گرفتو ئیشکالێکیان لەسەر دروست نەبێت.

(3) بە پاك گرتنی خوا لە وێچواندن (تشبیه)ی بە دروستکراوەکان، بەهۆی چەسپاندنی ئەو سیفەتە خەبەریی یانەوە کە ڕواڵەتیان لەگەڵ خوادا ناگونجێ، وە دەبێ بگوترێ: ئەو سیفەتانەی خوای کاربەجێ ئەو واتاو چۆنیەتی یەیان نیە کە دێتە بیرو خەیاڵی ئێمەوە، بەڵکو ماناو چۆنیەتی یەکی تایبەت بە خواو بۆ خوا شیاوو گونجاویان هەیە، کە خوای بێوێنە هەر خۆی دەیزانێت.

(4) تەئویل کردنی سەرجەم ئەو دەقانەی کە بەهۆی تەفسیرکردنیانەوە بە پێی مانا ڕواڵەتییەکەیان گرفتو ئیشکال پەیدا دەبێت، وە بەڵگەی شەرعیی و عەقڵی ناچارمان دەکات کە ئەو مانایەیان لێ نەگرین کە لە ڕواڵەتەکەیاندا دەبینرێت.

ئەم چوار بنەماو بنچینەیە زانایانی ڕەسەنو ڕۆچوو لەسەریان پێکهاتوون، بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ناوو سیفەتەکانی خوای زاڵو کاربەجێدا بە گشتیو بە تایبەتی سیفەتە خەبەرییەکان.

ئنجا ئایا ڕاستە کە سیفەتەکانی خوا (عزَّوجّل) هەموویان پێویستە یەك جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ(ت) ؟!:

(إبن تیمیة) لە بواری هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ سیفەتەکانی خوادا بنچینەیەکی داناوە کورتەکەی ئەوەیە کە: سیفەتەکانی خوا (سبحانەو تعالی) هەموویان پێویستە یەك جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ! جا هەرچەندە (ابن تیمیة) خوا لێی خۆش بێ زانایەکی بلیمەتو پایەبەرزی ئیسلامەو بیروبۆچوونی ڕاستو جوانی زۆر زۆرن، بەڵام بە ڕاستی ئەو بنچینەیەی لێ ناسەلمێنرێ، هەرچەند زۆرێك لە زانایان بەتایبەتی ئەوانەی سعوودیەو خەلیج، بە سەلمێنراویی (مُسَلَّم)ی ئەو بنچینەیان

(ت) پێویستە خوێنەری بەڕێز وریا بێ و ئەو مەسەلەیەی ئێرە کە ڕەخنەی لێدەگرین، لەگەڵ بنچینەی پێنجەمی بەندی سێیەم لێ تێکەڵ نەبن، چونکە ئەوەی ئەوێ مەبەست پێی ئیسپاتی سیفەتەکانەو لێرەش مەبەست ئەوەیە کە سیفەتەکان وەك یەك نین لە حوکم و چۆنیەتی ئیسپاتیان داو جیاوازن.

وەرگرتوە، بەڵام من پێم وایە ئەو بنـچینەیە ئیشکالی زۆری لە سەر پەیدا دەبن، جا ئەو بنچینەکەشی لە چەند شوێنێکی (مجموع الفتاوی)[تر]کەیدا هێناوە، هەروەها هەرکام لە (الشیخ محمدأمین الشنقیطي)[یر]، وە (د. عمر سلیمان الأشقر)[سه]یش هێناویانە، وەك شتێکی سەلمێنراو، بنچینە (قاعدة)کەش ئەوەیە کە دەڵێ: (الصِّفات کُلُّها مِن بابٍ واحدٍ) یاخود دەڵێ: (یَجِبُ أن تُعامَل الصِّفاتُ کلّها معاملةً واحدةً) واتە: سیفەتەکانی خوا هەموویان یەك شێوەن، وە پێویستە بە یەکجۆر ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێ!. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو بنچینەیە ڕاست نیەو، دەتوانین چەند تێبینی یەك لەسەر ئەو بنچینەیە بخەینە ڕوو:

(1) سیفەتەکان لە ڕووی (سَنَدَ)ەوە جیاوازن، چونکە ئەو سیفەتانەی کە لە قورئاندا یان لە فەرموودەی (متواتر)ی پێغەمبەردا ﷺ هاتوونو باسکراون، جیان لەو سیفەتانەی کە لە فەرموودەیەکی (آحاد) داهاتوون کە ئەسڵێکی نیە لە قورئانو سوننەتی (متواتر)دا، یاخود لە فەرموودەیەکی (حَسَن)، یاخود فەرموودەیەکی لاواز (ضعیف)دا هاتوون! دیارە وەك باسمان کرد، فەرموودەکانی (آحاد)یش کافیو گونجاون بۆ ئەوەی کە بە بەڵگەی

(تر) مجموع الفتاوی: بەرگی/ 3، لاپەڕە (17).

(یر) الأسماء والصفات: نقلاً و عقلاً: للشنقیطي: لاپەڕە (94).

(سه) العقیدة في الله: لاپەڕە (216).

شەرعیی دابنرێن و هەم مەسەلە فیقهی یەکان و هەم مەسەلە لە عەقیدەیی یەکانیان پێ بچەسپێ، بەڵام زۆر لە فەرموودەکانی (آحاد) زانایانی پایە بەرز کێشەو مشتومڕیان لە بارەوە کردوون.

(2) سیفەتە غەیرە خەبەریی یەکان، مەگەر بیدعەچی یەکان (أهل البدع) ئەگەرنا هیچ زانایەکی ناودار تەئویلی نەکردوون و کەس نەچووە کە سیفەتەکانی (علم، قدرة، حیاة... هتد) تەئویل بکات، بەڵام سیفەتە خەبەریی یەکان زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لە سەر تەئویل کردنی زۆربەیان هەندێکیان وەك لە باسەکانی ڕابوردوودا خستمانە ڕوو. ئەوەتا یەکێك لەوانە کە (ابن تیمیة) یە بۆ خۆی دەڵێ: هەندێك لە سیفەتە خەبەریی یەکان یەکدەنگی لەسەر ئەوەیە کە دەبێ تەئویل بکرێن بۆ نموونە: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ [٣٣]، وە: ﴿وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطاً﴾ [٣٤].

(3) سیفەتە غەیرە خەبەریی یەکان و ێڕای دەق (نص)ی شەرعی، عەقڵیش بە پێویستیان دەزانێ و سەری لێیان دەردەچێ و دەڵێ دەبێ هەبن بۆ خوای پەروەردگار، جا شتێك هەم شەرع پشتگیری بکاو هەم عەقڵ، بۆ ئینسان زیاتر جێگای دڵ پێخۆشبوونە، ئەگەرنا هەرشتێك شەرع فەرمووی تازە تەواو، بەڵام ئەگەر شتێك وێڕای

(٣٣) (الحدید – 4).
(٣٤) (النساء – 126).

ئەوەی کە شەرع بڕیاری لەسەر دەدات، عەقڵیش سەری لێدەربچێ زیاتر دەچێتە دڵی ئینسانەوە، بە تایبەت بۆ کەسانێك کە وەك پێویست لە شەرع شارەزا نین، یان وەك پێویست متمانەی بەو فەرموودەیە نیە کە بڕیاری لەسەر داوەو فەرموودەی (آحاد)ە.

(4) سەرجەم یاخود زۆربەی هەرە زۆری سیفەتە غەیرە خەبەرییەکان ناوە چاکەکانی خوای پەروەردگاریشیان لێ هەڵدەهێنجرێ، بۆ وێنە: (علِم) ناوی (علیم)ی لێ هەڵدەهێنجرێ و (قدرة) ناوی (قدیر)، وە هەروەها باقی سیفەتەکانی دیکەش، بەڵام سیفەتە خەبەرییەکان وانین و زۆریان ناوەکانی خوای بەرزو مەزنیان لێ دروست ناکرێت، بۆ وێنە: (ثم آستوى على العرش) یان (يَدُ الله فوق أيديهم) یان (فأنَّكَ بِأعيُننا) یان (وَيبقى وَجهُ ربّك ذو الجلال و الأكرام) هەروەها ژمارەیەکی دیکەی زۆر لە ئایەتو فەرموودەکان کە سیفەتە خەبەرییەکانیان گرتوونە خۆ، هیچ کامیان ناگونجێ ناوە چاکەکانی خوا (أسماءُ الله الحسنى)یان لێ دروست بکرێ.

(5) سیفەتە غەیرە خەبەرییەکان بە شێوازێك باسکراون کە خوای کاربەجێ داکۆکی لەسەر کردوون و ویستوویەتی بزانین کە ئەو سیفەتانەی هەن، وەك: ﴿إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾(1). یان ﴿إِنَّ اللَّهَ

(1) (الزمر 53).

﴿عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[ت]، تۆ هەست دەکەی کە خوای مەزن دەیەوێ پێت بڵێ: کە من زاڵ (عزیز)و کار بەجێ (حکیم)م وە لێ بوردە (غفور)و بەخشندە (رحیم)م، بەڵام سیفەتە خەبەرییەکان لە لاڕا، وە (بالتَّبع) خراونە ڕوو، وە خوای پەروەردگار ویستوویەتی مەبەستی دی کەمان بۆ ڕوون بکاتەوە بۆ نموونە: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾[ی]. ئێمە یەکسەر لەم ئایەتە تێدەگەین‌و دەزانین کە خوای بەرزو بێوێنە دەیەوێ دەستەڵات‌و تواناو هێزی خۆی پیشانی ئێمە بدات، نەك چەنگ (قبضة)ی خۆی و دەستی ڕاست (یمین)ی خۆی!. یان کە دەفەرموێ: (فآصبر لحكم ربِّك فأنَّكَ بأعيننا) لێرەدا بە ئاشکرا دەبینین کە خوای مەزن نایەوێ باسی چاوی خۆی بکات، بەڵکو دەیەوێ باسی ئەوە بکات کە ئەی (محمد) ﷺ خۆت ڕابگرە بۆ حوکمی پەروەردگارت تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای‌و ئاگامان لە تۆ هەیەو دەتپارێزین[س].

---

(ت) ( التوبة - 71 ) .

(ی) ( الزمـر - 67 ) .

(س) بۆ وەرگرتنی ئەم (تێبینی)یانە زیاتر بڕوانە (العقيدة الأسلامية في القرآن الكريم و مناهج المتكلمين)، لاپەڕە (148 ، 149) للدكتور محمد عياش الكبيسي.

## خاڵی چــوارەم:
## سـەرنجدانـێكی گشـتی لە سـیفەتە خـەبەریی یەكـان لە ڕووی تەئویـل كران و بەرِێكرانــەوە

بەرێزان!

ئێستاش باسەرنجێكی خێرا بدەین لە تێكڕای سیفەتە خەبەریی یەكان، لە ڕووی تەئویل كرانو بەرِێ كرانەوە.

**(بەشی یەكەم): لە سیفەتە خەبەریی یەكان،** وەك باسمان كردن.

یەكـەم: (وَجه) ڕوو، سەرجەم زانایان و توێژەرەوانی قورئان لە تێ كڕای ئەو ئایەتانە دا كە وشەی (وجه)یان تێدا هاتوە، هەم ڕای تەئویل نەكردنیان هێناوەو هەم ڕای تەئویل كردن، وەك پێشتریش ئاماژەمان بە هەندێكیان كرد. بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەلێك فەرمودەی ڕا ست (صحیح)ی پێغەمبەردا ﷺ باسی (وجه)ی خوا كراوە، هەر چەندە بگونجێ لە هەندێ شوێنی قورئاندا (وجه) بە خود (ذات) یان بە ڕەزامەندیی (رضى) یان بە پاداشت (ثواب) یان بە ڕووگە (قبلة) لێك بدەینەوەو تەئویل بكەین، بەڵام ئەو هەموو دەقانەی قورئان و سوننەت ناكرێ هەموویان تەئویل بكرێن، بەتایبەتی هەندێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ بۆ وێنە یەكێك لە فەرموودەكان

ئەمەیە: ((أللّهم إني أسألُك الرِّضى بَعدَ القضاء، وبَردَ العَيش بَعدَ الموت، و لَذَّةَ النَّظر في وجهِك، و الشَّوق الى لِقاءِك، مِن غَير ضَرّاء مُضِرّة، ولا فِتنةٍ مُضِلَّة))(تر)، واتە: خوایە داوات لێدەکەم کە لەدوای قەزاو تەقدیری خۆت وام لێبکەی کە ڕازی بم، وە لە دوای مردن ژیانی ئاسوودەییو خۆشیم پێ ببەخشی، وە تامو چێژ وەرگرتن لە سەیرکردنی ڕوو (وجه)ی خۆتم پێ بدەی، وە تامەزرۆیی دیداری خۆتم پێ ببەخشی، بەبێ زەرەرێکی زیانبەخش، وە بەبێ بەلایەکی سەر لێشێوێن. هەروەها ئەم فەرموودەیەش: ((إن الله (عزَّو جَّل) لايَنامُ ولا يَنبغي له أن يَنامَ، يَخفِضُ القِسط و يَرفَعُهُ، يُرفَعُ اليه عمل اللّيل قبل عَمَلِ النّهار وعَمَلُ النّهار قبل عَمَلِ اللَّيل. حجابُهُ النُّورُ لو كَشَفَهُ لأحَرقَت سُبُحاتُ وَجهِه ما انتهى اليه بَصَرهُ مِن خَلقه﴾(يز)، جا ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەو ڕستەیەی دوایییە: ﴿حجابُهُ النورُّ لو كَشَفَهُ لأحَرقَت سُبُحاتُ وَجهِه ما اتهى اليه بَصَرهُ مِن خَلقِه﴾ واتە: پەردەکەی ڕووناکییە ئەگەر لای ببەرێ پڕشنگەکانی ڕووی، هەتا دیتنی بڕکات لە درووستکراوەکانی دەیسووتێنێ! چەند فەرموودەیەکی دیکەش، کە ئەو فەرموودانە ناگونجێ تەئویل بکرێن، بۆیە، ئەو ڕاوبۆچوونە ڕاستترە، کە دەڵێ:

(تر) رواه الطبراني، وقال الهيثمي: رجاله ثقاة: بڕوانە (السنة) لابن ابی عاصم: بەرگی/1، لاپەڕە (305).

(يز) رواه مسلم عن أبي موسى الأشعري، برقم: (293).

خوای بەرزو بێوێنە سیفەتێکی هەیە بە ناوی (وجه) ڕوو، بەڵام با بە هیچ جۆر یەك زەینمان و بیرمان بەلای ڕووی ئینسانەکان و دروستکراوەکاندا نەچێت (ولله المثل الأعلى)، چونکە هەر لەبەر ئەوەی خوا (عزوجّل) (وجه)ی هەیەو ئێمەش (ڕوو)مان هەیەو لە ناوەکەیاندا یەکن، مانای وانیە کە نێوەڕۆکیشیان یەکە! ئاخر (ڕوو)ی ئێمە ئەندام (عضو)ە، بەڵام (وجه)ی خوا سیفەتەو چۆنیەتی یەکەشی هەر خوا خۆی دەزانێ چۆنە.

دووەم: (یَد) دەست، ئەمیش زۆربەی هەرە زۆری زانایان وەك ڕوالەتی خۆی تەفسیریان کردوە، بەڵام وێڕای بە پاك گرتنی خوا لە وێچوونی دروستکراوەکانی. هەندێ لە زانایانیش هەر جارە بە شێوەیەك و واتایەك، کە لەگەڵ (سیاق)ی ڕستە وتەعبیرەکانی قورئاندا بگونجێ ماناو تەئویلیان کردوە، بۆ نموونە: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ قال يا إبليس ما مَنَعَكَ أن تَسجُدَ لِما خَلَقتُ بِيَديَّ﴾، واتە: ئەی (ئیبلیس) چ شتێك ڕێگای لێ‌گرتی، کە کڕنووش بەری بۆ ئەوەی، کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردوە؟! (طبـري)[تر]، تەنیا بە مانا ڕوالەتی یەکەی هێناویەتی، بەڵام (قرطبـي)[یر]، هەردوو ماناکەی هێناون بەڵام لای تەئویل کردنەکەی هەڵبژاردوە، کە مەبەست لە باسکردنی وشەی (دوو دەست) زێدە ڕێزلێگرتنی ئادەم و بایەخ پێدانیەتی.

(تر) تفسير جامع البيان: الطبري: بەرگی/ 12 ، لاپەڕە (221).

(یر) تفسیر القرطـبي: بەرگی/ 8 ، لاپەڕە (168).

سێیەم: (عين) چاو، ئەمیش کە لە قورئاندا بە (تاك)و بە (کۆ) هاتوە، بە (تاك) وەك دەفەرموێ: ﴿وَلِتُصنَعَ عَلَى عَيْـنِي﴾(ثا)، کە دەر بارەی (موسى)یە (عليه السلام)و مانا ڕواڵەتییەکەی واتە: لەسەر چاوی من پەروەردە بی، بەڵام مانا ڕاستییەکەی یانی: لەژێر چاودێریو ئاگاداری مندا پەروەردە بی، وە بە (کۆ) وەك: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾(خ)، وە ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾(ذ)، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە خوا (جل جلاله) دوو سیفەتی هەن پێیان دەگوترێ چاو (عَين)، لەگەڵ بە پاك گرتنیدا کە وەك چاوی درو ستکراوەکانی ب چن، هەندێکیش تەئویلیان کردوە، وە من پێم وایە کە بۆ ئایەتەکان تەئویل کردن ڕاسترە، چونکە لە ئایەتەکاندا یان بە تاك (مفرد) (عين) هاتوە، یان بە کۆ (جمع) (أعين)، جا هەرچەندە لە سوننەتیشدا چەند دەق (نص)ێك بە بەڵگە دەهێنرێنەوە، بۆ وێنە: ئەو فەرموودە یەی کە باس لە (دجّال) دەکاتو پاشان دەفەرموێ: دەججاڵ (أعور)ە، واتە: یەك چاوە پاشان دەفەرموێ: ﴿إنَّ الله لَيس بأعور﴾(ض)، خوا یەك چاو نیە، وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دە فەرموێ: ((انَّ الله لا يَخ فى عليكم، ان الله ليس بأعور، وأشار بيده الى عَينه))(ظ)، واتە: خوا لە

(ثا) ( طـه – 39 ).

(خ) ( الطـور – 48 ).

(ذ) ( القمـر – 14 ).

(ض) رواه البخاري.

(ظ) رواه البخاري.

ئێوە پەنهان نابێ، خوا یەك چاونیە، وە ئاماژەی بۆ چاوی کرد، واتە: نەك چاوێك وەك هی ئینسان و دروستکراوەکانی دیکە، بەڵکو چاو (عین) سیفەتێکە بۆ خوا، بەو شێوەیەی کە لە خوا دەوەشێتەوە. بەڵام من پێم وایە ئەو فەرموودانەش بە ڕاشکاویی ئەوە ناگەیەنن کە ئێمە سیفەتێك بەناوی (عین) بۆ خوا بڕیار بدەین، بەڵکو هەر ئەوەندەیان لێ دەفامرێتەوە کە (دەججاڵ)ی یەك چاو کە لا فی خوایەتی لێدەدات هەر کوێریی یەکەی بەڵگەی درۆزنی یەتی چونکە (خوا) (سبحانەو تعالی) ناگونجێ نوقسانو ناتەواو بێت!!

بەڵام ئەو وشانەی دیکە کە خوایان پێ وەسف کراوە وەك: (صورة، رِجل، قَدَم، ساق، أصبُع، جَنب، حِقو، ساعِد، كَفّ) کە پێ شتر مانامان کردوون ئەوانە زانایان سەرجەمیان تەئویل کردوون، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو تەئویل کردنانە:

چوارەم: (صورة) فەرموودەی: ((انَّ الله خَلَقَ آدَمَ على صُورَتِه))[٢٣]، بە چەند شێوەیەك تەئویلیان کردوە بۆ وێنە: گوتوویانە: واتە: خوا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی، (شێوەی ئادەم) دروست کردوەو شێوەکەی نەگۆڕاوە. هەندێکیش گوتوویانە: واتە: وێنەیەکی تایبەت کە خوای بەدیهێنەر بە دانستە بۆ ئادەمی دیاری کردوە، وەك (ناقة الله) خۆ هەموو شتێكو هەموو وشترێك هەر هی خوایە!، لەم فەرموودەیەشدا واتە: وێنەیەکی تایبەتی خوایی بۆ ئادەم، نەك

(٢٣) رواه البخـاري.

وێنەی خودی خوا، هەندێکیش، دەڵێن: ئەوە ئاماژە بووە بۆ ئەو کەسەی لێی دەدرێ، چونکە دەفەرموێ : ((ئەگەر لە کە سێکتاندا لە دەموچاوو ڕووی مەدەن، خوا ئادەمی لەسەر وێنەو دیمەنی خۆی دروست کردوە))، دەڵێن: واتە: لەسەر وێنەو دیمەنی ئەو کەسەی کە لێی دەدرێ. هەندێکیش گوتوویانە: بۆ خوا دەگەڕێتەوە، بەڵام مەبەست پێی سیفەتە. واتە: ئەو سیفەتەو، ئەو شێوەیەی کە پێکها تەو د یمەنی ئین سانی لە سەر درو ست کراوە، خوای پەروەردگاریش ئەو سیفەتەی هەیە، نەك ئەو شێوەیە، واتە: ئینسان دەبیستێ، خواش دەبیستێ، ئینسان دەبینێ، خواش دەبینێ. کەواتە: ئادەم لە (سمع و بصر)داو لەو سیفەتانەدا وەك خوای پەروەردگارە، نەك لە شتی دیکەدا(تز).

پێنجەمو شەشەم: (رِجل و قَدَم) واتە لاقو پێ، (أبو سليمان الخطّابي) گوتوویەتی: هەرکەسێك بیەوێت، کە شتێك بەتاڵو مەحو بکاتەوە، دەڵێ: دەیخەمە ژێر پێم، یان دەیخەمە ژێر لاقم، وەك پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی گرتنی (مكة)دا فەرمووی: ((ألا إنَّ كلَّ دَمٍ وَ مأثرةٍ في الجاهلية فَهُو تحتَ قَدَمَيَّ هاتَينِ))(یز)، واتە: ( هەر خوێنێکی سەردەمی نەفامی، وە هەر پاشماوەیەکی سەردەمی نەفامی، لەژێر ئەو دوو پێیانەم دایە): پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە، کە

(تز) كتاب الشريعة: للآجرّي: بەرگی/ 3، لاپەڕە (1147،1151).

(یز) أبو داود في السنن .

لەژێر پێی بنێ، بەڵکو واتە: ئەو شتانە بەتاڵو (مرفوض)ن و کۆتاییان پێ هات. لەو فەرموودانەشدا کە دەڵێ: خوای زاڵ و مەزن لاقی خۆی دەخاتە نێو دۆزەخەوە، یان پێی دەخاتە نێو دۆزەخەوە، واتە: خوا دۆزەخ بێدەنگ دەکات، ئیدی مەرج نییە پێی بخاتە نێوییەوە، بۆیە ئەوەیان لێ وەرناگیرێ کە خوای بێوێنە لاقی هەبێ و پێی هەبێ، دیارە ئەم تەئویلەش زۆر بەجێیەو (بیهقي)[تر] یش پشتگیریی کردوە.

حەوتەم: وشەی (ساق) واتە: لە ئەژنۆ بەرەو خوار (ابن عبّاس) - خوا لێیان ڕازی بێ- دەڵێ: مەبەست لە (ساق) کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ﴾[یر]، واتە: ئەو ڕۆژەی کە لاق (ساق) دەردەخرێ (کە هەندێکیان وایان تەفسیر کردوە: خوا لاقی خۆی دەردەخات!) (عبداللّەی کوڕی عباس) دەڵێ: عەرەب ئەگەر بیانەوێ تەعبیر لە کاتێکی تەنگانەو سەغڵەتی بدەنەوە، دەڵێن: (كُشِفَ عَنِ السّاقِ) چونکە لەوکاتانەدا ئینسان لاقی خۆی هەڵدەکات بۆ ڕاکردن، یان هێرش بردن، خۆی گورج و گۆڵ دەکاتەوە، کە (ابن عباس) دەڵێ: ((هو الأمر الشَّديدُ المُفزعُ مِنَ الهَولِ يوم القيامة))[سە].

---

(تر) الأسماء و الصفات: بەرگی/ 2 ، لاپەڕە (87 .88).

(یر) ( القلـم – 42 ).

(سە) الأسماء و الصفات: بەرگی /2 ، لاپەڕە (81).

هەشتەم: وشەی (أُصبُع) پەنجە، قامك، (بیه قي) دە لێ: هاوەڵا نمان، زانایانی پێش ئێمە، خۆیان بە تەئویلی ئەو فەرموودەیەو وێنەی ئەو فەرموودەیەوە ماندو نەکردوە، بەڵکو هەر ئەوەیان لێوەرگرتوە، کە ئەو فەرموودانە لە پێناویدا گوتراون، کە بریتییە لە دەرخستنی دەستەڵات‌و توانای خوای پەروەردگار، وەك ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ: (دڵی هەر ئینسانێك لە نێوان دوو پەنجەی خوادایە)، خۆبە دڵنیایی یەوە دوو پەنجەی خوای بێوێنە لە نێو دڵ و سینەی ئێمەدا نین! کەواتە هەر دەبێ تەئویل بکرێ، ئنجا ئەوە نا شکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە خوا پەنجەی هەیە!، چونکە لە عورفی زمانندا ئەو تەعبیرە بەکاردەهێنرێ بۆ ڕانواندنی دەستەڵات وەك یەکێك بە یەکێکی دیکە دەڵێ: بە یەك پەنجە تۆ دەخولێنمەوە، یان دەلێ: تۆچی؟! من بە دوو پەنجە پێت دەوێرم! مەبەستی ئەوەیە کە دەستەڵاتم هەیە! بە تایبەتیش کە باسکردنی پەنجە لە قورئانندا نەهاتوە، وە ئەو فەرموودەیەش کە دەڵێ:(٣٨) لە ڕۆژی دواییی خوای پەروەردگار چیاکان دەخاتە سەر پەنجەیەکی‌و ئاو دەخاتە سەر پەنجەیەکی‌و وە هەروەها تا کۆتایی، سەیر دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی نەیفەرموە، بەڵکو قسەی زانا (حبر)ێکی جوولەکەکانە،

---

(٣٨) (بخاري) لە (عبدالله بن مسعود)ی گێڕاوەتەوەو پێشتر دەقەکەیمان هێناوە مانا شمان کرد، لە (وێنەی سێیەم)ی ئەو ئایەتانەی کە زانایان تەئویلیان کردوون.

وە پێغەمبەریش ﷺ لە بەرانبەر قسەکەیدا پێکەنیوەو گێڕەرەو (راوي)ەکە بە مەزەندە (إجتهاد)ی خۆی گوتوویەتی: (تصديقاً لِما قال) واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆیە پێکەنی چونکە تەئییدی کردو قسەکەی پێ ڕاست بوو، ئەوە بۆچوونی ڕاوی فەرموودەکەیە، ئەگەرنا کێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە عەقڵی کابرای جوولەکە پێ نەکەنیوە؟ چونکە جوولەکە بەناوبانگن بۆ جەستاندن (تجسيم)ی خوای بێوێنەو خوایان وەك شتێکی بەرهەستو ماددی تەصەووڕ کردوە، هەروەها دەگونجێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە پێ کەنیبێ کە کابرای جوولەکە ویستوویەتی دەستەڵاتو توانای خوا بخاتە ڕوو، بەڵام عەقڵی پێ نەشکاوە هەر ئەوەندەی لێ زانیوە، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿وما قدروا الله حق قدره﴾ چونکە ئایەتەکە وەك کە چۆن دەگونجێ پشتگیری ئەوە بکات کە خوا ئەو شتانە لەسەر پەنجەی خۆی دادەنێ، دەشگونجێ پشتگیری ئەوە بکات کە کابرای جوولەکە لە دەستەڵاتو توانای خوا حاڵی نەبووە کە ئاوای باس دەکات(تر)!.

نۆیەم: وشەی (جَنب) کە لەم ئایەتەدا هاتوە: ﴿ياحَسرتا على ما فَرَّطتُ في جَنبِ الله﴾ کە پێشتریش باسمان کرد، (طبري) لە (مجاهد)ەوە

---

(تر) بڕوانە (الأسماء والصفات ): بەرگی/2، لاپەڕە (70 ، 71)، (الخطابي) ئاوای (تحليل) کردوە.

نەقڵی کردوە، دەڵێ: ﴿في جَنبَ الله أي في أمرالله﴾[1]، دەڵێ: و شەی (جَنب) واتە: طاعەتو فەرمانی خوا.

دەیەم: وشەی (حِقو) واتە: کەلەکە، (بیهقي) نەقڵ دەکات، دەڵێ: مەبەست لە (حقو) کە لە فەرموودەکەدا دەڵێ: (ڕەحەم) دەست بە کەلەکەی خوا دەگرێ، دەڵێ: ((أي استجارَت وآعتَصَمَت بالله عزَّوجل)) واتە: پەنا دەباتە بەر خوای زاڵو پایە بەرزو هانای بۆ دەبات، نەك ئەوە بگەیەنێ کە خوا کەلەکە (حقو)ی هەبێت ئەوەش تەعبیرێکی باوی زمانە کە کەسێك بە دەستەڵاتدارێك دەڵێ: دەستم بە پشتێنت گرت، واتە پەنام هێنایە بەرت، یان دەستم بە داوێنت!

یازدەیەمو دوازدەیەم: وشەی (ساعِدو کَفّ) باسك، لەپەدەست، ئەو دووانەش هەر تەئویل کراونو دەڵێن: مەبەست ئەوەیە کە خوا دەستەڵاتو توانای زۆرە، نەك مەبەست ئەوەبێ کە خوای بێوێنە باسکی هەبێو لەپەدەستی هەبێت، وەك کە دەگوترێ: ئەو شتەم لە دەستدایە، واتە لەژێر دەستەڵاتم دایە، نەك مەبەستی ئەوەبێت کە بە کردەوە (فِعلاً) بە دەستییەوە بێتو لە چەنگی گرتبێ! وە فەرموودەکەش کە پێغەمبەر ﷺ بە کابرای گوت: ((ساعِدُ الله أشدُّ مِن ساعِدكَ، وموسى اللهِ أحَدُّ مِن موساك)) واتە: باسکی خوا لە باسکی تۆ بەهێزترە، وە تیغی خوا لە تیغی تۆ بڕندەترە (بیهقي) دەڵێ: وەك چۆن مەبەست لە تیغە کە فەرمانی خوایەو حوکمو دەسەتەڵاتی خوایە، نەك مەبەست تیغی ڕواڵەتی بێت!، بە هەمان

---

[1] تفسیری (الطبري) بەرگی/ 15، لاپەڕە (25).

شێوە باسك (ساعد )ەكەش هەر مەبەست پێی هێزو دەستەڵاتەو پێ وێرانو توانایيو دەستـڕۆیشتوویەتییە.

جا بەڕێزان: من بۆ خۆم ڕاوبۆچوونم وایە كە ئەم تەئویل كردنانە هەموویان پێویستن، نەك هەر دروستن، چونكە ئاوا باشتر خوا بەپاك دەگیرێ، وە لە زمانی عەرەبیدا ئەو و شانە مانای پەنهانو ( مجازي) تێیاندا بەهێزترە بۆ نموونە: كەسێك بە كەسێكی دی دەڵێ: فلان كەس بۆ فلان كەس بچێت باسكی بادەدات، دیارە مەبەستی ئەوە نییە كە حەتمەن باسكی دەگرێ و بای دەدات، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە كە دەیخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوەو دەرەقەتی دێ!

## (بەشـــی دووەم) لە سـیفەتە خەبەریی یەكان:

كە بریتی بوون لەو شتانەی كە ئەگەر بۆ ئێمە بەكاربێن دەلالەت لەسەر جمو جۆڵ دەكەن. بەڵام بۆ خوای بێوێنە مانای تایبەتیو شایستەی خوایان هەیە. جا من پێم وایە سێ لەو سیفەتانە ناگونجێ تەئویل بكرێن:

(1) یەكێك لەوانە بریتیە لە: چوونە سەر (عرش)، یاخود بەرزبوونەوە بۆ سەر (عرش) وەك دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ ئەم ڕستەیە لە حەوت شوێنی قورئاندا هاتوە(تر)، وە لە هەر حەوت

---

(تر) 1 – ( الأعـراف – 54) ، 2– ( یونـس– 3 ) ، 3– ( الرعـد– 2 ) ، 4 – ( طه – 5) 5 – ( الفرقـان – 59 ) ، 6 ( السجدة – 4) ، 7– ( الحدیـد – 4) .

شوێنەکاندا بەم تەعبیرە هاتوە: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾، هەروەها لە چەند فەرموودە یەکی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە، وە خوای پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە کە (عرش)ەکەی هەڵدەگیرێت، وەك دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ﴾(١)، واتە: ئەوانەی کە (عرش) هەڵدەگرن و ئەوانەی کە لە دەورنی (کە مەبەست پێی فریشتەکانن) وە فەرموویەتی: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾(٢)، واتە: لە ڕۆژی دواییدا هەشت دروستکراو (عرش)ی پەروەردگارت هەڵدەگرن. لەبەرئەوە ناگونجێ (عرش) بە هیچ شێوەیەك تەئویل بکرێت، بەڵکو دەبێ بگوترێ: خوا لەسەر (عرش)ە بەو شێوەیەی کە لە خوا دەوەشێتەوە، بەڵام دەبێ بزانین کە (عرش)و ئەوانەی دەوروبەریشی بە دەستەڵاتی خوا هەڵگیراون‌و ڕاوەستاون، نەك (عرش) خوای پەروەردگاری هەڵگرتبێ وە کاتێکیش بووە کە نە (عرش) بووەو نەکورسی، نە ئاسمان بووەو نە زەوی، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((كان الله وما كان معه شيءٌ وكانَ عَرشُه على الماءِ))(٣)، واتە: خوا هەبوو هیچ شتێکی لە گەڵ نەبوو، وە عەرشەکەی لەسەر (ئاو) بوو!، (ئاو)ێك کە خوا هەر خۆی دەزانێت چی بووەو چۆن بووە!

---

(١) (غافر 7).

(٢) (الحاقة 17).

(٣) (رواه مسلم).

(2) (سیفەتی دووەم)ی خوای پەروەردگار کە تەئویل هەڵناگرێ بریتیە لە سەرەوە بوونی خوا، لە ئاسمان بوونو لە سەروو بوون، لە بەرزیی بوون، (العلو و الفوقية). زۆر بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی کە خوای بەرزو بێوێنە لە سەرووی درو ستکراوەکانی خۆیەوە یەتی، چارێ لەسەر (عرش) بوونی خوا، بەڵگەیە، وە ئەو ئایەتەش بەڵگەیە کە دەفەرموێ: ﴿أَأَمِنتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ﴾[1]، واتە: ئا یا ئ یوە ئەمین و دڵنیان لەوەی کە لە ئاسما نە، کە مەبە ست پێی خوا یە، وە بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ﴾[2]، کە دەربارەی (عیسی)یە -سەلامی خوای لە سەربێ-، وا تە: خوا عیسای بۆ لای خۆی بەرزکردەوە، کەواتە: خوا (عزّوجلّ) لە بەرزییە. وە ئەو فەرموودەیەش بەڵگەیە کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی کە (سعدی کوڕی مُعاذ)ی کرد بە حەکەم سەبارەت بە (بنـي قريظة) کە چ بڕیارێکیان دەربارە بدات، (سعد)یش گوتی: بڕیاری ئەوە دەدەم کە نێرەوەزیان سەرببڕرێتو منداڵو ئافرەتیشیان بهێڵرێنەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لَقَد حَكَمتَ فيهم بِحُكمِ المَلِكِ مِن فَوقِ سَبعةِ أرقِعَةٍ))[3]، واتە: بەڕاستی حوکمت تێدا کردن بەپێی بڕیارو حوکمی ئەو خوایەی کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە یە. وە

---

(1) (الملك 17).
(2) (النساء 158).
(3) رواه البخاري.

بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە خوای بەرزو بێوێنە باسی فیرعەون دەکاتو دەفەرموێ: فیرعەون گوتی: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحاً لَعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ. أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِباً﴾(1)، واتە: ئەی هامان کۆشکێکم بۆ دروست بکە، تاکو بگەمە ڕێیەکان، ڕێیەکانی ئاسمان و تەماشای پەراستراوی موو سا بکەم. هەرچەندە پێشم وایە ڕاست ناکات! کەواتە دیارە فرعەون لە مووسای بیستوە کە خوا لە ئاسمانو لە سەروویە، بۆیە دەڵێ: کۆشکێکم بۆ دروست بکە، با تەماشای بکەم بزانم ڕاست دەکات! دواییش دەڵێ پێم وایە کە ڕاستیش ناکات. دیارە بەڵگەی دیکەش زۆرنو ئەوانە هەندێکیانن لەبەرئەوە، ئێمە دەڵێین، خوای بێهاوەڵو هاوتا لە ئاسمانە، لە سەروویە، بەڵام نابێ بگوترێ لە نێو ئاسمان دایە، وەك پێشتریش باسمان کرد چونکە خوای مەزن: ﴿بائِنً مِن خَلْقِهِ﴾ لە دروسکراوەکانی خۆی جیایەو لە نێو دروستکراوەکانی خۆیدا نیەو دروستکراوەکانی خوا زۆر لەوە بچووکترن کە خوای بەدیهێنەر بچێتە نێویان، کەواتە: خوا لە ئاسمانە، واتە خوا لە بەرزیيە چونکە (سماء) لە زمانی عەرەبیدا، بە مانای بەرزیيە، کە دەشفەرموێ: حەوت ئاسمانەکان (سبع سموات) دیارە ئەو حەوت ئاسمانانە هەر حەوتیان شتێکن زۆر بچووکترن لەو (عرش)ەی خوا

---

(1) (غافر - 36، 37).

(سبحانەو تعالی) کە بە مەزن (عظیم)و پایەدار (مجید)و بەڕێز (کریم) وەسفی کردوە[تر].

(3) (سیفەتی سێیەم)ی خوای مەزن کە نابێ تەئویل بکرێ، بریتیە لە: هاتنی لە ڕۆژی دواییدا، وەك فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ﴾[یر]، وە فەرمووویەتی: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾[سە]، هەروەها لە چەند جێیەکی دیکەش لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، دیارە سیستەمو کاروباری دوارۆژیش لەهی دنیا جیاوازەو دەڵێین: خوای بێوێنە لە ڕۆژی دواییدا دێت بەو شێوەیەی کە لە خوا دەوەشێتەوە، ئێمە نازانین چۆنە، واتە دێ بۆ شوێنی لێپرسینەوە، چونکە سیاقی ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنێ، بەلام وشەکانی دیکەی وەك: (الأحاطة، النزول الـى السماءِ الدنيا، المعيّة، الهرولة، قِبَلَ الوجه...) واتە: دەورەدان، هاتنە خواری خوا بۆ ئاسمانی دونیا، لەگەڵدا بوونی خوا بۆ دروستکراوەکانی، ڕووبەڕوو وەستانی خوا بۆ نوێژکەر، وە ڕاکردنی خوا بەرەو بەندەی خۆی... هەموو ئەم وشانە، مەگەر چۆن، ئەگەرنا زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە دەبێ تەئویل بکرێن، چونکە بەڵگەی

---

(تر) 1- ﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (النمل 26).
2- ﴿ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ﴾ (البروج 15).
3- ﴿لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ (المؤمنون 116).

(یر) (البقـــرة – 210).

(سە) (الفجـــر – 22).

شەرعیی‌و عەقڵی زۆر هەن، ناچارمان دەکەن کە ئەوانە هەموویان تەئویل بکەین، (إحاطة) دەورەدانی خوا وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ اللّٰهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطاً﴾[1]، دەبێ بڵێین خوای بێ‌هاوەڵ‌و هاوتا بە زانیاری و دەستەڵات (علم‌و قدرة)ی خۆی دەورەی هەموو شتێکی داوە، وە (النُّزول الـى السَّماء الدُّنيا) هاتنە خواری خوا بۆ ئاسمانی دونیا، دەبێ بە شێوەیەك (تەئویل) بکرێ، کە لەگەڵ لەسەر (عرش) بوونی خوادا بگونجێ، ئێمە دەڵێین: خوا لەسەر (عرش)ە، جا ئەگەر خوا لە سەر (عرش) بێت، ئەگەر بێت بۆ ئاسمانی دونیا بەو چەمك و واتایەی کە لە مێشکی ئێمەدا هەیە، نارێکی لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا درو ست دەبێت، چونکە لە فەرموودەکەدا دەفەرموێ: ( لە سێیەکی کۆتایی شەودا خوای پەروەردگار دێت بۆ ئاسمانی دونیا ) جا دیارە سێیەکی کۆتایی شەو، هەموو کاتێك بەسەر گۆی زەویدا دابەش دەبێ‌و هەمیشە لە نوختەیەکی ئەم سەر زەوی‌یەدا سێیەکی شەوە! بۆیە ئەگەر بگوترێ: خوای پەروەردگار بە زاتی خۆی دێتە خوارێ لە سێیەکی شەودا، دەبێ بڵێین: خوا بە دەوری زەوی‌دا دەسوورێ لەگەڵ سووڕانی سێیەکی شەودا، وە هەرگیز ناچێتەوە بۆ سەر (عرش)!! کەواتە دەبێ بڵێین: نەخێر، هاتنە خواری خوا بۆ ئاسمانی دونیا لە سێیەکی کۆتایی شەودا، چەمك‌و واتایەکی دیکەی هەیە کە لەگەڵ خوای بەرزو بێ وێنەدا بگونجێ و مەبەست مانا ڕواڵەتییەکەی نیە، وە (معيّة) لەگەڵدا بوونی خوا بۆ

---

[1] ( النسـاء – 126) .

ئێمە (وهو معكم أينما كنتم)، باسمان كرد كە لەگەڵدا بوونی خوایە بە زانیاریو دەستەڵاتو توانایە، وە (قـبل الو جە)و (هرو لة) ڕوو بەڕوو وەستانی خوا بۆ نوێژکەر، وە ڕاکردنی خوا بەرەو بەندەکانی، وەك پێ شتر باسمان کرد بە هەمان شێوە بە مانای لـێ نزیك بوونەوەی خواو پاداشت دانەوەو زیادبوونی خۆشوی ستنیەتی بۆ بە ندەکانی، نەك بە ما نا ڕواڵەتییەکەی کە لەگەڵ خوادا ناگونجێ.

## ( بەشی سـێیەم ) لە سیفەتە خەبەرییەکان:

ئەمانیش لە ڕووی تەئویل کرانو بەرێکرانەوە دووبەشن:

(1) ئەو سیفەتانەی وەك: قـ سەکردن، پێ کەنین، شادمان بوون، تووڕەبوون، خۆشویستن، ڕق لـێبوونەوە، ڕەزامەندیی... هتد. زۆربەی زانایان ئەم سیفەتانەیان تەئویل نەکردوە.

(2) بەلام زۆر بەیان ئەما نەیان تەئویل کردوە: سەر سوڕمان، لەبیـرچوون، فێڵ کردن، پیلان گ ێران، هەڵخەڵەتا ندن، هەنا سە (نَفَس)، شەرم کردن، گاڵتە پێکردن... هتد چونکە ڕواڵەتە کەیان لەگەڵ خوای پەروەردگارو مەز ندا ناگو نجێ و پێ شتریش با سی چۆنیەتی تەئویل کردنی ئەم وشانەمان کرد، بۆیە ل ێرە دوو بارەی ناکەینەوە. لێردا هاتینە کۆتایی باسی ناوو سیفەتەکانی خوا، کە بەشی دووەمی خوا بەیەکگرتن بوو.

وصلى الله على محمد واله وصحبه وسلم

# ئـــەم بەنـــدە

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەندی پێنجەمە، کە لە دەرسی نۆیەم پێکهاتوە، تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەی بابەتی خوا بەیەکگرتن لە پەر ستراوێتیدا (توحید الله في الألوهية)، جا ئێمە خوا پشتیوان بێ لە سێ خاڵی سەرەکیدا ئەم بابەتە دەخەینەڕوو، کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە :

خـاڵی یەکەم: پێناسەی وشەی (ربّ)و وشەی (إله):

خـاڵی دووەم: پەرستن چیەو خواپەرستن چیە؟!

خـاڵی سێیەم: و شەی شایەتمان چاکترین بەرجە ستەکەری: خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتی دا.

شایانی باسیشە ـ وەك پێشتریش باسمان کردوە ـ کە (خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتی دا) یان (یەکتاپەرستی) بەچەمكو واتای ڕا ستەقینەو فراوانی، بناغەو جەوهەری ئیسلام و مسوڵمانەتی یەو ئەو مەبە ستو ئامانجە گەورەو گرنگەیە، کە خوای زاناو کار بەجێ (تبارك و تعالى) تێکرای پێغەمبەرانی پایەبەرزی خۆی (علیهم أفضل الصلوات وأتم التسلیمات) بۆ ڕەوانە کردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ

رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾(١)، وە فەرموو یەتی: ﴿وَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾(٢).

کەواتە: ئەم دەرسی نۆیەمە ـ کە ئاڵقەی سیو پێنچە لە زنجیرە پەنجا دەرسی یەکە ـ ئەگەر لە قەبارەشدا کەمو بچووکە بەڵام لە گرنگیو بایەخدا یەکجار گەورەیە، چونکە باسی گەورەترینو گرنگترین بابەتی ئیسلامو بناغەو جەوهەری مسوڵمانەتیو دینداریی دەکات کە بریتییە لە: ((تەنیا پەرستنی خواو هاوبەش بۆ دانەنانی))و لە ڕاستیدا (یەکتاپەرستی) ئەنجامو بەرهەمی سەرجەم باسو بابەتەکانی پێشەوەیە.

(١) (النحـّل 36).
(٢) (الأنبيـاء 25).

## خـاڵی یەکــەم:
## پێناسەی وشـەی (ربّ) و وشـەی (إلهُ)

**یەکــەم:** وشەی (ربّ): ئەگەر سەرنجی فەرهەنگەکانی زمانی عەربی بدەین، بۆ وێنە: (لسان العرب، القاموس المحیط، مختار الصَّحاح) وە هەر فەرهەنگێکی دیکە، بەتایبەتی (مفردات ألفاظ القرآن)ی (الرَّاغب الأصفهاني) کە لە ڕاستیدا کەم وێنەیە، بۆمان دەردەکەوێ کە وشەی (ربّ) پێنج واتای هەن.

(یەك): بەخێوکردن و پێگەیاندن (التربیة و التنشئة) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن: (رَبَّ فلانٌ الوَلَدَ) فلان کەس منداڵەکەی پێگەیاند، یان بەخێوی کرد، وشەی (رَبائِب) لە قورئاندا هاتوە، کە خوای پەروەردگار باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە لە پیاو حەرامو قەدەغەن مارەیان بکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ﴾(تر)، لێرەدا (ربائب) کۆی (ربیبة)یە، (ربیبة)ش ئەو کچە بچووك و بێ بابەیە کە هی خۆت نیە، بەڵام لای خۆتو لە ماڵی خۆتدا بەخێوی دەکەیو پێی دەگەیەنی، جا ئەوە پێی دەگوترێ (ربیبة)، ئەگەر (کوڕ)یش بێت، پێی دەگوترێ

(تر) (النسـاء – 23 ).

(رَبِيبْ)، چونکە بەخێوی دەکەی‌و پێی دەگەیەنی‌و پەروەردەی دەکەی.

(دووەم): کۆکردنەوەو خڕکردنەوەو ئامادەکردنی شتێك، (الجَمْعُ و الحَشْرُ و التَّهيئَة)، عەرەب دەڵێن: (فلانٌ يَرُبُّ النّاسَ) واتە: فلان کەس خەڵکی کۆدەکاتەوەو خڕیان دەکاتەوە سەر یەك‌و ئامادەیان دەکات بۆ شتێك، وە وشەی (مَرَبّ) بەو شوێنە دەڵێن کە خەڵکی لێ کۆدەکرێتەوە، (التَّرَبُّب)یش بە کۆبوونەوەو خڕبوونەوە سەریەکی شتێك دەگوترێ.

(سێ): ئاگا لێبوون‌و سەرپەرشتیکردن‌و مشوور لێخواردن، (التَعهُّد والأسْتِصْلاح والرِّعاية)، عەرەب دەڵێن: (رَبَّ فلانٌ ضَيْعَتَهُ) فلان کەس سەرپەرشی مەزراو کشتوکاڵەکەی خۆی کرد، (صفوان بن أميّة) بە (أبو سفيان)ی گوتوە: (لَأَنْ يَرُبَّني رَجُلٌ مِنْ قُرَيشٍ أحَبُّ اليَّ، مِن أنْ يَرُبَّني رَجُلٌ مِنْ هَوازِنَ) واتە: ئەگەر پیاوێك لە قورەیش سەرپەرشتی‌و چاوەدێریم بکات، پێم چاکترە لەوەی کە پیاوێك لە هۆزی هەوازین سەرپەرشتی‌و چاوەدێریم بکات.

(چوار): سەروەریی‌و سەرۆکایەتی‌و حوکمڕانیی (العُلوّ، والسِّيادة والرِّئاسة) عەرەب دەڵێن: (قد ربَّ فلانٌ قَوْمَهُ، أي ساسَهُمْ وجَعَلَهُمْ يَنْقادون لَهُ) واتە: فلان کەس (ربوبية)ی قەومەکەی خۆی

کرد، واتە: سەرپەر شتیو سەرۆکایەتیو حوکمڕانیی کردنو خستنیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

(پ ێنج): خاوە نداریتی کردن (التم لُّك)، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی خۆیدا بە کابرایەکی ئاژەڵداریی گوت: ﴿أَرَبُّ غَنَمٍ أَم رَبُّ إِبِلٍ﴾؟ تۆ خاوەن مەڕو بزنی، یاخود خاوەن حوشتری؟ وا تە: مەڕو بزنت هەن؟ یاخود حوشترت هەن؟ هەروەها لە ز مانی عەرەبیدا دەڵێن: (فلانٌ ربُّ الدّار) فلان کەس خاوەن ماڵە، یان بە ئافرەت دەڵێن: (رَبَّةُ الَبْيت) سەرۆكو سەرپەر شتیکەری ماڵ، وە دەگوترێ (رَبُّ الضَّيْعَة) خاوەنی کێڵگەو مەزرایە، لە فەرِ هەنگی (لِسان العَرَب)دا هەموو ئەو ماناو واتایانەی باسمان کردن هاتوون وەك دەڵێ: (يُطْلَق في اللُّغة على المالِك والسَيِّد والمُدبِّر والمربِّي والقَيِّم والمُنْعِم)(ت)، واتە: وشەی (رب) لە زماندا ئەم واتایانە دەگرێتەوە: خاوەن، سەرۆك، سەرپەرشتیکەر، بەخێوکەرو پەروەردەکەر، بەسەر ڕاگەیشتوو، خاوەن نیعمەتو چاکە بەسەر کەسێکەوە، وە هەروەها (أبو الأعلى المودودي) -ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ-، کتێبێ کی نایابی هەیە بە ناوی (الم صطلحات الأرب عة في الق رآن الك ريم) ئەویش بە هەمان شێوە باسی وشەی (رّب) دەکات، کە لە ڕاستیدا کتێبێکی زۆر باشەو چوار وشەی لە قورئا ندا زۆر جوان شی

(ت) لسان العرب: بەرگی/5 ، لاپەڕە 95.

کردوونەوە، وشەکانیش (الأله، الرّب، العِبادة، الدِّین) کاتی خۆی بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە کاریگەریی زۆری هەبووە، ئنجا ئەگەر سەرنجی قورئان بدەین، دەبینین کە بە هەر پێنج واتاکە خوای مەزن وشەی (رّب)ی بەکارهێناوە، لێرەدا بۆ هەرکام لەم واتایانە ئایەتێکمان هێناوەتەوە، ئەگەرنا ئایەتەکان زۆرن:

(1) (واتای یەکەم): بەخێوکردنو پێگەیاندن، (یوسف) - سەلامی خوای لەسەربێ-، کاتێك کە هاوسەری (عزیز)ی میسر داوای لێ دەکات کە کاری خراپی لەگەڵ بکات، خوای پەنهانزان لەسەر زمانی (یوسف) دەفەرموێ: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾[1]، واتە: گوتی: پەنا بە خوا (کە کاری وا خراپ لەمن بوەشێتەوە) (انه رّبي) ئەو - مێردەی تۆ- بەخێوەکەرو پێگەیەنەری منە، (أَحْسَنَ مَثْوَايَ) زۆر باش منی حەواندۆتەوە (إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ) بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن. هەندێ لە توێژەرەوانی قورئانیش دەڵێن: راناو (ضمیر)ی (إنَّه) بۆ خوا دەچێتەوە، واتە: خوا بەخێوکەرو پەروەردەکەرو پێگەیەنەری منە، وە منی لێرە حاواندۆتەوەو من شتێك ناکەم کە بێ فەرمانی خوا بێت. دیارە هەردووکیان دەگونجێن، بەڵام ئەوەی یەکەمیان نزیکترە، کە بڵێ ئەو مێردەی

[1] (یوسف - 23).

تۆ، من چۆن دەستدرێژی دەکەمە سەر ناموس و ئابڕووی لە کاتێکدا کە ئەو منی بەخێوکردوە لە ماڵی خۆیدا!!

(2) (واتای دووەم): کۆکردنەوە سەر یەك و ئامادەکردنی شتێك، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا﴾(ت)، واتە: بڵێ پەروەردگارمان کۆمان دەکاتەوە، وە لە شوێنێکی دی کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ﴾(ث)، واتە: دوایی گەڕانەوەو کۆبوونەوەتان بۆ لای خوایە، واتە: لە لای خوایەو لەبەردەستی خوا کۆدەبنەوەو خڕدەبنەوە.

(3) (واتای سێیەم): ئاگا لێبوون و سەرپەرشتیکردن و مشوور لێخواردن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبّاً وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾(ج)، واتە: ئەی (محمد) تۆ بڵێ: ئایا جگە لە (خوا) پەروەردگارێکی دی بخوازم، لە کاتێکدا کە ئەو مشوورخۆرو سەرپەرشتیکەری هەموو شتێکە.

(4) (واتای چوارەم): سەرۆکایەتی و حوکمڕانێتی، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ﴾(ح)، واتە: جوولەکەو گاورەکان (الیهود

(ت) (سبأ 26).
(ث) (الزمر 7).
(ج) (الأنعام 164).
(ح) (التوبة - 31).

والنَّصاری) زانـاو ڕاهیـبەکانی خۆیانو (عیسی)ی کوڕی (مریم)یان کرد بە سەرۆك و حوکمڕانیو شت بۆ حەڵاڵکەرو شـت لـێ حەرامکەری خۆیان، لێرەدا وشەی (رّب) بە مانای سەرۆكو حوکمڕان دێت.

(5) (واتای پێنجەم): خاوەنداریێتی، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ. الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ﴾[1]، واتە: با خاوەنی ئەم ماڵە (کعبة) بپەرستن، کە لە برسیەتیدا خواردنی پێداونو لە مەترسیدا هێمنی کردوونەوە، لێرەشدا (ربّ) واتە: خاوەن.

**دووەم:** وشەی (إله): بە سەرنجدان لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی بۆمان دەردەکەوێ کەوشەی (أَلَهَ) یان (أَلِهَ) کە ڕیشە وشەی (إِله)ە ئەم پێنج واتایەی هەن:

(یەك): ئارام و ئۆخژن بۆ هاتن بە هۆی کەسێکەوە، عەرەب دەڵێن: (أَلَهْتُ الى فُلانٍ اي سَكَنْتُ إِلَيْه) واتە: بەهۆی فلان کەسەوە، ئارامیو ئۆخـژن (سکینة)م بۆ هات.

(دوو): پەناو هانا بردنە بەر کەسێك لە کاتی تەنگانەدا، عەرەب دەڵێن: (أَلَهْتُ الى فُلانٍ أَي لَجَئْتَ اليه) واتە: پەناو هانام بۆ لای

[1] (قریش – 3، 4).

فلاّن کەس برد، کە بمحاوێنیێتەوەو بمخاتە ژێر سایەو سێبەری خۆی لەبەر لێترسانی شتێك.

(سێ): ڕووکردنە کەسێك بە ئیشتیاق و تامەزرۆیییەوە، عەرەب دەڵێن: (أَلِهْتُ الى فُلانٍ، أي اتَّجَهْتُ اليه لِشِدَّةِ شَوقي اليه) واتە: ڕووم کردە لای فلاّن کەس، لە بەر ئارەزوو و تامەزرۆییو زۆر خۆشویستنی.

(چوار): هۆگر بوون بە شتێکەوە، عەرەب دەڵێن: (أَلَهَ الفَصِيلُ بِأُمِّهِ أي: وَلِعَ بِها) واتە: بێچووە حوشترەکە هۆگریی دایکی بوو بێگومان هەموو بێچوویەك هەروایە بەرانبەر بە دایکی، بەلاّم وا دیارە بێچووی وشتر زیاتر هۆگری دایکیەتی.

(پێنج): بەندایەتی بۆکردنو پەرستن، عەرەب دەڵێن: (أَلَهَ يأْلَهُ إلهةً وأُلُوهةً) واتە: پەرستی، دەپەرستێ، پەرستن. ئەگەر سەرنجی قورئانیش بدەین دەبینین، کە بەهەر کام لەو پێنج مانایە وشەی (إله) بەکارهاتوە:

(1) (واتای یەکەم) ئارامو ئۆخژن بۆ هاتن بەهۆی کەسێکەوە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا﴾[1]، واتە: لە جیاتی خوا (یاخود لە گەڵ خوا) چەند

---

[1] (مریم - 81).

پەر ستراوێکیان گر توون بۆ ئەوەی بۆ یان ببن بە ما یەی عیززەتمەندیی‌و لەژێر باڵیاندا بحەوێنەوە.

(2) (واتای دووەم) پەناو هانا بردن بۆ کەسێك لەکاتی تەنگا نەو مەترسیدا خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ لَمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ﴾(ت)، واتە ئەو پەرستراوانەی کە لە جیاتی خوا لێ یان دەپاڕانەوە، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن لەکاتێ کدا فەرمانی پەروەردگارت هات بە لە نێوبردنیان، وە ئەو پەرستراوانەیان هەر زیاتر تووشی ماڵوێرانیان کردن.

(3) (واتای سێیەم) ڕووکردنە کەسێك بە ئیشتیاق و تامەزرۆییەوە، خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُمْ مِنَ الْقُرَى وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ۞ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾(ث)، واتە: ئێمە ئەو ئاوەدانی یانەی لە دەورو بەری ئ ێوە بوون (ئەی خەڵکی مەککە) هەموومان لەنێوبردن، وە چەندان جۆرە بەڵگەو نیشانەی خۆمانمان نیشاندان بەڵکو بگەڕێ نەوە، ئەدی ئەوانەی کە لە جیاتی خوا، کردوویانن بە هاوەڵ بۆ خوا،

---

(ت) ( هــود - 101 ).

(ث) ( الأحقاف - 27 ، 28 ).

تاکو لە خوایان نزیك بخەنەوە (ئەو پەرستراوانە)، بۆچی یارمەتی یان نەدان و سەریان نەخستن لەکاتی لێ قەومان و تەنگا نەدا بۆچی بە هانایانەوە نەهاتن؟! بەڵکو هەر لێیان ون بوون، ئەوەش ئەنجامی هەڵبەستراو و درۆیەکانی ئەوان بوو.

(4) (واتای چوارەم) هۆگربوون بە شتێکەوە، خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ اللَّهُ لا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾(ت)، واتە: خوا فەرمووی دوو پەرستراوان مەگرن، یەك پەرستراو هەیە، هەر لەمن بترسن، واتە: خوا تەنیا یەکێکەو با هۆگریی‌و دڵ پێوە پەیوەستبوونتان تەنیا بۆ ئەو خوایە بێت.

(5) (واتای پێنجەم) بەندایەتی‌و پەرستن‌و ملکەچی بۆ کردن، خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهاً وَاحِداً لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾(ث)، واتە (جوولەکەو نەصرانی‌یەکان) زاناو ڕاهیبەکانی خۆیان و مەسیحی کوڕی مەر یەمیان کردن بە (پەروەردگار) لە جیاتی خوا، وە فەرمانیشیان پێ نەکرابوو کە جگە لە تاقە پەرستراوێك ( کە خوا یە) کە سی دی بپەر ستن (چونکە) جگە لەو پەرستراوی دی نیە، پاکی بۆوی لەوەی کە

(ت) (النحل 51).
(ث) (التوبة - 31).

دەیکەن بە هاوەڵ بۆی (لە پەرستنیدا) کەواتە: مانای پێنجەمی (إله) واتە: (معبود) پەرستراو.

بەرێـزان:

لەم برە توێژینەوەیەدا، بۆمان دەرکەوت کە هەرکام لە و شەی (رَبّ، إِله) کۆمەڵێك واتاو چەمکیان هەیە کە هەندێ جار ئەو واتاو چەمکانە دەچنە نێو یەك، کەواتە: ئە گەر ب گوترێ: (ربّ) تەنیا بە وا تای بەخێوکەرو پێگەیەنەر دێت، وە (إِله)یش تەنیا بە مانای پەرستراو دێ، ئەوە ڕاست نیە، بەڵکو هەرکامێکیان کۆمەڵێك واتا یان هەن بەڵام ئەوەندە هەیە، وشەی: ( پەروەردگار)و (پەر ستراو) زەق ترین ما نای (ربّ)و (إِله)ن.

## خـــاڵی دووەم

## پەرستن چییەو خواپەرستی چۆنە ؟

یەکەم: لە ئەسڵی زماندا: وشەی (عبادة) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا ئاوا پێناسە کراوە، دەڵێن: (العبادة هي: التَذلّل و الخُضوع و الطّاعة و الدَّينونة، ومِنْه طريق مُعَبَّد، و بعيرٌ مُعَبَّد، طريقٌ معبَّد إذا كان مُذَلَّلاً بِكَثْرة الوَطْءِ، وبَعيرٌ مُعَبَّدٌ إذا ذَلَّلَهُ القَطِران)[ت]، واتە: وشەی (عبادة) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە واتای ملکەچی، ژێردەستی، فەرمانبەریی، بەقسەکردن، دێ، وە عەرەب دەڵێن: (طريقٌ معبّد) ڕێگەیەکی (معبد)واتە: کە زۆر خەڵك بەسەریدا ڕۆیشتبێ و بە تەواوی مانا نەرم بوو بێت و تەخت و گۆڕ بوو بێ و گرێی تێدا نەمابێت، وە دەشڵێن: (بعيرٌ معبد....) حوشتر کاتێك کە قەترانی لـێدەدەن، دەڵێن: حوشترێکی (معبّد)ە، واتە: ملکەچ و مات و بێدەنگ بووە.

دووەم : لە زاراوی شەرعدا: لە زاراوی شەرعیشدا وشەی (عبادة) بە کورتی ئاوا پێناسە کراوە: (العبادة اسمٌ جامِعٌ لِكُلِّ ما يُحِبُّه اللهُ ويَرْضاه، مِنَ الأقْوال والأعمال الظاهرة والباطنة، ويتَضَمَّن ذلك كَمالَ الخضوع مع كمالِ المَحبّةِ، وكمالِ الخَشْيةِ والتعظيم) واتە:

---

(ت) بڕوانە (لسان العرب) لابن منظور ، بەرگی/10، لاپەڕە (15،10)، وە (القاموس المحيط) لەسەر وشەی (عبد) ، وە (المصطلحات الأربعة) لأبي الأعلى المودودي.

وشەی[تر](عبادة) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی خوا خۆشی دەوێن، لە قسەو کردەوەی ڕواڵەتو پەنهان، ئەوانە هەموویان لەگەڵ ئەوپەڕی گەردن کەچیو لەگەڵ ئەو پەڕی خۆ شویستن، وە لەگەڵ ئەوپەڕی لێترسانو لەگەڵ ئەوپەڕی بە گەورەگرتنیدا (بۆ خوای پەروەردگار) واتە: هەموو پێکەوە ئەمانە کۆببنەوە پێیان دەگوترێ: (عبادة) خواپەرستی، شایانی باسیشە کە وشەی (عبادة) بە هەموو ڕێژگە (صيغة)کانی یەوە لە قورئانیدا بە دوو چەمكو واتا بەکارهاتوە:

أ ـ چەمكو واتایەکی گشتیو فراوانو پڕبەپێستی ئەو پێناسەیەی باسمان کرد کە دەرودەروونی ئینسانو سەرجەم بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەران دەگرێتەوە .

ب ـ چەمك و واتایەکی تایبەتی کە لە سێ بواردا خۆی دەبینێتەوە، کە ئەمانەن:

1 ـ ملکەچی و ژێردەستەیی، (العبودية والخضوع).

2 ـ فەرمانبەریی و پابەندیی بە حوکمو بەرنامەوە، (الطاعة والألتزام بالشريعة والحكم).

3 ـ ئەنجامدانی دروشمەکانو خوا پەرستی یە تایبەتی یەکان، (أداء الشَّعائر والنُّسُك).

---

(تر) واتە وشەی (عبادة) لە زاراو (إصطلاح)ی شەرع داو عیبادەتێك کە بۆ خوا ئەنجام دەدرێ نەك هەر عیبادەت و پەرستنێك بەڕەهایی و بۆ هەرکەسێك ئەنجام بدرێ !

بەڵێ وشەی (عبادة) وێرای واتاو چەمکە گشتیو فراوانەکەی کە بە زۆری لە قورئان وابەکارهێنراوە، بەم سێ واتا سەرەکییانەش هاتوە، وەك دواتر ئایەتەکانی لەسەر دەهێنینەوە. بەڵام وەك پێشتر گوتمان بە زۆری وشەی (عبادة) لە قورئانیدا بە مانا فراوانو گشتگیرەکەی بەکارهاتوە کە هەرکام لەو سێ واتا تایبەتی یە لەیەك کاتدا پێکەوە کۆ دەکاتەوە، ئێستاش با چەند ئایەتێك بە نموونە بۆ هەرکام لەو دوو چەمکە بێنینەوە:

یەکەم: چەند ئایەتێك کە وشەی (عبادة) یان مانا یەکی فراوان و گشتگیرتیێدا بەکارهاتوە:

یەك: بۆ وێنە خوا (عزّو جل)فەرموو یەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾(1)، واتە: وە من جینو ئینسانم تەنیا بۆ ئەوە دروست کردوە کە بمپەرستن. لێرەدا وشەی بەندایەتیو پەرستن (العبادة) زۆر فراوانە، بە چەمكو واتای فراوانی پەرستنو بەندایەتی بۆ کردن بەکارهاتوە کە هەموو شێوەکانی خوا پەرستی دەگرێتەوە.

دوو: هەروەها لەم ئایەتانەشدا بەهەمان شێوە وشەی ناوبراو بە مانای فراوانو گشتی بەکارهاتوە کە خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ دِيناً قِيَماً مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ.قُلْ إِنَّ

(1) (الذاريات - 56).

صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1]، واتە: تۆ بڵێ: بێگومان پەروەردگارم منی رێنمایی کردووە بەرەو رێبازێکی راست، بەرنامەیەکی رێكو راست کە رێبازی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام)ەو ئەویش وازی لە هەموو شتێکی پووچ (باطل) هێنابوو و هاتبوە سەر راستە شەقام (یاخود و شەی (حنیفاً) وەسفی (دین)ە یانی ئایینی من (دین)ێکی (حنیف)ە، واتە: لە خلّتەو خالّ خالّیەو پاكو بێگەردە) وە بلّێ: من لە هاوبەش بۆخوا ـ دانەران نیم. ئنجا ئایا ئەوە چۆنە، کە ئینسان تەنیا خواپەرست بێ و دینداریی راست بکات و هاوبەشی بۆ دانەنێت؟! ئەوەیە کە دواتر دەفەرموێ: (قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) بلّێ: نوێژمو قوربانی سەربرینمو ژیانمو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، (لاشَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) هاوبەشی نیە، وە من بەوە فەرمانم پێکراوە، وە من یەکەمینی مسولّمانانم، دیارە ئەم سێ ئایەتە واتای فراوان و گشتگیریی (عبادة)یان گرتۆتەخۆ.

سێ: وە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾[2]،

---

[1] (الأنعام – 161، 163).

[2] (يوسف – 40).

واتە: حوكم‌و فەرمانڕەوایەتی تەنیا هی خوایە، فەرمانی كردوە كە تەنیا ئەو بپەرستن، ئا ئەوە دینداریی ڕێك‌و ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن. سەرنج دەدەین دەبینین كە سێ وشە كراون بە هاوواتا (مترادف) كە بریتین لە (عبادة، حكم، دين) چونكە دەفەرمویٚ: (إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ) حوكم تەنیا هی خوایە، (أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ) وەك چۆن حوكم تەنیا هی خوایە، فەرمانیشی كردوە كە تەنیا ئەو بپەرستن، (ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) ئائەوەش دینی ڕاستە، كەواتە، دینی ڕاست ئەوەیە كە تەنیا بەندایەتی بۆ خوا بكەی، تەنیا بەندایەتیش بۆ خوا ئەوەیە كە لە ژیانتدا تەنیا خوا حاكم بێت، هەم بە مانای بەرنامە دانان (التشريع)، هەم بە مانای حوكمڕانی‌كردن بە پێی ئەو شەریعەتەی كە خوا دایناوە.

دووەم: لە چەند ئایەتێكیشدا وشەی (عبادة) بە چەمك‌و واتای تایبەت هاتوە، كە وەك پێشتریش باسمان كرد ئەم سێ واتاو چەمكەن:

## (1) ملكەچی‌و ژێردەستەیی (العبودية والخضوع):

یەك: ـ وەك لەم ئایەتانەدا دەردەكەوێ خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾[1]، واتە: هیچ كەس لە ئاسمانەكان و زەویدا نیە مەگەر بە بەندایەتی دێتەوە لای ـ خوای ـ خاوەن بەزەیی. بەڵێ: لە ڕۆژی دواییدا هیچ

(1) ( مريم 93 ).

کەس نیە کە وەك بەندەیەکی ملکەچ و ژێردەست نەیەتە بەردەم دادگای خوا (سبحانەو تعالی) لێرەدا خوای بێهاوتا فەرموویەتی هەموو کەسێك هەر بە ملکەچیو ژێردەستەیی د یێت، کەوا تە ناگونجێ لێرەدا مەبەست لە وشەی (عَبْداً) بەندایەتی ئیختیاری بێت، چونکە دەفەرموێ: هەر هەموویان بە بەندا یەتی دێ نە بەردەم دادگای خوا، ئاشکرا شە کە ئیز سانەکان هەموویان بەندایەتی ئازادانەو ئیختیارییان بۆخوا ئەنجام نەداوە! کەوابوو مەبەست پێی ملکەچیو ژێردەستەیی یە چونکە لە دون یادا ئینسان دەتوانێ ملکەچی ئایین و شەریعەتی خوا نەبێت، بەڵام لە قیامەتدا هیچ کەس نیە کە ملکەچ و ژێردەستە نەبێت!.

دووەم- وە لە ئایەتی (22)ی (الشعراء)دا دیسان وشەی (عبادة) بە هەمان واتا هاتوە وەك لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا با سکراوە کە باسی وتووێژی نێوان مووساو فیرعەون دەکەن، کاتێك کە خوا (عزّوجلّ) مووسا (علیه السلام) ڕەوانەی لای فیرعەون دە کاتو پێی دەڵێ: ئەی فیر عەون تۆ ڕا ست نا کەی پەروەردگارو پەرستراونی، بەڵکو خوایەکی پەروەردگار هەیە کە منی ناردوە تۆ بانگ بکەم کە بەندایەتی بۆ بکەیو چیدیکەش بەنی ئیسرائیل زەبوون نەکەی و ئازار نەدەی! فیرعەونیش منەتی لەسەر دەکات و دەڵێ: ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ وا تە: ئەدی ئێمە تۆمان پەروەردەو بەخێو نەکرد، وە تۆ چەندان ساڵ لە

تەمەنی خۆت لە نێو ئێمەدا نەمایەوە؟ دیارە فیرعەون بە خەیاڵی خۆی دەیەوێ مووسا منەتبارو چاو بەرەژێر بکات، بەوەی کە چاکەی خۆی بە چاودا دەداتەوە. بەڵام مووسا (علیە الصلاة والسلام) بە بەڵگەیەکی دەم شکێنو زۆر بەهێز وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾(تر)، واتە: ئەوە کەی منەتو چاکەیەکە تۆ بە چاوی منی دادەدەیەوە؟! خۆ لە چاکەو پیاوەتیی خۆت نەبوو کە من لە ماڵی ئێوەدا بەخێوکرام، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، تۆ بەنی ئیسرائیلت کرد بوو بە کۆیلەو ژێردەستەی خۆت. کەواتە لێرەدا مەبەست لە ڕستەی (أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ) ئەوەنیە کە بەنی ئیسرائیل فیرعەونیان پەرستبێ! چونکە ئاشکرایە کە ئەوان هیچ عیبادەتێکی ئیختیارییان بۆ فیرعەون ئەنجام نەداوە، بەڵکو تەنیا ئەوەندە بووە کە فیرعەون بە زۆر ملی پێیان کەچ کردوەو ژێردەستەی کردوون.

سێ: هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَى وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ. إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً عَالِينَ. فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾(ير)، واتە: مووساو برایەکەی هارون (علیهما الصلاة والسلام) بە نیشانەکانی خۆمانەوەو بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە

---

(تر) (الشعراء: 22).

(ير) (المؤمنون: 45، 47).

ناردمانن بۆ لای فیرعەونو دارودەستەکەی، بەڵام ئەوان خۆیان بە زل گرتو گەلێکی سەرکەشو خۆ بە بەرزگر بوون، وە فیرعەونو داروودەستەکەی گوتیان: ئایا بڕوا بێنین بە دووکەسی وەك خۆمان (وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ) لە کاتێکدا کە قەومەکەشیان ملکەچ و ژێردەستەی ئێمەن؟! دیارە لێرەدا وشەی (عابدون) مانای ئەوەنیە کە قەومەکەی مووساو هاروون، ڕکووعو سەجدەیان بۆ فیرعەونو داروودەستەکەی بردبێتو نوێژو ڕۆژوویان بۆیان کردبێت، بەڵکو واتە: ملکەچو ژێردەستەی ئێمەن! کەوا تە: ملکەچی و ژێردەستەیی بە ڕەهایی یەکێکە لە واتاکانی وشەی (عبادة) لە قورئانیدا.

## (2) فەرمانبەریی‌و پابەندبوون بە حوکمی شەریعەتەوە (الأطاعة والألتزام بالشريعة).

بەڵێ وشەی (عبادة) بەم واتا تایبەتی یەش هاتوە، وەك لەم چەند ئایەتانەدا دەبینرێ:

یەك:- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، لەو ڕۆزی یە پاكو چاكانەی پێمان داون بخۆنو سوپاس گوزاریی بۆ

---

[1] ( البقـرة 172 ).

خوا بکەن، ئەگەر ئەو دەپەرستن‌و بەندايەتی بۆ دە کەن. لە یرەدا ڕستەی (إِنْ كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْـبُدُونَ)، وا تە: ئە گەر ڕا ست دە کەن عيبادەت بۆ خوا دەکەن و بە شەريعەتی خواوە پابە ندن، ئەوە دەبێ هەرچی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لێی بەهرەمەندبن‌و ئەوەش کە لێی قەدەغە کردوون خۆتانی لـێ دووربگرن، وە دەبێ سوپاس گوزاريش بن بۆ خوا، واتە: نيعمەتەکانی خوا لە ڕەزامە ندیی خوادا بەکاربێنن. کەواتە: پابە نديی بە شەريعەت‌و حەڵاڵ‌و حەرامی خواوە، عيبادەتە بۆ خوا، بە پێچەوانەشەوە پابەنديی بە بەرنامەو حەڵاڵ‌و حەرامی هەر کەس‌و لا يەنێکی ديکە شەوە بەندايەتیو پەرستن ئەنجامدانە بۆی!

دوو:- ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ بِشَرٍّ مِنْ ذَلِكَ مَثُوبَةً عِنْدَ اللَّهِ مَنْ لَعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ﴾(1)، واتە: ئەی ـ محمـــد ـ ﷺ پێيان بڵێ ئايا هەواڵتان پێ بدەم بە کەسانێك کە سزای هەرە خراپيان هەيە لەلای خوا؟! ئەو کەسانەن کە خوا لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستوونەوە، وە لێ يان تووڕە بووە، وە هەندێکيشيانی لـێکردوە بە مەيموون و بەراز، وە کەسانێك کە طاغووتيان پەرستوە، ئا ئەوا نە سزايان زۆر خرا پە! کەوا تە، لێرەش لە ڕستەی: (وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ)دا، واتە طاغووتی پەرستوە، وشەی (عبادة) بۆ ملکەچی بۆ بەرنامەو دەستووری غەيری خوا

(1) (المائدة 60).

بەکارهێنراوە، چونکە: ئایا طاغووت چۆن دەپەرستریٚ؟، دیارە (طاغوت) بریتیە: لە هەر حوکمڕانێك کە خۆی لە سەر خەڵك کردوە بە حوکمڕانو دەستەڵاتدار بە ناحەق، وە بە هەواو ئارەزووی خۆی حوکمیان بەسەردا دەکاتو بەرنامەو حەڵاڵو حەرامیان بۆ دادەنێتو دیاری دەکات، ئەوانیش فەرمانبەریی بۆ دەکەنو بە قسەی دەکەن. جا ئەو جۆرە پابەندیی یە بە حوکمی طاغووتەوەو ئەو جۆرە فەرمانبەرییو بە قسەکردنەی بریتیە لە پەرستنیو بەندایەتی بۆ کردنی! (طبري) لە پێناسەی (طاغوت)دا دەڵێ: (الطاغوت كل ذي طغيان على الله، فَعُبِدَ مِنْ دونه اما بِقَهْرٍ مِنْهُ لِمَنْ عَبَدَهُ، وإمّا بِطاعةٍ مِمَّن عَبْدَهُ لَهُ، إنساناً كان ذلك المعبود، أو شيطاناً، أو صنماً أو وثناً، أو كائناً ماكان مِنْ شيء)(ترٍ)، واتە: (طاغوت) بریتیە لە هەر خاوەن سەرکێشیو یاخی بوونێك لە بەرانبەر خوادا، هەر کەسێك یاخی بووبیٚو سەرکێشی کردبێت لە بەرانبەر خواداو لە جیاتی خوا (یان لەگەڵ خوادا) پەرسترا بێت، چ بەهۆی ئەوەوە کە ملی کەچ کردوە بەو کەسانەی کە بەندایەتی بۆ دەکەنو بەقسەی دەکەنو ملکەچنی، وە چ بەهۆی ئەوەوە کە ئەوان بە هەڵبژاردن (اختيار)ی خۆیان ملکەچیی بۆ بکەن، جا ئەو (پەرستراو (معبود)و مل بۆ کەچکراوو لە خوا یاخی)ە، چ ئینسان بیٚ، چ شەیطان بیٚ، چ بت (صنم)ێك بیٚ کە

(ترٍ) تفسير طبري : بەرگی/3، لاپەڕە 13.

لە شێوەی ئینسان و گیانلەبەران دروست کرابێ، یان بت (وثن)ێك بێ کە هیچ شێوەو دیمەنێکی نەبێ، وە چ هەر شتێکی دی بێت. (حیزبێکی کافرو بێبڕوا بێ، یان ڕژێمێکی نەفامیو عەلمانی بێ، یان ئارەزوو و مۆدێل بێ، یان پارەو سامان بێ... هتد) هەر شتێك بێ مادام ملکەچی بۆ بکرێ و بەقسەی بکرێ وەك چۆن بەقسەی خوا دەکرێ، ئا ئەوە (طاغوت)ە.

سێ: ﴿وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى﴾[ع]، واتە: ئەوانەی کە خۆیان لە طاغووت بەدوور گرتوە کە بیپەرستن، وە گەڕاونەوە بۆ لای خوا، موژدەیان هەیە (کە خوای بەخشندە لێیان خۆش دەبێت).

چوار: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[غ]، واتە: ئەی وەچەی ئادەم ئایا پێم ڕانەگەیاندن کە شەیطان نەپەرستن، چونکە ئەو بۆ ئێوە زۆر دوژمنێکی ئاشکرایە!. دیارە جگە لە (یەزیدی یەکان)[سم]، کە شەیطان دەپەرستنو بە (مەلەك طاووس)ی ناودەبەنو ناوی شەیطان بە پیرۆز دەگرن، کەس شەیطان ناپەرستێ، بەو مانایە کە سەجدەو

---

(تر) ( الزمـر – 17 ).

(یر) ( یـس – 60 ).

(سم) ڕەنگە خەڵکێکی دیکەی تاك و تەرای کەمیش هەبن کە لەم لاولای دنیا شەیطان بپەرستن.

ڕکووعی بۆ بەرێ و درووشمەکانی پەرستن (عبادة)ی بۆ ئەنجام بدات، کەواتە بۆچی خوای کاربەجێ بە هەموو وە چەی ئادەم دەفەرموێ: شەیطان مەپەرستن! وە ئایا پەرستنی شەیطان یانی چی؟! بێگومان بریتییە لە فەرمانبەریی بۆ کردنی و شوێنکەوتنی وەسوەسەی و ئەو ئارەزووانەی کە شەیطان دەیانڕازێنێتەوە، ئەو بەرنامەو ڕێچکانەی کە شەیطانە ئادەمییەکان دایان دەنێن.

## (3) ئەنجامدانی دروشمەکان و خوا پەرستی یە تایبەتی یەکان (أداءُ الشعائر والمناسك).

وەك: ڕکووعو سەجدە، نوێژکردن، ڕۆژوو گرتن، دووعاو پاڕانەوە، قوربانی سەربڕین، نەزرکردن، طەواف و بەدەورەدا خولانەوە،... هتد. ئەگەر سەیری ئەم چەند ئایەتەش بکەین بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە مانایەکی دیکەی تایبەتی وشەی (عبادة) بریتییە لە ئەنجامدانی دروشمەکانو خوا پەرستییە تایبەتییەکان:

یەك:- ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِنْ رَبِّي﴾(1)، واتە: تۆ ئەی محمد ﷺ بفەرموو: من لێم قەدەغە کراوە ئەوانە بپەرستم کە ئێوە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، دوای ئەوەی کە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانم لە

(1) (غافر - 66).

پەروەردگارمەوە بۆ هاتوون. کەواتە پاڕانەوە (دعاء) پەرستن (عبادة)و بەندایەتی (عبودیة) بۆکردنە، جا ئەو پاڕانەوەیە لە هەرکەسێك و هەر شتێك بێت، خوای بەرزو مەزن یان غەیری وی، وەك لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلا تَدْعُو مَعَ اللَّهِ أَحَداً﴾(تر)، واتە: وە مزگەوتەکان تەنیا هی خوان، جا لەگەڵ خوادا هاواری کەسی دی مەکەن و لە کەسی دی داوا مەکەن و مەپاڕێنەوە، واتە: مزگەوت بەس بۆ ئەوەیە کە خوای تێدا بپەرسترێ دەجا ئێوە جگە لە خوا لە کەس مەپاڕێنەوە، چونکە پاڕانەوە جۆرێکە لە پەرستن (عبادة)و بۆ هەر کەس و هەرشتێك ئەنجام بدرێ ئەوە پەرستراوەو بەندایەتی بۆ کراوە!

دوو:- ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَى أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيّاً.فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلّاً جَعَلْنَا نَبِيّاً﴾(یر)، واتە: (ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) بە بابی و گەلەکەی خۆی گوت): من واز دێنم لە ئێوەو لەوەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، وە من لە پەروەدگاری خۆم دەپاڕێمەوە، ئومێدم وایە کە پەروەردگارم وەڵامم بداتەوەو بێبەش نەبم، جا کاتێك ئیبراهیم لێیان دوورکەوتەوەو لەوەش دوورکەوتەوە کە لە جیاتی خوا دەیانپەرست ئیسحاقی

(تر) ( الجـن – 18 ).
(یر) ( مریـم – 48، 49 ).

کوڕی‌و یەعقوبی  نەوەی- یمان پێ بەخشی‌و هەرکامێکیشیانمان کردە پێغەمبەر. کەواتە: پاڕانەوە لە خوا یان غەیری خوا بریتیە لە پەرستنی خوا (عزّوجلّ) یا غەیری خوا،

سـێ:- ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلائِكَةِ أَهَؤُلاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ.قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ﴾()، وا تە: وە ئەو ڕۆژەی هەمووان کۆ دەکاتەوە ـ لە ڕۆژی دواییدا ـ دوایی بە فریشتەکان دە فەرموێ: ئایا ئەوانە ئێوەیان دەپەرست؟! ئەوانیش دەڵێن: پاکی بۆتۆ، هەر تۆ سەرپەرشتیکەرو پەرستراوی ئێمەی دوور لەوان، بەڵکو ئەوان (جینن)یان دەپەرست، وە زۆر بەیان ئیمان یان پێ یان دەهێ نا. کەواتە: تەسلیم بوون بە شەیطانەکان و گرتن یان بە دۆ ستو پشتیوان بە پەرستنیان دا دەنرێ!

چـوار:- ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾(ھ)، واتە: ئەوانەی کە لە جیاتی خوا (یان لە گەڵ خوا) چەند دۆست‌و سەرپەرشتیکەرێکیان بۆ خۆیان گر توە، دە ڵێن: ئێمە نایانپەرستین مەگەر بۆ ئەوەی کە لە خوامان نزیك بخەنەوە. کەواتە: گرتنی غەیری خوا بە دۆست‌و پشتیوان‌و سەرپەرشتیار بە پەرستنی غەیری خوا دادەنرێ!

(تر) ( سـبـاء – 40 ، 41 ).

(یر) ( الزمـــر – 3 ) .

پێنـج:- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(تر)، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕکووع بەرنو سەجدە بەرنو پەروەردگارتان بپەرستنو چاکە بکەن بەڵکو سەرفراز بن، وەك دەبینین: سەرەتا باسی ڕکووعو سەجدە دەکات، دوایی دەفەرموێ: (واعبدوا ربکم) وە پەروەردگارتان بپەرستن! جا ئەمە پێی دەگوترێ: (ذکر العام بعد الخاص) چونکە بێگومان پەرستنی پەروەردگار (سبحانەو تعالی) شتێکی گشتی یەو ڕکووعو سەجدەش دەگرێتە خۆی، کەواتە هەرکام لە ڕکووعو سەجدەبردن بۆ خوا یان بۆ غەیری خوا جۆرێکن لە پەرستن (عبادة).

شـەش:- ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ۞ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾(یر)، واتە: ئێمە (کوثر)مان بە تۆ بەخشیوە، جا تۆ نوێژ بەس بۆ پەروەردگارت بکەو قوربانیش تەنیا بۆ ئەو سەربڕە، کەواتە: وەك چۆن نوێژ جۆرێکە لە پەرستنەکان و دەبێ بەس بۆ خوا ئەنجام بدرێ، قوربانی سەربڕینیشیە بە هەمان شێوە.

حەوت:- ﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾(سە)، واتە: سەفاو مەروە، لە

---

(تر) ( الحـج – 77 ).
(یر) ( الكوثـر – 1 ، 2 ).
(سە) ( البقـرة – 158 ).

درووشمەکانی خوان جا هەرکەسێك حەجی ماڵی خوای کرد، یان عومرەی کرد، گوناحی ناگاتێ کە طەوافیان بە دەورەدا بکات.
کەواتە: سەربڕینی قوربانی بۆ خەڵك، یان بە غەیری ناوی خوا، وە طەواف کردن بە دەوری گۆڕ (قبـر)و هەر شتێکی دیکەدا بە نیازی پەرستن، وە ڕکووعو سەجدە بردن، پاڕانەوە، ئەوا نە هەر هەموویان بریتین لە بەندایەتی (عبودیة)و پەرستن (عبادة)، ئەگەر بۆ خوا بن، ئەوە بۆ خوان کە هەر ئەویش پەرستراوی ڕاستەقینەو شیاوی پەرستنە، وە ئەگەر بۆ غەیری خواش بن، ئەوە بێگومان هاوبەش پەیداکردن (شرك)ە بۆ خوای بالادەستو بێهاوەڵو تەنیا (سبحانه و تعالى). چونکە پەرستن (عبادة) بەس مافی خوایەو هیچ کەسو هیچ شتێکی دیکە نابێ هیچ کام لە جۆرو شێوەکانی پەرستنی بۆ ئەنجام بدرێن. (کوثر)یش کە مانا کەی چاکەی زۆر (الخیر الکثیر)ە بە: قوڕئانو پێغەمبەرایەتیو ڕووباری کەوسەر لە بەهەشت، تەفسیرکراوە.

## خـاڵی ســـێیەم

## وشەی شایەتمان: چاکترین بەرجەستکەری: خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتی دا: (لا اله الا الله محمد رسول الله).

بەرێزان!

وەکو پێشتر گوتمان خوا پەرستیی‌و بەندایەتی بۆ خوا ( جل جلالە)، دەرودەروون (ظاهر و باطن)ی ئینسان‌و سەرجەم لایەنەکانی ژیانی تاك‌و کۆمەڵ، بە عیبادەت‌و سیاسەت‌و طاعەت‌و کەسابەت‌و وردو درشتەوە دەگرێتەوە، واتە کە دەگوترێ: عیبادەت (العبادة) نابێ زەین‌و بیرمان تەنیا بە لای نوێژو ڕۆژوودا بچێت، بەڵکو نوێژو ڕۆژوو و زەکات‌و حەج‌و زیکرو ئەوانە، دروشم‌و نیشانەی خوا پەرستیی‌و عیبادەتن‌و ئێمە بەو پێنج دروشم‌و نیشانانە دەزانین کە ئەو کەسە مسوڵمانە، یان مسوڵمان نیە، خوا پەرستە یان غەیری خوا دەپەرستێ، ئەگەر نوێژو ڕۆژوو و زەکات‌و حەج‌و زیکرو یادی خوامان لێ بینی، دەڵێین دیارە مسوڵمانە، بەڵام خوا پەرستیی‌و بەندایەتی بۆ خوا تەنیا لەو پێنجانەدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو ئەو پێنجانە چەند جۆرێك و گۆشەیەکن لە عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوا (سبحانەو تعالى)، هەرچەندە زۆر گەورەو پڕ بایەخ‌و گرنگن، بەڵام لە ڕاستیدا گۆشەیەك‌و بەشێکن لە خوا پەرستیی‌و بەندایەتی بۆ خوا.

بەڵێ بەڕێزان!

وشەی (عبادة) بە چەمك‌و واتا شەرعی‌یە باوەكەی كە لە زمانی كوردیدا بە: (خوا پەرستی) تەرجەمە دەكرێ، هەموو لایەنەكانی ژیان‌و گوزەرانی تاك‌و كۆمەڵ دەگرێتەوە: سیاسەت‌و ئابووریی‌و بازرگانیی‌و كاروباری خێزان (الأحوال الشخصية)و هەڵس‌وكەوت لە گەڵ خەڵك، جەنگ‌و جیهاد، سوڵح و ئاشتی... هتد. بە كورتی هیچ شتێك نییە لە ژیانی مرۆڤدا كە چەمكی وشەی (عبادة) نەیگرێتەوە، چا كاتێك خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1]، واتە: جینن‌و بەشەرم بەس بۆ ئەوە دروستكردوون كە بمپەرستن، ئەگەر هاتباو عیبادەت تەنیا نوێژو ڕۆژووو ئەو شتانە بوایە، دەبوو هەمیشەو بەردەوام هەر لە مزگەوت‌و سەر بەرماڵ باین، تاكو بتوانین ئەو حیكمەتەی بۆی دروستكراوین بیهێنینە دی! بەڵام هەرچی بكەین لەم ژیانە دونیاییەدا، مادام لە سنووری شەرع دا بێت‌و بەپێی شەرعی خوا بێت‌و بۆ خوا ئەنجامی بدەی، ئەوە بێ‌گومان عیبادەت‌و خواپەرستی یە، واتە: مادام جم‌وجۆڵ‌و چالاكی یەكان هەموویان مۆری شەرعیان پێوە بێت‌و مۆری بۆ خوا بوونیان پێوە بێت، مانای وایە هەموویان هەر بە عیبادەت لە قەڵەم دەدرێن، جا پەیوەندییان بە هەر لایەن‌و بوارێكی ژیان‌و گوزەرانی تاك‌و خێزان‌و كۆمەڵگاوە هەبێ، ئنجا خواپەرستی (عبادة)یش دوو پێكهێنەری سەرەكی هەن:

---

[1] ( الذاريات – 56 ).

یەکەم: تەنیا پەرستنی خوا (تبارك‌و تعالی).

دووەم: تەنیا بەو شێوەیە پەرستنی خوا (عزّوجلّ) کە بۆ خۆی د یاری کردوە. وەك زانایان گوتوویانە: (ألاّ نعبد الا الله، وألاَّ نَعْبُدَه الاّ بما شَرَّعه اللهُ)، تەنیا خوا بپەرستین‌و تەنیا بەو شێوەیەش بیپەرستین کە خۆی دیاری کردوە. جا وشەی شایەتمان (كلمة الشهادة): (لا ا له الا الله محمد رسول الله) هەرکام لەم دوو پێکهێ نەرەی عی بادەت‌و بەندایەتی بۆ خوای بە چاکترین شێوە کۆکردوونە تەوە، با بزانین چۆن؟! (لا اله الا الله) واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە (خوا)، جا هەرکات ئینسان ئەو ڕستە بەپێزەی بە زمان گوت و بە کردەوەش لە خۆیدا هێنایە دی، واتە: وەك چۆن بە زمانی قسە وو تار دە ڵێ، بێجگە لە خوا هیچ پەراستراونین بە کردەوەو ز مانی حاڵیش ئەو حەقیقەتەی لە خۆیدا بەرجەستە کرد، ئەوە ما نای وا یە بۆ تە یەکتاپەرست (مُوَ حِّد)، (محمـ ـد ر سول الله) وا تە: موحە ممەد ڕەوانەکراوی خوایە، کاتێکیش ئینسان ئەوەی بە کردەوە جێ بەجێ کردوە، کە تەنیا بە شوێن پێی پێغەمبەردا ﷺ هەنگاو بـ نێ بۆ خواپەرستیی‌و بەندایەتی کردن بۆ خوا، لە هەموو شتێکدا.

بەڵێ ئەگەر بتەوێ: (محمـــد رسول الله) گوتنەکەت ڕاست‌و تەواوبێ‌و ل یێت بـ سەلمێنرێ، دە بێ نوێژە کەت وەك نو یژی پێغەمـ بەر بـ یێت، هەڵس‌وکەوتی ڕۆژانەت، سیاسەتت، پەیوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکانت،

جەنگ‌و ئاشتیت، هەر هەموو شتێکت بە پێی ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ بێت، بە کورتی: کاتێك دەتوانی بڵێی و شەی شایەتمانم هێناوەتەدی، کە: ساغ (مُخْلِص) بی بۆ خوا لە بەندایەتیتدا، کە بە (لا اله الا الله) دێتەدی وە شوێنکەوتوو (مُتَّبِعْ) بی بۆ پێغەمبەری خوا، کە (محمد رسول الله) دەیهێنێتە دی، بۆیە لەبارەی ئەم ئایەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾(1)، واتە: ئەو خوایەی مردن‌و ژیانی ڕەخساندوون بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کامەتان کردەوەی باشترە. کاتێك دەربارەی (أُحسنُ عملاً) پرسیار لە (فُضَیْل)ی کوڕی (عیاض) کرا، کە ئایا وشەی (أَحْسَنُ عَمَلاً) یانی چی؟! لە وەڵامدا گوتوویەتی: (أي: أَخْلَصَهُ وأَصْوَبَهُ) واتە: ساغترو ڕاستترەکەی! گوتیان یانی چی؟! گوتی: کردەوە تا تەنیا بۆ خوا نەبێ ساغ نابێتەوە، دەبێ بە تایبەت بۆ خوا بێت‌و هیچ خلتەوخاڵ‌و ژەنگ‌وژاری پێوە نەبێت، ئنجا ساغ (خالص) دەبێت، وە دەبێ بە پێی سوننەتی پێغەمبەریش بێت، ئنجا ڕاست‌و دروست (صواب) دەبێت، واتە: بۆ خوا بوون‌و بە پێی سوننەت‌و ڕێوشوێنی پێغەمبەری پێ شەوا بوون، شایانی باسیشە وشەی (لا اله الا الله) بە پێی ڕاوبۆ چوونی زۆر لە توێژەرەوانی قورئان، لە گەلێك لە ئایەتەکانی قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، کە لە باسی مەرجەکانی شایەتماندا بە درێژی باسمان کردووە

(1) ( الملك – 2 ).

لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی کورت بە حەوت لەو ئایەتانە دەکەین کە بەڕای هەموویان زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان ئاماژە یان تێدا بە وشەی شایەتمان (کلمة الشهادة) کردوە:

ئایەتی یەکەم: خوای بێهاوتا فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾(1)، لێرەدا (العروة الوثقى) واتە: قوڵفە یان گرێی زۆر مەحکەم و پتەو، دەڵێن: مەبەست پێی: (لا اله الا الله محمد رسول الله) یە (ابن عباس) -ڕەزای خوا یان لەسەربێ-، وای تەفسیر کردوە.

ئایەتی دووەم: ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى ۞ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى﴾(2)، لێرەشدا (صدَّق بالحُسنى) واتە: بڕوای بە چاکترین وشە هەیە، ئەوەش هەر (إبن عباس) گوتوویەتی: (الحُسْنى أي: كلمة الشهادة) وشەی شایەتمان.

ئایەتی سێیەم: ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنْ شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾(3)، لێرەشدا (بغوي) دەڵێ: ((شَهِدَ بالحق أي: شَهِدَ شهادة الحقِّ وهي كلمة (لا اله الا الله محمد رسول الله) )).

---

(1) ( البقـرة – 256 ).
(2) ( الليـل – 5 ، 7 ).
(3) ( الزخـرف – 86 ).

ئایەتی چوارەم: ئەم ئایەتەیە: ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾(تر)، لێرەشدا (ابن جریر)و (ترمذي) دەڵێن: (كلمة التقوى أي كلمة الشهادة).

ئایەتی پێنجەم: ئەم ئایەتەیە:﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾(یر)، ئەمەش (بخاري و مسلم) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە، کە مەبەست لە قسەی چەسپاو (القول الثابت) وشەی شایەتمانە.

ئایەتی شەشەم: وە لە هەمان سوورەتدا ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً﴾(سە)، دەڵێن: مەبەست لە (كلمة طيبة) بریتیە لە وشەی شایەتمان.

ئایەتی حەوتەم: ئەم ئایەتەیە: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾()، واتە: هەرکەسێك چاکە (حسنة) لەگەڵ خۆی بهێنێت ئەوە بە باشتر لەوە پاداشت دەدرێتەوە، وە لە سامو ترسناکی ڕۆژی دواییش دڵنیاو ئەمینە.

لێرەشدا وشەی (الحسنة)، هەرکام لە: (زین العابدین، إبراهیم النخعي) دەڵێن: مەبەست پێی وشەی شایەتمانە، هەروەها لە چەند

---

(تر) ( الفتح – 26 ).
(یر) ( ابراهیم – 27 ).
(سە) ( ابراهیم  24) .
() ( النمل – 89 ).

شوێنێکی دیکەش لە ئایەتەکانی قورئاندا ئاماژەی پێ کراوە، وەك کە زانایانو توێژەرەوانی قورئان باسیان کردوە.

خوێنەری بەڕێز!

ئەمە کورتەو پوختەیەك بوو لەبارەی خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتیدا (توحيد الله في الألوهية)، جا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا ئەم بابەتە گەورەو گرنگە هەرچەند لێرەدا تەنها دەر سێکمان بۆ تەرخان کردوە بەڵام بەوە قەرەبووی بۆ کراوەتەوە کە لە سەرجەم باسو بابەتەکانی ئەم زنجیرە دەرسەدا چ ئەوانەی ڕابردوونو چ ئەوانەی ماون، کەمو زۆر ئەم بابەتە هەر قسەی لەبارەوە کراوەو دەکرێ، چونکە مادام خوا بەیەکگرتن چەقو سووڕگەی ئیسلامەتییو دینداریی بێت دیارە دەبێ وەك هەوێنو تامو خوێ لە هەموو شتێكو هەموو شوێنێکدا هەبێ!

# ئــــەم بەنــــدە

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەندی شەشەمە، کە لە دەرسی دەیەم پێکهاتوە، تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەی بابەتی هاوبەش بۆ خوادانان (الأشراك بالله) بەگشتیو لە هەرسێك بوارە سەرەکی یەکەی:

1 ـ بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی خوا (سبحانەو تعالى).
2 ـ ناوو سیفەتە هەرەچاكو پەسندەکانی خوا (عزّوجلّ).
3 ـ پەرستراوێتی خوا (تبارك‌و تعالى).

باسەکانی ئەم بەندەشمان بۆ پێنج خاڵان دابەش کردوون بەم ناوو نیشانانەی خوارێ:

(1) پێناسەی هاوبەش بۆ خوا دانان و جۆرەکانی.
(2) چۆنیەتی پەیدابوونی هاوبەش بۆ خوادانان بە تایبەتی لە بواری پەرستندا.
(3) خراپی هاوبەش بۆ خوادانانو بەرهەمی شوومیو سزاو حوکمی.
(4) هاوبەش بۆ خوادانانی گەورەو گچکە.
(5) چۆنو بەچی لە هاوبەش بۆ خوادانان قوتار دەبین؟!

شایانی باسیشە کە (هاوبەش بۆ خوادانان) ڕاستەوڕاست دژو پێچەوانەی خوا بەیەکگرتن (توحید الله)ە، بۆیە بەپێی بنچینەی: (وبِضِدِّها تَتَبيَّن الأشياء) شتەکان بە پێچەوانەکانیان چاك ئاشکرادەبن، ئەم باسەش دەبێتە مایەی زیاترو چاکتر دەرەو شانەوەی ڕووی گەش و جوانی خوا بەیەکگرتن و ئەم باسەش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەر لە خزمەتی بابەتی گەورەو گرنگی خوا بەیەکگرتن دایە. هەڵبەتە ئەم بابەتەش وەك بابەتەکانی پێشووی پوختی و گوشراویی زۆری تێدا ڕەچاوکراوە.

بەڕێزان!

بە پشتیوانی خوا ئەم باسەش لە پێنج خاڵدا بە گوشراویی دەخەینەڕوو:

## خـاڵـی یەکــەم:
## پێناســەی هاوبەش بۆ خوادانــان و جۆرەکانی

ئەم خاڵی یەکەمە لە دوو بڕگــــە پێکهاتوە:

### بڕگـەی یەك: پێناســەی هاوبەش بۆ خوا دانــان:

أ ـ لە ئەسڵی زماندا: فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە وشەی (شرك) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا، بە واتای هاوبەشیو تێکەڵیو شەریکایەتی دێت، هەرکام لەم فەرهەنگانەدا: (لسان العرب، القاموس المحيط، مفردات الفاظ القرآن). ئەو مەسەلەیە خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە (لسان العرب) دەڵێ: (الشِّرْكَةُ و الشَّرِكَةْ سواءٌ: مُخالَطَةُ الشَّريكين، يقُال: إشتركنا، بمعنى: تَشارَكْنا، وقد اشْترك الرَّجُل، وتَشَارَك، وشارك أحَدهُما الآخر، وشَرِكْتُهُ في البيع والميــراث أُشرِكُهُ، والأسم: الشِّرك، وفي الحديث: (مَنْ أعْتَقَ شِرْكاً له في عَبْدٍ) أي: حِصَّةً ونصيباً، وقَوْلُهُ ﷺ (الناس شُركاءُ في ثلاث: الكَلأُ و الماءُ و النّار)، وقوله تعالى: (وأشْرِكْهُ في أمري) أي: إجْعَلْهُ شريكي فيه)(تر)، وەك دەبینین (ابن منظور) چەند وێنەیەكو چەند

(تر) لسان العرب: بەرگی/ 7، لاپەڕە 99.

شێوە بەکارهێنانێکی و شەی ( شرك)ی هێناوە تەوە وە چەند فەرموودەیەك‌و ئا یەتێکی قورئان، چونکە قورئان‌و سوننەت ڕاستترین‌و جێی دڵنیاییترین‌و متمانە پێکراوترین دەق ( نصّ)ی عەرەبیین، وە قسەکانی (ابْن منظور) بە گشتی ئەوە دەگەیەنن کە وشەی (شرك) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە واتای هاوبەش‌و تێکەڵی‌و شەریکایەتی دێت.

ب ـ لە زاراوی شەرعدا: لە زاراوی شەرعدا (توحید الله) واتە: خوا بەیەکگرتن‌و (شرك)یش پێچەوانەی (توحید)ە، کەواتە: (الشرك بالله) یانی: هاوتاو هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، ئنجا مادام (توحید) خوا بەیەکگرتن بێت، لە بەدیهێنەرایەتی و پەروەردگارێتی داو، لە ناوو سیفەتەکانی داو، لە پەرستراوێتیدا، کەواتە (شرك)یش سێ بەشە:

( ١ ) هاوبەش بۆ خوادانان لە بەدیهێنەرایەتی‌و پەوەردگارێتیدا.

( ٢ ) هاوبەش بۆ خوادانان لە ناو و سیفەتەکانیدا.

( ٣ ) هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستن‌و بەندایەتی بۆ کردنیدا.

## ( ١ ) هاوبەش بۆ خوادانان لە بەدیهێنەرایەتی‌و پەروەردگارێتیدا دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: ئەوەیە کە وەك چۆن دان بەوەدا دێنی، کە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو مشوورگێڕی بوونەوەرە، بە هەمان شێوە سیفەتی بەدیهێنەرێتی‌و پەروەرگارێتی‌و مشوورگێڕێتی، پاڵ بدەیە لای شتێك، یان یەکێکی دیکە، غەیری خوا، وەك:

* (زەردەشتی)یەکان کە بڕوایان بە دوو خوا هەیە، خوای خێر، بە ناوی (یەزدان)، وە خوای شەڕ، بە ناوی (ئەهریمەن).
* (یەزیدیی)یەکان، کە ئەوانیش شەیطان پەرستن‌و شەیطان بە هاوتای خوا دادەنێن‌و دەڵێن: دەزانین خوا هەیە، بەڵام بۆیە نایپەرستین، چونکە خوا هەر چاکە دەکات بەڵام ئێمە (مەلەك طاووس) دەپەرستین - کە مەبەستیان پێی شەیطانە - چونکە ئەو دەتوانێ زیانمان لێ بدات!

هەروەها یۆنانی‌یەکانیش، کە بۆ هەرشتێك لە دیاردە سروشتی یەکان بەدیهێنەرو پەروەردگارێکیان دادەناو دەیانگوت: پەروەردگاری هەور، پەروەردگاری لافاو پەروەردگاری با، پەروەردگاری ئاگر، پەروەردگاری جوانی، پەروەردگاری هونەر،... هتد[تر].

* (نەصرانی)یەکان کە خوای مەزن لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ﴾[*]، واتە: بێگومان ئەوانەی کە گوتیان خوا سێیەمی سێیانە کافربوون، واتە پێیان وابوو، کە سێ خوا هەن‌و لەو سێیانە یەکێکیان خوای

(تر) لە بەرگی یەکەمدا هەڵەی هەندێك لە نووسەرو وەرگێڕە کوردەکانم ئاماژە پێکردوە کە وشەی (ربّ)و (إله) یان بە (خوا) تەرجەمە کردوە. کە لە ڕاستیدا ئەوە هەڵەیەکی سەیرو بێ‌مانایەو ئەنجامی زۆر بێ‌جێ و نامەنتیقی لێ پەیدا دەبن .
(*) ( المائدة 73 ) .

پەروەردگارەو دووانەکەی دیکەش یەکیان (عیسی)یەو ئەوی دیکەش (مریم)ی دایکیەتی، یان (روح القدس) کە مەبەستیان پێی (جبرائیل)ە!

جۆری دووەم: کە لە سیفەتێك یان زیاتر لە سیفەتەکانی بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگاریتی خوادا، وەك: ژیاندن، مراندن، رزقدان، شیفا هێنان، سەرخستن، ژێر خستن، شتێك یان کە سێك بکرێتە هاوبەشی خواو بە یەکێك لە سیفەتەکانی خوا لە بواری بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگاریتیدا وەسف بکرێ!

**( ● ) هاوبەش بۆ خوا دانان لە ناو و سیفەتەکانیدا ئەوەیە کە:**

أ ـ یەکێك لە ناو و سیفەتەکانی خوا، پاڵ بدەیە لای یەکێك لە دروستکراوەکان.

ب ـ یان سیفەت و ناوی دروستکراوەکان بۆ خوای پەروەردگار بەکاربهێنێ.

ناوو سیفەتەکانی خوا پاڵ بدەیە لای یەکێك لە دروستکراوەکان، وەك ئەوە کە پێت وابێ ئەو دروستکراو (مخلوق)ە ـ جا دارو بەردە، ئەستێرەو مانگو خۆرە، ئینسانە، وە ئەو ئینسانە، چ طاغووتێك بێ، چ پێغەمبەرێك، وە چ پیاو چاکێك و چ فریشتەیەك بێ ـ یەکێك یان زیاتر لە ناو و سیفەتەکانی خوای هەیە، وەك: زانینی نادیار (غَیْب)، شیفا هێنان، لە گوناهو تاوان بوردن، سەرخستن،... هتد. چونکە خوا بەیەکگرتن ئەوەیە کە: خوا بە یەك بگیرێتو

بەیەك دابنرێت، لە بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگاریێتیدا، کە بڵێی: هەریەك بەدیهێنەرو هەر یەك پەروەدگار هەیە، وە لە ناوو سیفەتەکانیشیدا، کە بڵێی: ئەو ناوو سیفەتە هەرەبەرزو چاکانەی خوا هەنی، هیچ کەس نینی، وە هیچ کەس لەو ناوو سیفەتانەی خوادا بەشدار نیە، وە نابێ ناوو سیفەتی دروستکراوەکانیش بۆ خوا بەکاربێنی وەك پێشتر باسمان کرد.

**( ) هاوبەش بۆ خوا دانان، لە پەرستراوێتی خوادا، ئەوەیە کە :** بە شێوەیەك لە شێوەکانی پەرستنو بەندایەتی، رەفتار لە گەڵ غەیری خوادا بکەیو جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ غەیری خوا ئەنجام بدەی. ئەوە بەکورتی پێناسەی (شرك) بوو.

## برگــەی دوو: جۆرەکانی هاوبەشی بۆ خــوا دانــان:

خوای بەرزو مەزن لەم چەند ئایەتەدا بەیەکەوە لە یەك کاتدا با سی هەر سێك جۆرەکانی (شرك) دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ ۞ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ۞ قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ۞ تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ۞ إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[1]، واتە: هاوبەش پەیداکەرەکان، وە ئەوانەش کە هەڵیان خەڵەتاندبوونو بە دوای ئەواندا سەرگەردانیان کردبوون، هەموویان بەسەریەکدا کەوتنو خرانە دۆزەخەوە، وە سەرجەم سەربازەکانی ئیبلیسیش لەگەڵ ئەوان لە دۆزەخدا

(1) ( الشعراء – 94، 98).

پەزمەندە بوون، لە کاتێکدا کە مشتو مڕو شەڕە قسەیان بوو گوتیان: سوێند بە خوا ئێمە لە سەرگەردانیو لە ڕێگا لێونبوونێکی ئا شکرادا بووین، چونکە ئێوەمان هاوتاو یەکسان دە کرد لە گەڵ پەروەردگاری جیهانەکاندا (ئێوەمان وەك وی سەیر دەکرد!). هاوبەش بۆ خوادا نەران ئەم قسەیە بە پەرستراوەکانیان دەڵێن، ئەوانەی کردوویانن بە هاوبەش بۆ خوا، چ لە بەدیهێنەرا یەتیو پەروەردگارێتی دا بێت، چ لە ناو و سیفەتەکانی دا بێت، چ لە پەرستراوێتی دا بێت. کەواتە، هاو بەش بۆ خوادانان بە گشتیو بە هەموو جۆرو شێوەکانی یەوە بریتی یە لە: ئەم ڕستە قورئانی یە: ﴿إذ نُسَوِّيكم بِرَبِّ العالمين﴾ پێنا سەیەکی کورتو پوختی هاوبەش بۆ خوادانان (الأشراك بالله)ە، چونکە هاو بەش بۆ خوادانان بە گشتی یەکسانکردنی غەیری خوایە لەگەڵ خواداو وەك یەك سەیرکردنیانە، بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەم ڕستە بە پ یزە قورئانی یە: ﴿إذْ نُسَوِّيكم بِرَبِّ العالمين﴾ هەموو جۆرو شێوەکانی هاوبەش بۆ خوادانان لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، ئێستاش با سەیری چەند ئایەتێکی دیکەی قورئانی پڕ پیتو پێز بکەین، لە هەرسێك بوارەکانی خوا بەیەکگرتن داو بزانین خوای پەروەردگار چۆن باسی (شرك)ی کردوە لە هەرکام لە سێ بوارە سەرەکی یەکەی دا:

<u>یەکەم:</u> لە بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی دا:

* ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لا يَخْلُقُ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾[1]، واتە: ئایا شتانێك،

---

[1] (الأعـراف – 191).

یاخود کەسانێك کە هیچ دروست ناکەن، دەیانکەن بە هاوبەش بۆ خوا، کە هیچیشیان دروست نەکردوەو هیچیشیان پێ دروست ناکرێت، بەڵکو بۆخۆشیان دروست کراون؟!

* ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دونِهِ آلِهَةً لا يَخْلُقُونَ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ . وَلا يَمْلِكُونَ لِأَنْفُسِهِمْ ضَرّاً وَلا نَفْعاً وَلا يَمْلِكُونَ مَوْتاً وَلا حَيَاةً وَلا نُشُوراً﴾(1)، واتە: لە جیاتی خوا، چەند پەرستراوێکیان گرتوە، کە هیچیان پێ دروست ناکرێ، بەڵکو بۆ خۆشیان دروست دەکرێن، وە تەنانەت بۆ خۆشیان نە قازانجیان لەدەست دێ، نە زەرەر (واتە: نە دەتوانن قازانج بۆ خۆیان بهێنن، نە دەتوانن زەرەرو زیان لە خۆیان دوور بخەنەوە، چ جای بۆ غەیری خۆیان!) ئنجا دەفەرموێ: وە نە مردنیان بەدەستە، نە ژیانیان بەدەستە، وە نە زیندووکردنەوەشیان بەدەستە.

* ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ ﴾(2)، واتە: بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە کافرن، هەڵبەتە پێشتریش باسمان کرد، کە هاوبەش بۆ خوادانان (شرك)ی مەجووسیی و ئیغریقیی و یۆنانییەکانیش هەر لەم بابەتە بووە.

دووەم: لە ناوو سیفەتەکاندا، خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا

(1) (الفرقان – 3).
(2) (المائدة – 73).

كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[١]، واتە خوا (جل جلاله) ناوە هەرە چاكەكانی هەن، جا بەس بەو ناوانەی لێی بپاڕێنەوە، وە واز لەو كەسانە بێنن كە لادان (الحاد) لە ناوەكانی خوادا دە كەن، لە مەودوا سزای كردەوەكانیان وەردەگرنەوە. هەروەها فەرموویەتی: ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيّاً﴾[٢]، واتە: پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەویو ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بەندایەتی بۆ بكەو ئارامیش بگرە لە سەر پەر ستنی، ئا یا هاوناوێكی دیكەت بۆ خوا پێ شك دێت ؟! (واتە: ئایا كەست پێ شك دێت ناوێكی وەك خواو سیفەتێكی وەك هی خوای هەبێت ؟! بێگومان نەخێر).

<u>سێیەم</u>: لە پەرستـراوێتیدا:

- خوای بەخشندە فەرموویەتی: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً﴾[٣]، واتە: خوا بپەرستن (بەندایەتی بۆ خوا بكەن)و هیچ شتێك مەكەنە هاوبەشی (هیچ كەسو هیچ شتێك بە شدار مەكەن لە عیبادەتێكدا كە بۆ خوا دەیكەن).
- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[٤]، واتە: بێگومان لە هەر كۆمەڵێ كدا

---

[١] ( الأعـراف – 180 ).
[٢] ( مريم – 65 ).
[٣] ( النسـاء – 36 ).
[٤] ( النحـل – 36 ).

پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە، کە خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت بە دوور بگرن.

ـ وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[1]، واتە: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە هیچ پەرستراو نین بێجگە لە من، تەنیا من بپەرستن، (و بەندایەتی تەنیا بۆ من بکەن).



(1) (الأنبیاء 25).

## خـاڵی دووەم:

## چۆنیـەتی پەیدابوونی هـاوبەش بۆ خوا دانـــان، بە تایبەتی لە بواری پەرســتندا.

لەوبارەوە خوای زاناو شارەزا فەرمووویەتی: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْياً بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾[1]، واتە: خەڵك هەموویان یەك كۆمەڵ بوون، (خوا پەرست و لەسەر حەق بوون، پاشان لایانداو سەریان لــێ شێوا) ئنجا خوا پێغەمبەرانی ناردن (علیهم الصلاة والسلام) موژدەدەرو ترسێنەر بن، وە كتێبو بەرنامەی لەگەڵدا ناردن بە حەق، بۆ ئەوەی حوكم لە نێوانی خەڵكدا بكات لەوەدا كە تێیدا كەوتوونە كێشەو جیاوازییەوە، تەنیا ئەوانەش تێیدا كەوتبوونە كێشەو جیاوازی یەوە كە كتێبیان پێدرابوو دوای ئەوەی زانیاری یان وەرگرتبوو، بەڵام لە ڕووی حەسەدو دەستدرێژیی كردنو لە ڕووی ئەوەوە كە بەرژەوەندی یان لە لاداندا هەبوو، لایاندا، جا خواش هیدایەتی ئەو بڕوادارانەی دا كە لە حەقدا كەوتبوونە كێشەو جیاوازی یەوە بە فەرمانی خۆی (هێنانیەوە

[1] (البقـرة - 213).

بەرەو حەق) بێگومان خوا ڕێنمایی هەر کەسێك دەكات كە بیەوێت بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی.

(أبن جرير الطبري) دوای ئەوەی كە ئەم ئایەتە تەفسیر دەكات، دەڵێ: (لَمّا مات آدمُ ـ عليه السلام ـ كان وصِيُّه شِيْثاً ـ عليه السلام ـ و مَضَتْ تلك المُدَّةُ التي ذكَرْنا، والناس كُلُّهم على الشريعة الحَقِّ، عن ابن عباسٍ قال: كان بين نوحٍ و آدم عَشْرَةُ قرونٍ، كُلُّهم على شريعةٍ مِنَ الحق، فآخْتَلَفوا، فَبَعثَ اللهُ النَّبِيِّن مُبَشِّرين و مُنْذِرين)[٣٣]، واتە: كاتێك ئادەم (عليه السلام) كۆچی دوایی كرد، ئەوەی كە لە شوێنی ئادەم بوو، (شیث) بوو (عليه السلام) (كە ئەویش زۆر لە زانایان دەڵێن یەكێكە لە پێغەمبەرانی خوا، هەرچەند ناوی لە قورئاندا نەهاتوە)[٣٤]، دەڵێ: جا ئەو ماوەیە تێپەڕی كە باسمان كرد، خەڵك هەمووی لە سەر بەرنامەی هەق بوون، (واتە: هەموویان خوا بەیەككگر (موّحد) بوون، بەڵام دوایی ڕێگایان لـێ تێك چوو)[٣٥]. (ابن عباس) دەڵێ: لە نێوان (نوح)و (آدم)دا دە سەدە (پشت) هەبوون كە هەموویان هەر لەسەر شەریعەتی ڕاستو دروستی خوا بەیەككگرتن بوون، پاشان ڕێگایان لـێ تێك چوو خوای پەروەردگاریش پێغەمبەرانی خۆی ناردوە (عليهم الصلاة و السلام) كە موژدەدەرو ترسێنەر بن. هەروەها (أبن عباس) گوتوویەتی: (وَدّ وسُواع و يَغُوث ويَعُوق و نَسْر، هذه أسْماءُ رِجالٍ صالحين مِنْ قَوْمِ

(٣٣) تفسير جامع البيان: بەرگی/ 2 ، لاپەڕە 334.

(٣٤) ئەوەی نێوان دوو كەوانەكە قسەی خۆمە.

(٣٥) ئەوەی نێوان دوو كەوانەكە قسەی خۆمە بەڵام سیاقی قسەكانی (طبري) دەیخوازێ.

نوحٍ، فلمّا هَلَكُوا أوحى الشَّيطانُ الى قومهم، أن آنْ صِبوا الى مجالِ سهم التي كانوا يجلسون أنْصاباً، وسَمُّوها بأسماءهم، ففعلوا، ولَمْ تُعْبَدْ، حتي اذا هَلَكَ أولئك و تُنُوسِيَ العِلْمُ عُبِدَتْ)(تر)، واتە: ناوی ئەو پێنج بتەی کە لە قورئاندا خوا باسی کردوون لە سوورەتی (نوح)دا، کە بریتین لە (وەد، سواع، یەغووث، یەعووق، نەسر) ئەمانە ناوی چەند پیاوێکی چاکەکارو دیندار بوون لە قەومی (نوح)، دوای ئەوەی کە مردوون، شەیطان وەسوەسەی خستۆتە دڵی ئەو قەومە، کە چەند پەیکەرێکیان بۆ دروست بکەن و لەو شوێنانەی کە ئەو پیاو چاکانە لێیان دانیشتوون لە ژیانیاندا دایان بنێن، وە ناوی ئەو پیاو چاکانە شیان لێبنێن (بەحیساب بۆ ئەوەی کە عیبادەت و تەقوای ئەو پیاو چاکانەیان هەمیشە لە بەرچاو بێت و فەرامۆشی نەکەن)(یر)، دەڵێ: ئەوانیش وایان کردوەو پەیکەرەکانیان بۆ دروست کردوون، سەرەتا یەکسەر نەیانپەرستوون، بەڵام دوایی کە ئەوان مردوون، خەڵکی دوای ئەوان هاتوە، وە وردە وردە زانیاری ﴿دینداریی و خوا بەیەکگرتن (توحید)﴾ کەم بووەو لەبیر کراوە، ئینجا پەرستوویانن، (ئیدی لەوەوە دەست کراوە بە بت پەرستی و بت پەرستی ئاوا داهاتووە سەری هەڵداوە). (عَمْرو بن لُحَيْ الخُزاعي) کە یەکەمین

---

(تر) ئەمە دەقی قسەی ئیمام (بخاري) یە، کە (فتح الباري) بەرگی/ 8، لا پەڕە 667، لێیەوە نەقڵ کردوە.

(یر) ئەوەی نێوان کەوانەکان قسەی خۆمە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست و سیاقیش دەیخوازێ.

کەس بووە، بت پەرستی لە نێوە دوورگەی عەرەبیدا داهێناوە، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەربارەی فەرمووویەتی: (رَأَيْتُ عَمْرو بن لُحَيْ الخُزاعيِّ يَجُرُّ قَصَبَهُ في النار، وكان أوّلُ مَنْ سيَّبَ السَّوائب)[تر]، واتە: (عەمری کوڕی لوحەی خوزاعی)م بینی، کە لە نێو ئاگردا ڕیخۆڵەی خۆی لەدوای خۆی ڕادەکێشا، وە یەکەمین کەس بووە، کە (سوائب)ی داهێناوە، (سوائب) کۆی (سائبة) یە، کە ناوی ئەو حوشترەیە، لە سەردەمی نەفامیدا عەرەبەکان، ئەگەر یەکێکیان لە سەرفەردا بوایە، یان نەخۆش بوایە، دەیگوت: مەرج بێت، فلان حوشترە بکەم بە (سائبة)، واتە: سواری نەدەبوونو باریان نەدەکردو سەریان نەدەبڕی، وە هەر جۆرە سوود لێ وەرگرتنێکیان لەو حوشترە لە سەر خۆیان حەرام دەکردو بە شتێکی پیرۆزیان دادەنا، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِنْ بَحِيرَةٍ وَلا سَائِبَةٍ وَلا وَصِيلَةٍ وَلا حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ﴾[یر]، ئنجا هەر لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((رأيْتُ عَمْرو بن لَحَي بنِ قَمْعَة بنِ خُنْدُف، يَجرُّ قَصَبَهُ في النار إنَّه أوَّلُ مَنْ غَيَّر دِيْنَ إسماعيل، فَنَصَب الأُوْثان))[سه]، واتە: (عەمری کوڕی لوحەی خوزاعی)م بینی کە لەنێو

---

(تر) رواه البخاري و مسلم.

(یر) (المائدة - 103).

(سه) رواه الأمام أحمد، وابن هشام في (كتاب السيرة) بەرگی/ 1، لا پەڕە 78، اسناده صحيح.

ئاگردا ڕیخۆڵەکەی خۆی ڕادەکێشا، ئەو یەکەمین کەس بووە، کە دینی (إسماعیل)ی گۆڕی وە بتەکانی دانان (کە بپەرسترێن)، وە (ابن قیّم الجوزي)[٣] -ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ-، بە دریێژی باسی چۆنیەتی پەیدابوون و سەرهەڵدانی (شرك)ی کردوە، پوختەکەی ئەوەیە کە دەڵێ: (شرك) واتە: هاوبەش بۆ خوادانان لە پەرستنیدا، بە سێ جۆرو شێوە پەیدابوە:

- ئەوە بووە کە لەنێو هەر گەل و کۆمەڵێکدا خەڵکی دیندارو خواناس و بە تەقوا هەبوون، جا دوای ئەوەی کە مردوون، خەڵکی دوای خۆیان زۆر ڕێزیان گرتوون، جا بۆ ئەوەی کە شوێنەواری ئەوانیان هەر لە بەرچاو بێ، پەیکەریان بۆ دروست کردوون، بە حیسابی خۆیان تاکو دینداریی و خواپەرستی با شتر بکەن. ئاوا سەرەتا نەیان پەرستوون، بەڵام دوای ئەوان کە وەچەو جیلەکانی دیکەی دوای خۆیان هاتوون، وایان زانیوە کە پێشتر پەرستراون و ئێستاش هەر دەبێ بپەرسترێن، زانیاری خوا بەیەکگرتنیشیان کەم بۆتەوە، لە ئەنجامدا دەستیان کردوە بە پەرستنیان.

- ئەوە بووە کە ئەهلی فەلسەفەو هونەرو خەڵکی زۆرزان و ئەوانەی پەیکەریان بۆ خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و دیاردە سروشتییەکان داناوە، بە خەیاڵی خۆیان ئەو پەیکەرانە شەفاعەتیان بۆ دەکەن لەلای خۆرو مانگ و دیاردە سروشتییەکان، وەك باران و باو لافاو، کە

---

(٣) ( إغاثة اللهفان من مصائد الشّيطان )، بەرگی/ 2، لاپەڕە 226.

زەرەریان لـێ نەدەن‌و سوودو قازانجیان پێ بگەیەنن، ئاوا دە ستکراوە بە پەرستنیان‌و هاوبەش دانان بۆ خوای بێهاوەڵ سەری هەڵداوە.

- ئەوە بووە کە ئەو پەیکەرانەی دروستکراون شەیطانەکان چوونە نێو ئەو پەیکەرانەوەو کەسانی سادەو نەزان‌و بێئا گا لە شەریعەت‌و پەیامەکانی خوا، چوون بۆ لای ئەو پەیکەرانە، بۆ بەندا یەتی‌و پەرستن تا بە خەیاڵی خۆیان شەفاعەتیان بۆ بکەن لای خواو لێیان پاڕاونەوەو پرسیان پێ کردوون، وەك ئەوە کە ئا یا ب چن بۆ ئەو سەفەرە، یان نەچن؟ ئەو (جن)و شەیطا نەش کە لەنێو بت‌و پەیکەرەکە دابووە قسەی کردوەو وەڵامی داوەتەوە، گوتوویەتی: ب چۆ بۆ سەفەرەکەت، یان مە چۆ، جاری واش بووە هە ندێ هەواڵی سەیریان بەو خەڵکە داوە، کە هەواڵدان بە غەیب نەبووە چونکە هەر خوا غەیب زانە، بەڵام هەواڵێك بووە کە لای خەڵکەکە زا نراو نەبووە، وەك ئەوە کە گوتوویانە: فلان کاروانە لە فلان جێگا یە! خەڵکە نەزانەکەش وایانزانیوە کە بت‌و پەیکەرە کە ئەو قسەیە دەکات، نەیانزانیوەکە شەیطانە! ئیدی بەو شێوەیە بیروباوەڕیان پێیان دامەزراوتر بووەو سوور بوون لەسەر ئەو (شرك)و هاوەڵ بۆ خوا دانانە!

## خـاڵی سـێیەم:

## خـراپی هـاوبـەش بۆ خـوا دانـان و بەرهـەمی شـوومی و سـزا و حوكمی

### یەكـەم ـ خـراپی هـاوبەش بۆ خـوا دانـان:

هاوبەش پەرستیی گەورەترین گوناهەو خراپترین تاوانە، لە گەلێك لە ئایەتەكانی قورئاندا ئەم حەقیقەتە ڕوون كراوەتەوە، بۆ نموونە:
(١) ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[1]، واتە: كاتێك لوقمان ئامۆژگاری كوڕەكەی كرد، گوتی: ڕۆڵەگیان هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانان، ستەمێكی زۆر گەورەیە.
(٢) ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْماً عَظِيماً﴾[2]، واتە: هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، بێگومان گوناهێكی زۆر گەورەی هەڵبەستوە.
(٣) ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً﴾[3]، واتە: كێ ستەمكارترو خراپەكارترە لەو كەسەی كە بۆ خوا درۆ هەڵدەبەستێت ((دەڵێ: خوا هاوبەش (شريك)ی هەیە)).

---

[1] (لقمان – 13).
[2] (النساء – 48).

( ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا...﴾(ير)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئاگاداربن هاوبەش پەیداکەران پیسن، با لەم ساڵ بە دواوە نزیکی مزگەوتی حەرام نەکەون، (واتە: لەمەودوا نابێ بێنە نێو ماڵی خواوەو حەج بکەن، چونکە تا ئەوکات ((ساڵ ( )ی کۆچی)) هەندێ لە هاوبەش پەیداکەرەکان بە ڕووتی دەهاتن طەوافی ماڵی خوایان دەکرد، وە فیکەیان دەکێشاو چەپڵەیان لێدەداو بەو جاهیلییەتەی خۆیان بە حیساب خوا پەرستییان دەکرد!

## دووەم: ـ بەرهەمی شوومی هاوبەش بۆ خوا دانان:

( ) خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ۞ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ﴾(سە)، واتە: بە تەئکید (ئەی موحەممەد) تۆ پێت ڕاگەیەنراوەو بەوانەی پێش تۆش ڕاگەیەنراوە (بە پێغەمبەران) کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی کردەوە کەت هەڵدەوەشێتەوە، وە بێگومان لە زیان لێکەوتوان دەبێ! بۆیە تەنیا بەندایەتی بۆ خوا

(تر) ( هـود 18 ).
(یر) ( التوبـة – 28 ).
(سەم) ( الزمـــر 65 ، 66 ).

بکەو تەنیا ئەو بپەرستە، وە لە سوپاس گوزاران بە! (کەوا تە (شرك) بێوەفایی و سپلەیی یە).

(ﷺ) وە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[1]، خوای بەرزو بێوێنە دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێش ئەم ئایە تەدا باسی هەژدە (ﷺ) لە پێغەمبەرانی خۆی (علیهم الصلاة و السلام) دەکات و بە کۆمەڵێك وە سفی گەورە ستایشیان دەکات، دەفەرموێ: ئەگەر هاوبەشیان بۆ خوا دانابایە، هەر چی کردوویانە هەڵدەوەشایەوە، کەوا تە: هاوبەش بۆ خوادانان وەك تەورێکی برندە وایە درەختی ئیمان لە ریشەوە دەبرێت و تەختی دەکات!

## سێیەم: سزاو حوکمی (شرك)

(ﷺ) خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾[2]، واتە: بێگومان خوا لەوە نابووڕێ کە هاوبەشی بۆ دابنری، بەڵام جگە لەوە ئەوەی بیەوێت (و حەز بکات) لێی دەبووڕێ. کەواتە: گوناهی هاوبەش بۆ خوادانان لێ بوردن و چاوپۆشی لێکرانی نیە، دیارە ئەگەر بابای هاوبەشدانەر مسوڵمان

---

(تر) (الأنعام - 88).

(یر) (النساء - 116).

نەبێ، ئەگەرنا با (شرك)یشی هەبووبێ پێ شتر، مادام مسولْمان ببێو تەوبەی کردبێت، ئەوە بێگومان: (الأسلامُ يَجُبُّ ما قَبلَه)(٣٣). وە (التَّوَبةُ تَجُبُّ ما قَبلَها)(٣٤)، مسولْمان بوونو تەوبەکردن، هەر گوناهێکی پێش خۆیان دەسڕنەوەو لای دەبەن. بەڵام ئەگەر مسولْمان نەبێ و (شرك)ی تێدا بێت، ئەوە خوا لە (شِرك) نابوورێ بەڵام گوناهەکانی دیکە بەبێ تەوبەش دەگونجێ خوای لێ ببورده لێیان ببوورێت، دیارە بەهۆی تەوبەوە خوای بە بەزەیی لە هەموو گوناهێك تەنانەت (شرك)یش دەبوورێت، بەڵام بەبێ تەوبە لە (شرك) نابوورێت، لە گوناهەکانی دیکەش دەگونجێ ببوورێو دەشگونجێ نەبوورێ! بەڵێ (شرك) ئەوەندە گوناهو تاوانێکی گەورەیە هەرگیز قەڵەمی عەفووی بەسەردا نایەت مەگەر خاوەنەکەی لێی پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە لای خوا.

(●) وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾(٣٥)، واتە: بە تەئکید هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، خوا بەهەشتی لێ قەدەغە کردوە، وە جێگای ئاگرە، وە بێگومان ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

---

(٣٣) رواه البخاري.

(٣٤) رواه البخاري.

(٣٥) ( المائدة – 72 ).

(ﷻ) وە فەرموویەتـــی: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ...﴾[1]، واتە: خوا خۆی شایەدیی داوە کە جگە لە خۆی پەرستراوی دی نیە، وە فریشتەکانیش شایەدیی یان داوەو زانایانیش شایەدیی یان داوە. کەواتە: کەسێك کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، هەم شایەدییدانی خواو هەم شایەدییدانی فریشتەکانو هەم شایەدییدانی زانایان، هەمووی بە درۆ دەزانێ!. کەواتە: وەك ئەوە وایە ئینسانی هاوبەش پەیداکەر ئیعلانی جەنگ بکات لەگەڵ خواو لەگەڵ فریشتەکانو لەگەڵ هەموو زانایان، کە لە پێش هەموویانەوە پێغەمبەرانن (علیهم الـ صلاة والـ سلام)، بەڵێ (شرك) گەورەترین گوناهو تاوانە، هەر بۆیەش گەورەترین سزای هەیەو حوکمەکەشی ئەوەیە کە هەرگیز لێبوردنی خوا ـ بەو فراوانیی یەی ـ نایگرێتەوە!

(1) (آل عمران - 18).

## خاڵی چــوارەم :
## هــاوبەش بۆ خــوا دانــانی گــەورەو گچکە

بەڕێزان!

هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك بالله) بە گشتی دوو جۆرە:

- ـ هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورە (الشرك الأكبر).
- ـ هاوبەش بۆ خوا دانانی بچووك (الشرك الأصغر).

### (●) هــاوبەش بۆ خــوا دانانی گەورە:

هاوبەش بۆ خوادانانی گەورە لە پەرستنی خوادا، پێچەوانەی پەرستنی خوایە، چونکە وەك پێشتریش ڕوونمان کردەوە: پەرستنی خوا (جل جلاله) هەم ملکەچیو ژێردەستەیی بۆ خوا دەگەیەنێ، هەم پابەندیی بە بەرنامەو حوکمەکەیەوەو، هەم جێبەجێکردنی دروشمو خواپەرستنە تایبەتی یەکان. کەواتە: هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورە (الشرك الأكبر) ئەوەیە کە ئینسان، لە ملکەچیو ژێردەستەیی بۆ خوادا، یان لە پابەندیی بە شەریعەتو بەرنامەو حوکمەکەیدا، یان لە ئەنجامدانی دروشمو خواپەرستنە تایبەتی یەکاندا، غەیری خوا بکاتە هاوبەش،

ئاشكراشە كە ئەم جۆرە شیركە مادام یەكسەر پێچەوانەو دژی خوا بە یەكگرتنە، دەبێتە مایەی هەڵوەشانەوەی ئیمانو لە ئیسلام بردنە دەرەوەی خاوەنەكەی، بەڵام پاش جێبەجێكردنی بنچینەی: (هاتنەدی مەرجەكانو لاچوونی پەرچەكان) وەك لە بەرگی یەكەمدا باسمان كردوە، ئنجا هاوبەش بۆ خـــوا دانانی گەورە (الشرك الأكبر) دوو بواری سەرەكی هەن:

<u>یەكەم:</u> هاوبەش بۆ خوادانان لە بواری بەرنامەكان (شرائع)و، لە بواری یاسادانان (تشریع)و حوكمرانییدا: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾[1]، واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێكیان هەن بۆ خوا دایانناون كە بەبێ ئەوەی خوا ئیزنی لەسەربێ دینو بەرنامەیان بۆ داناون؟! كەواتە بەرنامەدانان (تشریع) بەبێ ئیزنو فەرمانی خوا، هاوبەش بۆ خوا دانانە، بەڵام ئەگەر لەژێر تیشكی قورئانو سوننەتدا، زانایان كۆشش (اجتهاد) بكەنو یاساكان (أحكام) هەڵبهێنجن، بە پێی دەقەكانی قورئانو سوننەتو بە پێی ئەو بنچینانەی كە زانایانی (أصول الفقه) دایانناون، ئەوە هەرچەندە حوكم دەردەهێنرێنو یاسا دادەنرێن، بەڵام بە ئیزنی خوایەو لەژێر تیشكی شەریعەتی خوادایەو بە هاوبەش دانان بۆ خوا (شرك) حساب ناكرێت، چونكە لە راستیدا ئەوە

---

[1] ( الشورى – 21 ).

یاسادانان (تشریع)ێکی مەرجدارە نەك ڕەها (مطلق)، بەلاّم بە مەرجێك لە چوارچێوەی شەرع نەچێتەدەرو لە گەڵی تێك نەگیرێ ئەگەرنا هەر کەسێك حەلاڵێك یان حەرامێك دیاری بکات، پێچەوانەی ئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا دیاریان کردوە، ئەوە ئەو کەسە خۆی کردوە بە پەرستراوی خەڵکی، چونکە دینی بۆ خەڵك دیاری کردوەو داناوەو دیارە حاکمێتیو بەرنامە دانانی لە خوای کاربەجێ زەوت کردوەو خۆی لە بەندەکانی خوا کردۆتە پەرستراو (معبود)! هەڵبەتە چەمکی و شەی (بەرنامەکان) (شرائع) زۆر فراوانتــرە لەوەی ئێمە ئاوا باسی دەکەین، چونکە (شعائر)یش هەر دەگرێتەوەو بەلاّم ئێمە بۆ زیاتر ڕۆشن بوونەوە ئاوا دابەشمان کردوە، ئەگەرنا هەر شەرعی خوا فەرموویەتی نوێژئاوا بکەو ڕۆژوو ئاوا بگرە، وە حەجو نەزرو قوربانیو پاڕانەوەو چیو چی بەو شێوە ئەنجام بدە! کەواتە دروشمەکان (شعائر)یش هەر بەشێکن لە بەرنامەکان (شرائع)، بەلاّم وشەی (شرائع) زیاتر لایەنی سیاسیو کۆمەلاّیەتی دەگرێتەوە دروشمەکان (شعائر)یش زیاتر لایەنی شەخصیی و ڕووحی.

دووەم: <u>هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری (شعائر) دروشمەکاندا</u>: واتە لەو نیشانەو دروشمانەدا کە ئینسانیان پێ بە مسوڵمان دەنا سرێ، وەك: (نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، نەزر، قوربانی،....)، خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿ذٰلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾[1]، واته: ئەوەی باسکرا بەو شێوەیە بوو ـ وە هەرکەسێك دروشمەکانی خوا بە گەورە بگرێ، بێگومان ئەوە لە تەقوای دڵو دەروونەکانەوەیە. کەواتە: دەبێ دروشمەکانی خوا بە گەورەتر بگری لەوەی کە بۆ غەیری خوا یان ئەنجام بدەی، چونکە هەموو ئەو دروشمانەی کە خوا دیاری کردوون، بۆ ئەوەیە کە تۆ پێیان ببی بە مسوڵمانو نیشانەو دروشمێکن خوا دایناون کە تۆ مسوڵمانەتی خۆتیان پێ دەربخەی.

بەڵێ بەڕێزان!

مسوڵمان بە نوێژ، بە ڕۆژوو، بەزەکات و حەج، بە لە خوا پاڕانەوە، بە پشت بە خوا بەستن، بە سەربڕین بۆ خوا، بە نەزر بۆ خوا، بە سوێندخواردن بۆ خوا، بە سووڕانەوە بە دەوری ماڵی خوادا، بەوا نە هەموویان دەردەکەوێ کە مسوڵمانە، بۆیە ئەگەر هەر کام لەو شتانەی بۆ غەیری خوا ئەنجامدا دیارە نامسوڵمانە، وەك بت پەر ستەکان کە هەندێك شتیان بۆ خواو هەندێکیشیان بۆ غەیری خوا ئەنجام دەدا. ئنجا ئەگەر تەماشای بارودۆخی ئەمڕۆی مـ سوڵمانان بـ کەین بە گ شتی، دەبینین گیـــرۆدە بوون بە هاوبەش بۆ خوادانان (شرك)ەوە لە زۆر بوارو لە گەلێك بیــروبۆچوونو هەڵسوکەوتیا ندا، خوای پەروەردگاریش لە سووڕەتی (الـ نّور)دا ئەو بەڵێنو موژدە یەی بە بڕوادارا نی داوە،

---

[1] (الحـــج – 32 ).

بە ستوویەتەوە بەوەوە کە نا بێ هاوبە شی بۆ پە یدا بکەن وەك فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً﴾[1]، واتە: خوا بەڵێنی داوە بەوانەتان کە بڕوادارنو کردەوەی چاك دەکەن، کە بیانکات بە جێنشین لەسەر زەوی، وەك چۆن ئەوانەی پێش وانی کردبوو بە جێنشین، وە ئەو دینەی کە بۆی هەڵبژاردوونو پەسندی کردوە، بۆتان بچەسپێنێ (حوکمی پێ بکرێو بۆتان بکاتە سایەو سێبەر) وە ئەو ترسو بیمەی کە لەسەرتانە (لە لایەن ئەهلی کوفرەوە) بۆتان بگۆڕێت بە هێمنیو ئاسایشو ئاسوودەیی، (بەڵام بەو مەرجەی کە) بم پەرستن وە هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشم لە پەرستراندا، واتە: مەرجم بۆ جێبەجێکردنی ئەو گفتو بەڵێنەم ئەوەیە کە: لە بەندایەتی بۆ کرانو پەرستنمدا، غەیری من نەکەنە هاوبەشو لەو شتانەدا کە دەبێ بەس بۆمن ئەنجام بدرێن، غەیری من نەکەنە خاوەن بەشو پشك، کەواتە بەندایەتی بۆ خوا، واتە ملکەچی بۆ خوا لە گەڵ ئەو پەڕی خۆشویستن و ئەوپەڕی لێترسان و ئەوپەڕی بە گەورە گرتنو ڕێزو حورمەتدا، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، کە زانایان بە بەرنامەکانو (شرائع)و دروشمەکان (شعائر) تەعبیریان لێ داونەوە.

---

(1) ( النــور 55 ).

بەڵێ خواپەرستنو تەنیا بەندایەتیکردن بۆ خوا، ئەوەیە کە: (شرائع) بەرنامەکانی ژیان: بەرنامەی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، جەنگو ئاشتی، نێودەوڵەتی، پێکهێنانی خێزان...هتد هەموویان تەنیا لە خوا وەربگری، وە لە هەموو لایەنەکانی ژیانتدا پیادەیان بکەیو جێ بەجێ یان بکەی. وە دروشمەکان (شعائر)یش سەرجەمیان تەنیا بۆ خوا پێشکەش بکەی، واتە هەموو ئەو شتانەی کە شەریعەت کردوونی بە دروشمو نیشانەی خواپەرستیو مسوڵمانەتی هەموویان بێجگە لە خوا بۆ هیچ کەسو هیچ شتێکی دیکە ئەنجام نەدەی، وەك خوای بێ هاوەڵ فەرموویـــــەتی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۞ لا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[1]، واتە: بلّێ نوێژمو قوربانی سەربڕینمو ژیانمو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە، هاوبەشی نین. وە هەر بەوە فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم. جا ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە لەم ڕۆژگارەدا هەندێك کتێبو نامیلکە کە لە بارەی عەقیدەوە دەردە چنو بڵاودەکرێنەوە، زۆرجار تێیاندا باسی (شرك) دەکرێت لە بواری (شعائر)دا، واتە ئەو وردە شتانەی کە هەندێك کەس وەك شەخس بەهۆیانەوە گیرۆدەی هاوبەش بۆ خوادانان (الشرك بالله) دەبن، وەك: چوونە سەر گۆڕو پاڕانەوە لە مردووو هاوار لێکردنیو سەربڕین بۆ غەیری خواو نەزر بۆ غەیری خواو سوێند بە غەیری خواو طەواف بە

---

(1) (الأنعام - 162، 163).

دەوری غەیری کەعبەدا[تر]و شت لە دە ست ئالاندنو شت بەخۆ هەڵواسینو بە خانووو دەرگا هەڵواسین، وەك ناڵی وڵاخ[یر].... هتد، بەڵێ لەو کتێبو نامیلکانەدا بە زۆری ئەو وردە بابەتانە زەق دەکرێنەوە[سە].!

جا هەڵبەتە خوا بەیەکگرتن (توحید) هەر بۆخۆی بابەتێکی یەکجار بەرفراوانەو ئەوەتا ئێمە بیست و چوار (٢٤) دەرسی ئەم زنجیرە دەرسەمان بۆ تەرخان کردوە! بەڵام یەکتاپەرستی کە بەشێکە لە سێ بەشی خوا بەیەکگرتن، ئایا تەنیا بریتیە لەوەی کە ئینسان لە بواری دروشمەکان (شعائر)دا کە زیاتر شتی شەخصییو ڕووحین، ئاگاداربێ کە هاوبەش (شریك) بۆ خوا دانەنێت؟!! ئەدی ئەو هەموو پانتاییە بەرفراوانەی دیکەی ئیسلامو مسوڵمانەتی کە بوارەکانی: سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو دادوەرییو جەنگو ئاشتییو... هتد دەگرێتە خۆی!! بە واتایەکی دیکە: ئەدی ئەوە کە طاغووتەکان حەڵاڵو حەڕام بۆ خەڵك دیاری بکەنو ئەمرو نەهی یان بەسەردا بکەنو شەریعەتی خوایان لێ فەراموش (إهمال) بکەن، یان بیگۆڕن، دەبێ باسی ئەوە نەکرێ؟!

جا لێرەدا وەك تێبینییەك، دەڵێم: لە ڕاستیدا زۆربەی ئەوانەی کە ئێستا

---

(تر) بۆ وێنە: گۆڕ (قبر) و پەرستگاو... هتد.

(یر) دیارە هەندێك لەو شتانە شیرکی گەورەو هەندێکیشیان شیرکی بچووکن، وەك دواتر ئاماژە بە هەندێك لە جۆرەکانی شیرکی گچکە دەکەین.

(سە) یەکێك لەو نامیلکانە کە زۆر گرنگیی و بایەخی پێدەدرێ و چەندان جارو بە چەندان شێوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە (کتـاب التوحـید)ی (محمد بن الوهّاب)ە ( خوا لێی خۆش بێ).

بە ناوی سەلەفییەتەوە باسی خوا بەیەکگرتن (توحید الله)و هاوبەش بۆ خوادانان دەکەن، چەمكو واتای هەرکام لە: (توحید)و (شرك) یان زۆر گچکەو بەرتەسك کردۆتەوەو کەمتر وایە هەم خوا بە یەکگرتن و هەم هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنیش لە بەرهەمو بڵاوکراوەکانی ئەو جۆرە کەسانەدا لە جوغزی درو شمەکان بەچنە دەرێ! بەڵام بێگومان وەك خستمانە ڕوو (توحید)و (شرك) هەردووکیان لەوە گەورەترو فراوانترنو وەك باسمان کرد هەردووکیان سەر لە بەری کیانی مرۆڤو ژیانو گوزەرانی دادەگرنو (شعائر)یش هەمووی هەر بەشێکە لە (شرائع)، چونکە ئەو دروشم (شعيرة)انەش هەر (شرع)ی خوای کاربەجێ دایناون!

بە چاکی دەزانم لێرەدا بیرەوەرییەکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە: لە ساڵی (١٤١٢ك)دا یەکەم سەفەری حەج کردنم بوو، ڕۆژێکی جومعە دوای تەواوکردنی خوا پەرستییەکان (مناسك)ی حەج، مـیوانی برا یەکی مسوڵمانی عەرەب بووین، کە لە مەککە دەعوەتی کردبووین، ئەو ڕۆژە وتاربێژ زۆر باسی ئەو جۆرە (شرك)ەی کرد، کە باسمان کردو زۆر بە توندی هاواری دەکردو بە چەختکردنی زۆرەوەو بە حەماسەتو دڵگەرمییەوە دەیگوت: مسوڵمانینە! لەم ڕۆژگارەدا گەورەترین گرفتو کێشەمان شیرکە، بۆیە ورپای خۆتان بن، لە مردووان مەپاڕێنەوەو هاواریان تێمەبەستن و... هتد، ئیدی تەنیا هەر ئەم باسەی هەبوو، دوای

نان خواردن لە ماڵی ئەو برایە، پرسیاریان لە ئێمە کرد(تر)، گوتیان: ئێوە وتارەکەتان پێ چۆن بوو؟ ئێمەش سەرەتا ماوەیەك بێدەنگ بووین، دوایی دووبارە گوتیان: بەڕاستی وتارێکی زۆرباش‌و پڕ سوود بوو، پێمان خۆشە ئێوەش سەرنج‌و تێبینی خۆتان لەسەر دەربڕن، منیش لە وەڵامدا گوتم: ((لكانت الخطبة خطبة جيِّدة لوقارن الهجوم الكاسح فيها على عُبّاد أصحاب القبور. هجوم مماثل على عبّاد أصحاب القصور))!! واتە: وتارەکە وتارێکی باش دەبوو ئەگەر هاتباو هاوکات لەگەڵ ئەو هێرشە ڕامالەرە بۆ سەر خاوەن گۆڕپەرستەکان، هێرشێکی هاو وێنەشی بۆ سەر خاوەن کۆشك پەرستەکان تێدا بووایە! پاشان پێم گوت: کە ئێستا گرفتی گەورەمان شیرکی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتییە کە زۆر یێك لە مسوڵمانان بە هۆی ڕژێمە عەلمانییە طاغووتی‌و دیکتاتۆرییەکانەوە هەتا بناگوێیان پێیدا چوونەتە خوارێ! وەك زۆر جار هەروا بەخۆشی گوتومە: زۆر سەیرە کە ئێمە بە ناوی (توحید)و (شرك)ەوە، باسی حەرامی‌و گوناهو تاوانی (موو هەڵکێشان) بکەین، بەلام باسی حوکمی (مل هەڵکێشان) نەکەین، بە تایبەتیش کە لەسەر دینداریی و مسوڵمانەتی ملیان هەڵبکێشرێ!. وە باسی حەرامی‌و گوناهو تاوانی (خاڵ کوتان) دەکەین، بەلام باسی (خەڵك کوتان) ناکەین! وە باسی لە (خاوەن قەبر) پاڕانەوە دەکەین، بەلام باسی بۆ (خاوەن قەصر) تواـنەوە

---

(تر) چونکە هەردوو برای بەڕێزم: مامۆستا (محمود)ی ئازادیی و، مامۆستا (أبوبکری صدیقی)یش هاوەڵی ئەو سەفەرەم بوون.

ناکەین، چونکە کەسانی وا هەن کە بوون بە کۆیلەو بەندەی خاوەن قەصرەکانو بۆیان تواونەوە، بەڵێ ئەو مسوڵمانە ناحاڵییەو سۆفیو دەروێشە نەفامو نەزانەی کە دەچێ لە خاوەن قەبرێك دەپارێتەوە، خراپی کردوەو دووچاری شیرك بووە، بەڵام ئەوەش کە بووە بە کۆیلە بۆ خاوەن قەصرێكو دینی خۆی بە دونیای ئەو داوە، زۆر خراپتری کردوەو گیرۆدەی شیرکێکی گەورەترو کوشندەترو گشتگیرتر بووە! بۆیە دەبێ بە فراوانی لە مانای خوا بەیەکگرتن (توحید) تێبگەین، وە بە فراوانی لە مانای بەندایەتیو پەرستنی خوا تێبگەین، وە بە فراوانیش لە مانای هاوبەش بۆ خوا دانان تێبگەین، چونکە مەسەلەی هاوبەش بۆ خوادانان تەنیا لە سێ چوار ڕەفتارو هەڵسوکەوتی سادەی کە هەندێ سادەو عەوام، یان چەند سۆفیو دەروێشو دێوانەیەکی ناحاڵی دەیکەن هەر لەوەدا کورت هەڵنایەت. وە (محمد بن عبدالوّهاب)و غەیری ئەویش کە لە کتێبو بەرهەمەکانی خۆیاندا بە زۆری باسی ئەو لایەنەی (شرك) یان کردوە لەبەر ئەوەبووە کە ئەوان لە کۆمەڵگا یەکی بیابانی (بَدوي)و لادێ نشینو دەوار نشیندا ژیاونو لەو سەردەمەدا بە زۆری ئەو دیاردە شیرکی یانە هەبوون، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا ئەوەی کە کێشەی سەرەکی مسوڵمانانەو پشووی بە مسوڵمانان تەنگ کردوەو تەنگی پێ هەڵچنیونو خەریکە دینو عەقیدەکەیان لە ڕیشەوە هەڵدەکێشێ، بریتیە لە شیرکی سیاسیو شیرکی (طواغیت)! بێگومان هاوبەش پەیداکردن (شرك) هەموو جۆرو شێوەکانی هەر خراپو خەتەرنو

پێویستە لێیان وریابین‌و لەنێو خۆمانیاندا بژارو ڕیشەکێشیان بکەین، بەڵام بێگومان لەم ڕۆژگارەماندا زەرو زیانەکانی شیرکی طاغووت پەرستیی لەگەڵ هی (گۆر) پەرستیی‌و شەخس پەرستیی بەراورد ناکرێ! چونکـــــە:

یەکەم: هەتا بە هۆی پەرستانی خاوەن قەبرێکەوە سەد کەس تووشی شیرك دێن، بەهۆی پەرستانی خۆ سەپێن و خاوەن قەسرێکەوە ملیۆنان کەس گیرۆدەی شیرك‌و لە دین دەرچوون دەبن!

دووەم: ئینجا دەگونجێ خەڵکێك هەبێ کەم‌و زۆر گیرۆدەی شیرکی گۆڕپەرستی ببێ، بەڵام شەریعەتی خوا هەر حاکم بێ، بەڵام هەتا طاغووتەکان بپەرسترێن شەریعەتی خوا حاکم نابێ! بەڵێ دەگونجێ هەندێ خەڵکی سۆفی‌و درویش‌و مسوڵمانی عەوام هەبن کە بچن لە خاوەن قەبرێك بپارێنەوەو حوکمی ئیسلامیش هەبێ، بەڵام ناگونجێ طاغووتێك‌و دیکتاتۆرێك هەبێت خەڵکی کردبێتە بەندەو کۆیلەی خۆی‌و ئەمرو نەهی‌یان بەسەردا بکات‌و حەڵاڵ‌و حەرامیان بۆ دیاری بکات‌و یاساو دەستووریان بۆ دابنێت، دینی خواش حاکم بێت!! هەرگیز شتی وا ناگونجێت.

## (●) هـاوبەش بۆ خـوا دانـانی گچکـە:

سەرەتا دەڵێیـن: جیاوازی نێوان شیرکی گەورەو هی گچکە، ئەوەیە کە جۆری شیرکی گەورە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیمان‌و ئیسلام دەباتە دەرێ،

بەڵام شیرکی گچکە تەنیا ئیمانو عەقیدە نەخۆشو ناتەواو دەکات، ئەگەرنا خاوەنەکەی پێی لە ئیمانو ئیسلام ناچێتە دەرێ.

شیرکی گچکە (الشرك الأصغر)یش دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: ئەوەیە کە لە سەر زمانو ئەندامەکان - لە شێوەی هەندێك قسەو تەعبیر یان هەندێك هەڵسو کەوتو رەفتار - دەردەکەوێ، بۆ نموونە:

(١) سوێند خواردن بەغەیری خوا (عزَّوجلّ)، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((مَن حَلَفَ بغير الله فقد كفر أو أشرك))(1)، واتە: هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوا کوفری کردوە یان شیرکی کردوە.

(٢) گوتنی: ئەگەر خواو تۆ بتانەوێ (ما شاء الله و شئت)، چونکە کاتێك پیاوێك بە پێغەمبەری خوا ﷺ ی گوت: (ما شاء الله وشئْتَ) فەرمووی: ((أجَعَلْتَني لِلّه نِدّاً؟! قلْ: ما شاء الله وَحْدَهُ))(2)، واتە: ئەوەکردتم بە هاوتای خوا ؟! بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ بە تەنیا!

(٣) بەخۆوە هەڵواسینی پەڕۆو بەنو ئاڵقەو ئەو جۆرە شتانە بە حیسابی ئەوە کە لە چاوزارو حەسەدو بەڵاو گرفت بیپارێزێ، هەروەها هەڵواسینی ناڵو ئێسقانو... هتدیش بە دەرگاو دەرودیوارەوە

(1) رواه الترمذي و صححه الحاكم.

(2) رواه النَّسائي.

بۆ هەمان مەبەستی پێشوو هەمان حوکمی هەیە، لەوبارە شەوە چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراونەتەوە، بۆ نموونە:

- ﴿عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول، ((إِنَّ الرُّقى والتَّمائِمَ والتِّوَلَةَ شرك))(٣٨)، واتە: بێگومان نوشتەو گشتەكو تیوەلە شیركە، دیارە (رُقى) كۆی (رقیة) یەو (تمائم) كۆی (تميمة)یە، كە هەردووكیان بەو جۆرە دووعاو نوشتە نوسراوانە دەگوترێن كە بە وشەو تەعبیری ناشەرعی، یان شێوەی جادوو، ساز دەكرێن، و شەی (تِوَلَة)ش هەرجۆرە نوشتەیەكە كە بۆ لەلای یەكدی خۆشەویستكردنی ئافرەتو پیاو دەكرێ.
- ((مَنْ تعلَّقَ شيئاً وُكِلَ اليه))(٣٩)، واتە: هەركەسێك شتێك هەڵبواسێ هەواڵەی وی دەكرێ (یان: خوا فەرامۆشی دەكات). كە مەبەست پێی هەڵواسینی (ناڵ)و (ئێسقان)و (كووژەكە)و ئەو جۆرە شتانەیە.

---

(٣٨) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجه والحاكم.

(٣٩) رواه أحمد و الترمذي.

هۆی بە شیرکی گچکە لە قەڵەمدرانی ئەو ڕەفتارانەش ئەوە یە کە خوای کاربەجێ ئەو جۆرە شتانەی نەکردۆتە هۆکاری لابردنو گێڕانەوەی نەخۆشیو ناخۆشیو بەڵا.

جۆری دووەم: ئەوەیە کە پەیوەندی بە نیاز (نیة)و دڵو دەروونو ئیرادەوە هەیە وەك:

(◉) ڕیابازیی لە نوێژو ڕۆژوو چاکەو ماڵ بەخشینو زیکرو قورئان خوێندنو... هتددا، بۆیە خوای پەنهانبین فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾[تر]، واتە: جا هەرکەسێك بە هیوای دیداری پەروەردگاریەتی با کردەوەی باش بکاتو هیچ کەسیش لە پەرستنی پەروەردگاریدا بەشدار نەکات! (واتە: ئەو عیبادەتەی کە بۆ خوای پەروەردگاری ئەنجامی دەدات با بەشی غەیری خوای تێ نەهاوێ) پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ((أخوفَ ما أخافُ عليكم الشّركَ الأَصْغَرُ! قالوا: يارسول الله وما الشرك الأصغر؟! قال: الرِّياءُ))[یز]، شتێك کە لە هەمووشتان پتر مەترسی ویم لێتان هەیە، شیرکی گچکەیە! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! شیرکی گچکە چیە؟! فەرمووی: ڕیابازیی یە.

(تر) (الكهف - 110).

(یز) رواه أحمد والطبراني والبغوي في (شرح السُّنَّة).

(●) هەروەها کردەوەی چاك ئەنجامدان بە مەبەستی ماڵو سامان چنگ کەوتن وەك ئەوانەی زانیاری شەرعیی وەدەست دێنن، یان جەنگو جیهاد دەکەن. یان حەجو عومرە دەکەن یان بانگ دەدەن یان وتار دەدەن یان پێش نوێژی دەکەن... هتد، تاکو لەو ڕێیەوە دەستیان بگاتە تەماعو بەرژەوەندی یەك، واش پێ دە چێ ئەو جۆرەکەسانە مەبەست بووبن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((تَعِسَ عَبْدُ الدينار تَعِسَ عبد الدِّرهم، تَعِسَ عَبْدُ الخميصة، تَعِسَ عبد الخميلة، إنْ أُعطي رضي وإن لم يُعْطَ سَخِط))[٣]، واتە: بفەوتێ کۆیلەی زێڕ، بفەوتێ کۆیلەی زیو، بفەوتێ کۆیلەی (خميصة)، بفەوتێ کۆیلەی (خميلة) - کە دوو جۆرە پۆشاکو قوماشی بەقیمەت بوون لەو ڕۆژگارەدا - ئەگەر بیدرێتێ ڕازییەو ئەگەر نەیدرێتێ تووڕەیە!



[٣] رواه البخاري.

## خاڵی پێنجەم:

## چۆن و بە چی لە هاوبەش بۆ خوا دانان قوتار دەبین؟!

بە دوو شتان لە هاوبەش بۆ خوادانان (الأشراك بالله) قوتارو دەرباز دەبین:

یەکەم: بە ئیمانو عەقیدەیەکی تێرو تەواوو خوا بە یەکگرتن (توحید)ێکی دامەزراو، چونکە بێگومان گورگی شیرك تەنها زەفەر بە دڵو دەروونێك دەبات کە بە خۆری پڕ شنگداری ئیمانو خوا بەیەکگرتن ڕۆشن نەبووبێتەوە، بەڵێ شەمشەمەکوێرەی شیرك تەنیا دەتوانێ لە ئەشکەوتی تاریكو تەڵەمی بابای بێئیمان یان ئیمان کزدا سەقامگیر بێتو جێیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە!

دووەم: کە هەمیشە پاسەوانی عەقڵو دڵو دەروونمان بینو بە هیچ جۆرێك هیچ شتێكو هیچ کەس نەکەینە هاوبەش (شریك) بۆ خوا

لە هیچ شتێکیدا، وە هەرگیز نەهێڵین هیچ شتێك هیچ کەس ببێتە هاوبەشی خوای بێهاوەڵمان، لە سەرجەم بوارەکاندا، لە حوکم‌و بەرنامە داناندا، لە حەڵاڵ‌و حەرام بۆ دیاری کردندا، لە ئەمرو نەهی‌دا، وە لە ئەنجامدانی درووشم‌و خواپەرستی‌یە تایبەتی‌یەکاندا، واتە وریا بین کە هەم لە بواری خواپەرستیی گشتی‌و حوکمڕانی‌و حەڵاڵ‌و حەرام‌و ئەمرو نەهی‌دا، کەس نەکەینە هاوبەش بۆ خوا، وە قبووڵیش نەکەین کە هیچ کەس خۆیمان لێ بکاتە هاوبەشی خوا، وە هەم لە بواری پەرستن‌و بەندایەتیی‌یە تایبەتییەکانیشدا، ئێمە کەس بەشدار نەکەین، وەك خوای بەرزو مەزن هەر لە هەمان سوورەتی (الکهف)دا دەربارەی هەردووکیان فەرمووییەتی: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً﴾[تر]، واتە: وە هیچ کەس لە حوکمیدا بەشدار ناکات، ﴿وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾[یر]، واتە: با هیچ کەس لە بەندایەتیکردنیدا بۆ پەروەردگاری نەکاتە هاوبەش (شریك). هەروەها لە بواری دۆستایەتی (الموالاة)یشدا، با وەك کە خوای پەروەردگارمان خۆش دەوێت، وە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ خۆش دەوێت، کەسمان ئەوەندە خۆش نەوێت، وە ئەوەندە کە لە خوا دەترسین‌و بۆ ئەو ملکەچین، لە کەس هێندە نەترسین‌و بۆ کەس ئاوا

(تر) ( الکهف - 26 ).

(یر) ( الکهف - 110 ).

ملکەچ نەبین و دۆستایەتی (موالاة)ی ڕەها (مطلق)مان تەنیا بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا بێت، وە وەك كە مسوڵمانانمان خۆش دەوێت‌و پشتیوانی یان لێ دەكەین و بە دۆستیان دەگرین، كەسمان ئەوەندە خۆش نەوێ‌و بەو شێوەیە پشتیوانی لە كەس نەكەین‌و بە دۆستی نەگرین، وە با دۆستایەتی گرتن‌و دوژمنایەتی كردنمان تەنیا بۆ خواو لە پێناوی خوادا بێت، وە بە پێی ئایین‌و بەرنامەی خوا بێت، ئەوە لەبارەی چۆنیەتی قوتاربوونمان‌و پارێزرانمان لە هاوبەش بۆ خوا دانان بە گشتی‌و بە تایبەتی هاوبەش بۆ خوادانان گەورە.

دەربارەی چۆنیەتی خۆ پاراستنیش لە شیركی گچكە، هەر بە كورتی دەڵێین: لە سۆنگەی ئەوەوە كە شیرك بە گەورەو بچووكییەوە یەكجار مەترسیدارەو شیركی گچكەش پێشەكی‌و دەروازەیە بۆ شیركی گەورە، بۆیە پێویستە هەمیشە وریای خۆمان بین‌و هەموو ئەو وشەو تەعبیرانەی كە بە شێوەیەك لە شێوەكان لە گەڵ خوا بەیەكگرتندا تێك دەگیرێن‌و ناكۆكن، هەروەها سەرجەم ئەو نیازو مەبەست‌و خولیایانەی، كە بە شێوەیەك لە شێوەكان نەگونجاون لەگەڵ ئیخلاص‌و تەنها خوا پێ مەبەست بووندا، خۆمانیان لێ دوور بگرین‌و هەرشتێك ئەگەر بە عاستەمیش بۆنی شیركی لێبێ بە كەمی نەگرین، وەك دەگێڕنەوە، كە (عبدالله بن عبّاس) خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ گوتوویەتی: جارێ وایە دز دێتە سەر ماڵێك

کە لە شەوداو لە نەخافڵ دزییان لـێ بکات، بەڵام کەڵەشێرەکەیان دەقووقێنێ، یان سەگەکەیان دەوەڕێو بێدار دەبنەوەو کابرای دز رادەکات، جا بەیانی کە ڕۆژ بۆوە ماڵەکە دەڵێن: ئەگەر کەڵەشێرەکەمان نەیقووقاندبایە، یان سەگەکەمان نەوەڕیبایە، دزیمان لـێ دەکرا! جا (عبدالله) گوتوویەتی: ئا ئەو تەعبیـرو جۆرە بیرکردنەوەیەش جۆرێکە لە هاوبەش دانان ( شرك)!! خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە خوا بە یەکگر (موحِّد)ی ڕاستەقینەن، وە خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە هەموو جۆرەکانی (شرك) پاك بوونەوە، وە لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە خڵتەو ژەنگو ژاری (شرك)ی گەورەو بچووك خاوێن بوونەوە، وە بمانپارێزی لە هەموو جۆرو شێوەکانی هاوبەش بۆ خوادانان بە گەورەو گچکەو ئاشکراو پەنهانەوە.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، والحمد الله رب العالمين



# ئــەم بەنــــدە

**خوێنەری سەنگین!**

ئەم بەندی حەوتەمو کۆتایی یە لە دوو بابەت پێکهاتوە کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

بابەتی یەکەم: خواناسی ڕاست، شایەنی باسیشە ئەمیش یازدە کورتە باسی گرتوونە خۆی، کە هەموویان باسی خواناسینی ڕاستو دروست دەکەن لە ڕوانگەی قورئانو سوننەتەوە.

بابەتی دووەم: بەرهەمی خواناسین، ئەمیش پێنج کورتە باسی گرتوونە خۆی کەتیشك دەخەنەسەر کاریگەریی خواناسی (معرفة الله)ە ڕاستو دروستو ئیمان بەخوابوونی تەواو لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام پێویستە ئەوە بگوترێ کە مەبەست لە بەر هەمی خواناسی بەگشتیو ڕەهایی نیە، بەڵكو تەنیا لە بواری پەیوەندی ئینسان لە گەڵ خوای پەروەردگارو بێوێنەدا یە، لە حاڵێکدا کە کاریگەریی بەرهەمی خواناسیو ئیمان بەخوا ئەگەر بە گشتیو

ڕەهایی باس بکرێ پێویستە تێکڕای لایەنو بوارەکانی دینو ژیـین بخرێنە ڕوو، چونکە خواناسینو ئیمان بـە خوا هێـنانی ڕا ستو دروست، کاریگەریی یان لەسەر وردو درشتی ئینسانو ژین هەیە.

## بـابەتی یەکـــەم: خواناسیی ڕاســت

خواناسیی ڕاسـت لەم یـازدە کورتە باســە پێك دێ:

1 ـ خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە.

2 ـ خوا تاكو تەنیاو بێوێنەو هاوتایە.

3 ـ خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لە هەموو لەکەیەك دوورە.

4 ـ خوا خاوەنی چەند ناوێکەکە چاکترینو تەواوترین ناون.

5 ـ خوا هەموو شتێکی لەسەر بنچینەی زانیارییەکی قووڵو بێسنوور خوڵقاندوە.

6 ـ خوا بەرنامـــەیەکی بە پێغەمبەری کۆتایی (محمد)دا ناردوە تا ـقە بەرنامەی ڕاستو تەواوە.

7 ـ خوا هەموو کردەوەکانی ڕاستو بەجێو حیکمەت دارن.

8 ـ خوا دادگەرەو هەمووکەس بەیەك چاو سەیر دەکاو پلەو ئیمتـیازی نەداوەتە هیچ کەس.

9 ـ خوا ڕێزی لە ئینسان گرتوەو خۆشی دەوێ‌و بە جێنشینی خۆی دایناوە.

10ـ خوا هیچ دەلاڵ‌و واسطـەیەکی لە نێوان خۆی‌و بەندەکانیدا دانەناوە.

11ـ خوا خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتەو بەبێ ڕێ پێدانی وی کەس مافی تکاکردنی نیە.

## (1) خـوا بەدیهێنـەرو پەروەدگـارە.

ئەم بوونەوەرەو هەر چی تێیدا یە پەرێزو شوێنەواری خوا یەکی بەدیهێنەرو پەروەردگارە، خوای بەرز دە فەرموێ: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾[تر]، واتە: خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبّاً وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ﴾[یر]، واتە: بڵێ: ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دی بخوازم کە ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە؟! وە لە ئەنجامی[سم] سۆزو بەزەیی‌و چاکەکاری خۆ یەوە

(تر) ( الزمـر – 62 ).

(یر) ( الأنعـام – 6 ).

(سم) ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ: ئەم ڕستەیە (کە لە ئەنجامی سۆزو بەزەیی‌و چاکەکاری خۆیەوە هێناویەتەدی.) وەلامێکی بەهێزو ددان شکێنی تێدایە، بۆ پرسیارێك کە دڵی هەندێك کەسی بێبرواو خوانەناس. یان خۆ بە خواناس پیشاندەری کرمێ‌و گوما ندار کردوە! پرسیارەکەش ئەمەیە: بێگومان ئێوە دەڵێن خوا حەوجێی بە غەیری خۆی نیە، چونکە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لە هەموو سیفەتێکی نزم‌و کەم‌و کووڕی یەك دوورە، باشە ئەدی مادام خوا پێویستی بە بوونەوەر نیە بۆچی

خولْقاندوو یەتی؟! حە تمەن ئ یوەی خوا ناس نا چارن لە دوو شتی خراپ یەکیان هەڵبژێرن، یان بڵێن: خوا حەجێی بوو نەوەر بوو بۆیە هێنا یەدی، یان بڵێن: خوا پێویستی بە بوونەوەر نەبوو بەڵام هەروا لە خۆڕاو بێحیکمەتو هۆ خولقاندی!! دیارە هەردووکیشیان یەك لە یەکی خراپترن، چونکە یەکەمیان ئاتاجیی پاڵدەداتە لای خواو، دووەمیشیان نەزانیو بێحیکمەتیو کاری بێ جێکردن!! ئێمەش لە وەڵا مدا دەڵێین: نەخێر ئێمە بۆ وەڵامی پرسیاری (خوا بوونەوەری بۆ خولقاند؟!) ناچار نین کە حەتمەن یەکێك لەو دووریێیە خوارو خێچو نالەبارەی سەرێ هەڵبژێرن، بەڵکو رێیەکی دیکەی سێیەمی لەبارو تەختو ماقووڵ هەیەو، ئێمە دەڵێین: ئایا مەرجە ئەگەر هەر کەسێك کارێك بکات حەوجێی نەبێو بۆ خۆی سوودی لێ وەر نەگرێ حە تمەن بە کارێکی بێجێو ناحەکیمانە لە قەڵەم بدرێ؟! دیارە نەخێر، چونکە ئەو کارانەی ئەنجام دەدرێن مەرج نیە هەموویان هەر پاڵنەری حەوجێیی و پێویستی پێ بوونو سەرتێ وەستانو پەك لە سەر کەوتن بیانهێنێ تە دی! ئا یا تۆ لە کاتێکدا بەلای سواڵکەرێکی هەژارو بێدەستدا ڕەت دەبیو دەست دەبەیە باخەڵو پارەیەکی دەدەیە، بۆیە دەیدەیە چونکە سەرت ت ێی وە ستاوەو پێوی ستیت پێ یەتی؟! د یارە نەخێر، ئەدی چ شتێك پا ڵت پێوەدەنێ یارمەتی بدەی؟ دیارە بەزەیی پێداهاتنەوەو دڵ پێ سووتانت!! (بۆیە رووی قسانم لە بابای دوێنراوو خاوەن پرسیارە، چونکە ئەو بڕوای بە دوارۆژیش نیە تاکو بگوترێ: بۆیە کابرای بەخشەر ماڵە کەی دەبەخشێو یاریدەی نەدارێکی پێدەدات چونکە حەوجێی پادا شتی خوا یە لە بەهەشتێدا بەڵکو نا چارین بڵێین ئەو پارە بەخشینەی کابرای بێبڕوا، بەس بەزەیی پێدا هاتنەوەو دڵ پێ سووتانە) دە بە هەمان پێودانیش، خودا (سبحانەوتعالی) هیچ پێویستییەکی بە ئێمە نیەو پەکی لەسەرمان نەکەوتوە، بەڵکو ئێمە هەموومان حەوجێوچاو لەدەستی وین وەك فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ (الفطر –15) واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوە حەوجێی خوانو خودا بۆخۆی دەوڵەمەندی سوپاس کراوە. بەڵێ خودا نە ئێمەو نە هیچ شتێکی لە بوونەوەردا نەخولْقاندوە بۆ ئەوەی مەدارێکی خۆی پێ سازبکاتو کەلێنێکی پێ پروە کات!! ئەوە لە لایە کەوە، لە لا یەکی دیکە شەوە وەك روو نمان کردەوەو سەلماندمان مەرج نیە ئەو ئیشوکارانەی ئەنجام دەدرێن مادام بە پاڵنەری ئاتاجی و پەك لەسەر کەوتن نەیە نە دی بێحیکمەتو نەزانانە بن، بەڵکو جاری وایە نەك خودا (جل جلا لە) تەنا نەت مرۆڤیش هە ندێك کاران دەکات هیچ پێویستی بەو

هێناویەتەدی: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾(تر)، بە بەزەیی بەخشندەیە، ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾(یر)، وە بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە. بە پێچەوانەی بیری ماددەپەرستیی و بێبڕواییەوە، کە پێی وایە بوونەوەر شاری بێ ساحێبەو نە کەس دروستی کردوەو نە کە سیش مەشووری دەخواو بەسەری ڕادەگات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا....﴾(سم)، واتە: وە ئاسمانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان بە بەلاش دروست نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە کافرن...، وە بە پێچەوانەی ئەو فەیلەسووفە کەللە و شلكو دڵ مردووانەوە، کە بەس وەك وەگەڕخەرو دروستکەرێك سەیری خوا دەکەنو زیاتر وەك وەستاو ئەندازیارێك لە خواوە ڕادەمێنن، هەتا خوایەکی بەخێوکەرو پەروەردگارێکی بە سۆزو بەخشندە.

---

کارانەدیەو ئەو پەڕی حیکمەتو لێزانیشیان تێدایە، کە بریتییە لە یاریدەدەرانی فەقیرو دەستگرتنیو بەهاناوە هاتنی بە پاڵنەری چاکەکاریو بەزەییو بەخشندەیی!! کەواتە خوداش کە ئێمەو بوونەوەری خوڵقاندوە، نە پێویستی پێبوونو، نە بێحیکمەتیو هەوەنتەکاری، شتاقیان لە گۆڕێدا نەبوون، بەڵکە بەس ئەوە لە گۆڕێ دابووە کە خودا: ﴿الرَحْمن الرَحيم﴾ەو خاوەنی ئەو پەڕی میهرەبانیو بەخشندەییو چاکەکارییە، ئنجا هەموو جۆرە بەزەیی نواندنو چاکەکارییەکیشی لە دەست دێو ویستوویەتی چاکەمان لەگەڵ بکاو لە ڕووی لوتف و بەزەییەوە لە سەرچاوەی ڕوونی بوون (الوجود) بەشمان بدات..

(تر) ( الفاتحة – 3 ).

(یر) ( الأعراف – 156 ).

(سم) ( ص – 27) .

## (2) خـوا تـاك‌و تەنیـاو بێوێنـەو هـاوتـایە:

خوای میهربان تاك‌و تەنیایەو هەموو شتێك حەوجێی وی یەو ئەو حەوجێی هیچ شتێك نیە، كەسی لـێ نەبووە لە كەسیش نەبووە بێوێنەو هاوتایە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۞ اللَّهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾(١)، واتە: بڵێ: ئەو خوایەكی تاكە، خوایەكە هەموو شتێك حەوجێیەتی‌و ئەو حەوجێی كەس نیە، كەسی لـێ نەبووەو، لە كەسیش نەبووە، وە هیچ كەس هاوتای وی نیە، وە خوا نە لە زاتی‌دا نە لە سیفەتەكانیدا وەك هیچ كام لە دروستكراوەكانی ناچێ، وەك فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾(٢)، واتە: هیچ شتێك وەك وی نیە، وە خوا هەربووو (أزلي)و بێ سەرەتایەو هەرماو (أبدي)و بێكۆتایە، وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾(٣)، واتە: ئەو یەكەمین‌و دوامینە، یانی نە لە پێش ویدا هیچ هەبووە، نە لە دوای وی هیچ دەبێ. نەك وەكو ئەفسانەی ئیغریقی كە بۆ هەركام لە دیاردە سروشتیەكانی وەك: با، باران، ئاگر، هەور، لافاو، برووسكە... هتد پەروەردگارێكی تایبەتی بڕیار دەدات، وە نەك وەك ئەفسانەكانی كڵێسای كڵێس كە منداڵ‌و هاوسەر بۆ خوا دادەنێ‌و عیساو دایكیشی -سەلامی خوایان لـێ بێ- بە دوو خوای دیكە لە قەڵەم دەدەن، وەك

---

(١) (الأخلاص - 1، 2، 3، 4).
(٢) (الشورى 11).
(٣) (الحديد 3).

خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ﴾(١)، واتە: بێگومان ئەوانەی دەڵێن: خوا سێیەمی سێیەکانە کافرن، وە نەك وەك جوولەکەکان کە منداڵ بۆ خوا بڕیار دەدەنو زیاتر وەك ئینسان سەیری دەکەن، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ﴾(٢)، واتە: وە جوولەکەکان گوتیان عوزەیر کوڕی خوایە، وە نەك وەکو زەردەشتییەکان کە رووناکی بە خوای خێر (یەزدان)و تاریکی بە خوای خەراپە (ئەهریمەن) دادەنێن.

## (3) خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لە هەموو لەکەیەك دوورە:-

خوای دەستەڵاتدارو بەخشندە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو چاكو پەسندە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾(٣)، واتە: وە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی ـ بوونەوەرـ دا هەیە سوپاسو ستایشی خودا دەکات. هەڵبەتە ئەگەر خودا خاوەنی ئەو پەری سیفەت بەرزییو ئاکار پەسندیی نەبایە، لە تێکرای بوونەوەردا سوپاس نەدەکرا، چونکە بەبێ چاکیو پەسندی سوپاس بۆ کران نایەتە دی، وە لە هەموو سیفەتێکی ناتەواوو خەراپ بەری یەو هەتا بڵێی پاكو

(١) ( المائـدة 73 ).
(٢) ( التوبـة 30 ).
(٣) ( الـروم 18 ).

بێ‌گەردە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾(٤٩)، واتە: حەوت ئاسمانەكانو زەویو هەرچی تێیاندا هەیە پاكی بۆوی بڕیار دەدات، وە هیچ شتێك نیە كە پاكیو پەسندی وی ڕانەگەیەنێ، وە سیفەتە بەرزو پەسندەكانی خوا دیاری كراو نینو بێ سنوورن، واتە خوا هەموو شتێك دەزانێ، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَخْفَى عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلا فِي السَّمَاءِ﴾(٥٠)، واتە: خوا هیچ شتێكی لێ ون نابێ، نە لە زەویو نە لە ئاسمانێ وە توانای بەسەر هەموو شتێك دادە شكێ، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(٥١)، واتە: بەڕاستی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، وە هەر چی بیەوێ دەیكا، وەك فەرموویەتی: ﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾(٥٢). هەرچی بیەوێ دەیكا، وە خوا هیچ شتێك نیە نەیبینێو نەیبیستێ، وەك دە فەرموێ: ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾(٥٣)، واتە: وە ئەو بیسەرو بینایە، وە خوای مەزن ژیانی لە خۆیەوەیەو ئەو ژیان بە غەیری خۆی دەبەخشێ، وەك دەفەرموێ: ﴿الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾(٥٤)، واتە: زیندووەو سەرپەرشتیكەرە، وە خوا گۆیایەو قسەی وی

(٤٩) ( الأسراء – 44 ).
(٥٠) ( آل عمران – 3 ) .
(٥١) ( البقرة – 20 ).
(٥٢) ( البروج – 16 ).
(٥٣) ( الشورى – 11 ).
(٥٤) ( البقرة – 255 ).

بێهاوتایە لە ڕاستیی و ڕەوانیی و ڕێكوپێكیدا، وەك فەرموویەتی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً...﴾[]، واتە: وە قسەی پەروەردگارت لەوپەڕی ڕاستیی و ڕێكو پێكی دا یە، وە خوای بێ هاوەڵ ئەو پەڕی بەزەیی و لێبوردن و بەخشندەیی هە یە، وەك دە فەرموێ: ﴿وَ كَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾[یر]، واتە: وە خودا لێبوردەو بە بەزەیی یە، وە فەرموو یەتی: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾[سم]، واتە: بە بەزەیی بەخشندەیە، وە تووڕەیی و قەهریشی هیچ شتێك خۆی بۆ ڕاناگرێ، وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾[]، واتە: ئەو خودا یەكی تاكو دە ستەڵاتدارە، وە دادگەریی و كاربەجێیی و خودا وێنەی نیە، وەك فەرموویەتی: ﴿أَ لَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾[له]، واتە: ئایا خودا داد گەرینی فەرمانڕەوایان نیە؟ وە فەرموویەتی: ﴿لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[]، وا تە بێجگە لەوی چ پەرستراو نین، دەستەڵاتدارو كاربەجێیە.

## (4) خوا خاوەنی چەند نــاوێكە كە چاكترین و تەواوترین ناون:

---

(تر) ( الأنعام  115 ).

(یر) ( الأحزاب – 59 ).

(سم) ( الفاتحة – 3 ).

() ( الزمر  4 ).

(له) ( التين – 8 ).

() ( آل عمران – 18 ).

خوای پەروەردگار خاوەنی چەند ناوێکە، ئەوانەش بەرزترین و تەواوترین ناون و پێویستە مرۆڤ بەس بەو ناوانە بانگی خودا بکات و لەبەری وەپاڕێ و هیچ ناوێکی دیکەی لێ هەڵنەدات، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ﴾[1]، واتە: وە خودا ناوی چاك و پەسندی هەن، جا بەو ناوانە بانگی بکەن وە واز لەوانە بێنن کە لە ناوەکانی لادەدەن و دەیانگۆڕن، هەڵبەتە ئەو ناوانەش هەر کامێکیان دروشم و نیشانەی یەکێك لە سیفەتە تەواوو بەرزەکانی خودان، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لە بارەی ئەو ناوانەوە فەرموویەتی: ((إِنَّ لِلّه تَعالى تِسْعَةَ وتِسْعُينَ إِسْماً مائةً إلاّ واحداً، مَنْ أحصاها دَخَلَ الجَنَّة، إِنَّه وتْرٌ يحب الوَتِرَ))[2]، واتە: بێگومان خوای بەرز نەوەدو نۆ ناوی هەن، سەد جگە لە یەکێك، هەر کەسێك کۆیان بکاتەوە دەچێتە بەهەشتێ، بێگومان ئەو تاکە و تاکی خۆش دەوێ. ئنجا پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەدا کە (ترمذي وابن حبان وابن خزيمة وحاكم و بيهقي وابن ماجة) گێڕاویانەتەوە ئەو (99) ناوەی باس کردوە کە ئێمە لێرەدا دەیاننووسین و بە کوردیش مانایان لێك دەدەینەوە: (هُوَ اللهُ الذي لا إلهَ إلاّ هُوَ:

1 ـ الرَّحْمن بەبەزەیی

2 ـ الرَّحيم بەخشندە

---

[1] ( الأعـراف – 118 ).

[2] ( رواه الشـيخان ).

3 ـ المَلِك سەرۆك، پادشا

4 ـ القُدُّوس پاك

5 ـ السَّلام بێعەیب، بێپەڵە

6 ـ المُؤمِنْ دڵنیاكەر، بەراست دانەر

7 ـ المُهَیْمِنْ بەسەر راگەیشتوو

8 ـ العَزِیْز زاڵ، دەستەڵاتدار

9 ـ الجَبَّار باڵادەست، ناچاركەر

10 ـ المُتَكبِّر خۆبەگەورەزان

11 ـ الخالِق دروستكەر، بنیات نەر

12 ـ الباريء بەدیهێنەر

13 ـ المُصوِّر وێنەكێش

14 ـ الغَفّار لێبوردە

15 ـ القَهّار گەردن كەچكەر

16 ـ الوهّاب بەخشەر

17 ـ الرَّزّاق رۆزی دەر

18 ـ الفَتّاح دەرووكەرەوە

19 ـ العَلْيم زانا

20 ـ القابض لێگرەوە، وێكهێنەر

21 ـ الباسِط لەدوودەر، فراوانكەر

22 ـ الخافِض دانەوێن، نەوی كەر

| | |
|---|---|
| 23 ـ الرافِع | بڵندكەر ، بەرزكەرەوە |
| 24 ـ المُعِزّ | زاڵكەر ، عیززەت بەخش |
| 25 ـ المُذِلّ | زەبوونكەر ، مل پێكەچكەر |
| 26 ـ السَّمِيْع | بیسەر |
| 27 ـ البَصِيْر | بینەر |
| 28 ـ الحَكَمْ | فەرمانرەوا ، حوكمران |
| 29 ـ العدْل | دادگەر |
| 30 ـ اللَّطِيْف | چاكەكاری پەنهان، وردبین |
| 31 ـ الخَبِيْر | شارەزا ، هەواڵدەر |
| 32 ـ الحَلِيْم | هێدی، ئارام |
| 33 ـ العَظِيْم | مەزن |
| 34 ـ الغَفُور | لێبوردە ، گوناح پۆش |
| 35 ـ الشَّكُور | سوپاسگوزار |
| 36 ـ العَليّ | بەرز |
| 37 ـ الكَبِيْر | گەورە |
| 38 ـ الحَفِيظْ | پارێزەر |
| 39 ـ المُقِيْت | بژیوگەیێن، دەستەڵاتدار |
| 40 ـ الحَسِيْب | لێپرسەرەوە |
| 41 ـ الجَلِيْل | سیفەت بەرز |
| 42 ـ الكَرِيْم | بەرێز ، رێزگر |

| | |
|---|---|
| 43 ـ الرَّقِيْب | چاودێر |
| 44 ـ المُجِيْب | وەڵامگۆ |
| 45 ـ الواسع | فراوان |
| 46 ـ الحَكِيْم | کاربەجێ، لێزان |
| 47 ـ الودُود | بەندەدۆست، خۆشویستراو |
| 48 ـ المَجِيْد | پایەبەرز، خاوەن شکۆ |
| 49 ـ الباعِث | زیندووکەرەوە، نێرەر |
| 50 ـ الشَّهِيْد | ئاگادار، ئامادە |
| 51 ـ الحَقّ | پایەدار، راست، هەق |
| 52 ـ الوَكِيْل | کارپێ سپێرراو، پشتوپەنا |
| 53 ـ القويّ | بە توانا |
| 54 ـ المَتِيْن | بەهێز، قایم |
| 55 ـ الوَلِيّ | دۆست، یاریدەدەر |
| 56 ـ الحَمِيْد | ستایش کراو، شایستەی سوپاس |
| 57 ـ المُحْصِي | ژمێرەر |
| 58 ـ المُبْدِيء | پەیداکەر |
| 59 ـ المُعِيْد | گێڕەرەوە، زیندووکەرەوە |
| 60 ـ المُحيِي | ژیێنەر |
| 61 ـ المُمِيْت | مرێنەر |
| 62 ـ الحَيّ | زیندوو |

| | |
|---|---|
| 63 ـ القَيّوم | مشوورگێڕ، ڕاوەستاو |
| 64 ـ الواجد | هەبوو |
| 65 ـ الماجد | خاوەن پایەی بەرز |
| 66 ـ الواحِد | یەك |
| 67 ـ الأَحد | تاك، تەنیا |
| 68 ـ الصَّمَد | حەوجێ پێ بوو، جێی مەبەست (جێی نیازو بێنیاز) |
| 69 ـ القادِر | توانادار |
| 70 ـ المُقْتَدِر | خاوەن سەرچاوەی توانا |
| 71 ـ المُقَدِّم | پێشخەر |
| 72 ـ المُؤَخرِّ | دواخەر |
| 73 ـ الأَوَّل | یەکەمین |
| 74 ـ الآخِر | دوامین |
| 75 ـ الظّاهِر | دیار، ئاشکرا |
| 76 ـ الباطِن | ون، پەنهان |
| 77 ـ الوالِي | سەرپەرشتیکەر |
| 78 ـ المتَعال | زۆربەرز، خۆ بە بەرزگر |
| 79 ـ البَرّ | چاکەکار |
| 80 ـ التَّوّاب | تۆبە وەرگر |
| 81 ـ المُنْتَقِم | تۆڵەستێن |

82 ـ العَفُوّ چاوپۆشـیکەر

83 ـ الرَّؤُوف میهرەبان

84 ـ مالكُ المُلْك خاوەن مڵك

85 ـ ذو الجَلال والأكْرام خاوەن پایەی بەرزو ڕێز

86 ـ المُقْسِط دادپەروەر

87 ـ الجامِع کۆکەرەوە

88 ـ الغَنيّ دەوڵەمەند

89 ـ المُغْني دەوڵەمەندکەر، بێ نیازکەر

90 ـ المانِع بەرگر، پێشگیری کەر

91 ـ الضّارّ[1] زیان گەیێن بە دوژمن و ناحەزانی.

92 ـ النّافع سوود گەیێن بە دۆست و خۆشەویستانی.

93 ـ النُّور ڕووناکی.

94 ـ الهادِي ڕێ پیشاندەر.

95 ـ البَدِيع داهێنەر، بێوێنە.

96 ـ الباقِي هەرماو.

97 ـ الوارث میراتگر.

98 ـ الرَّشِيْد کارزان، شارەزاکەر.

---

(1) پێشتر باسمان کرد کە زانایانی فەرموودەناس (المحدِّثون) لە بارەی سەنەدی ئەم فەرموودە یەوە بە گ شتی م شتومڕیان هە یە، وە بە تایبەت لەبارەی و شەی (الضّارّ)ەوە ئیشکالیان هەیەو مەگەر (قَید)ێکی بخرێتە سەر وەك (الضّارّ بالكافرين) ئەگەرنا شایستەی خوا (سبحانەوتعالى) نیەو بە یەکێك لە ناوەکانی دانانرێ.

## 99 ـ الصَّبُور ئارامگر.

## چەند ئاگاداری یـــەك دەربارەی ناوەكـانی خـــوا

1 ـ وەك لەو فەرمـوودانەوە كە ڕابردن دەردەكەوێ، ناوی خوا (الله) -جل جلاله- لە ڕیزی (99) ناوەكان نەژمێرراوە، دەنا دەیكردە (100)، بێگومان هەر واشە چونكە فەرمـوودەكە دەڵێ (إِنَّ لِلَّهِ...) كەواتە ئەو (99) ناوە هەموویان سیفەتی خوا (الله)ن‌و وەسفی ئەویان پێ‌كراوە.

2 ـ مەبەست لە ڕستەی: (مَنْ أَحْصاها دَخَلَ الجَنَّةَ) لەسەر ڕای زۆربەی زانایان لەبەركردن‌و تێگەیشتن و بیرلـێ‌كردنەوەو كارپێكردنی ئەو ناوە بەرزو پەسندانەیە.

3 ـ كاریگەریی ئەو ناوە بەرزو چاكانە بۆ چاككردنی ئینسان‌و لە خوا نزیك خستنەوەی، لەو ڕووەوەیە كە خوای بەرزو مەزن پ ێی خۆ شە بەناوو سیفەتە بەرزەكانی مەدحی بكەین، وە هەتا ز یاتریش ئەو ناوو سیفەتە بەرزو چاكانەی خوا لە دڵ‌و مێشكی ئینساندا جێگیر بن‌و، پتـر بیـریان لـێ‌بكاتەوە، زیاتر كاردەكەنە سەر دڵ‌و دەروونی‌و لە سیفەتی بەرزو ڕەوشتی پەسەند نیزیكتـر دەبێتەوەو لە نا سینی خوادا شارەزاتر دەبێ‌و قاڵتـر دەبێتەوە(1).

(1) لە هەر كام لە (الأذكار)ی (نووي) و (تحفة الذاكرین)ی (شوكاني)دا ناوە بەرزەكان نەقڵ كراون، بڕوا نە (الأذكـ ـار) ل 94 ، (تح فة ا لذكرین) ل 53، بەڵام لە كتێ بی (الأذكار)دا ناوی (الاحد) كە ژمارەكەی (67)ە پەڕێنراوەو جگە لە ناوی (الله) ژمارەی ناوەكان (98) ن، بەڵام (تحفة الذاكرین) بەو شێوەیەی هێناون كە من نووسیومن.

4 ـ هەندێك لەناوە پەسندو چاكەكانی خوادا (صیغة المبالغة) یان بۆ بەكارهێنراوە وەك: الفتاح، التواب، الوهاب... هتد، بەڵام: لەبەرئەوەی لە كوردیدا ئەم جۆرە دەربڕین (تعبیر)ە نیە، من هەروا بە ئاسایی وەرم گێڕاونە سەر زمانی كوردی، دەنا لە ڕاستیدا ئەگەر مانای وشەییم ڕەچاوكردبا دەبوو بۆ (الفتاح) گوتبام زۆر زۆر زۆر...... دەرووكەرەوە!! وە هەروەها بۆ ئەوانی دیكەش.

## (5) خوا هەموو شتێكی لەسەر بنچینەی زانیاری یەكی قووڵ و بێسنوور خوڵقاندوە:

خودا هەرچی دروستی كردوە هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری یەكی قووڵو بێسنوور دروست كردوەو لە هیچ كام لە دروستكراوانی خوادا هێندەی نووكی دەرزیش نارێكیو بێیاسایی نابینرێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ ۞ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾[1]، واتە: لە دروستكراوی خوادا نارێكی نابینی، چاوبگێڕە بزانە هیچ كەلێنو كونان دەبینی! دووبارە جار لە دوای جار چاوبگێڕە، بەڵام لە ئەنجامدا چاوت بە دەركراوییو ماندوویی دەگەڕێتەوە لات.

خوێنەری خۆشەویست! ئەم دەقەی سەرێ ئەنجامگیری (استنتاج)ێكی یەكجار گرنگو بایەخداری لێ وەدی دێ: ئەویش ئەوەیە كە بە

---

[1] (الملـك - 3،4).

پێچەوانەی وڕێنەو قسەی بزرکێنراوی کەسانێکەوە کە خۆ بەبێ بڕواو (دژ خوا)!! پێشان دەدەن، گەشەکردن‌و بەرەوپێش چوونی زانیاری‌و پەردەلاچوون لەسەر ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەرو، دۆزرانەوەی یاساو دەستوورەکانی سروشت نەك هەر نابێتە هۆی بەرەوپاش چوونەوەی بیری ئایینی (الفكر الديني)و بەرەو بێبڕوایی چوونی خەڵك! بەڵکو بە بەراوەژووەوە هەتا پتر زانیاری بەرەوپێش بچێ‌و زیاتر رازو نهێنییەکانی بوونەوەر ئاشکرابن‌و، یاساو دەستوورەکانی سروشت چاکتر پەییان پێ ببدرێ‌و بدۆزرێنەوە، بیری ئایینی (بەڵام ئایینی راست‌و نەشێوێنراو کە بەس ئیسلامە) بە گشتی‌و بڕوا بەخوابوون‌و خواناسیی بە تایبەتی زیاتر گەشە دەکاو فراژوو دەبێ و چاکتر ڕەگان دادەکوتێ لە دڵ‌و دەروون و بیرو هۆشی خەڵکیدا، چونکە بوونەوەر کتێبی بێ خراو (الكتاب المنظور)ی خوایەو، جێگەی تێیدا دەرکەوتنی سیفەتە بەرزو پەسەندەکانیەتی لە ویست‌و تواناو زانیاری‌و بەزەیی‌و... هتد، وە ئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی ناوەکانیەتی، ئنجا گومانی تێدا نیە مرۆڤ هەتا پتر بە کتێبی نووسەرێك ئاشنا بێ، زیاتر بە کەسایەتی ئەو نوو سەرەو سیفەتەکانی ئاشنا دەبێ و چاکتری دەناسێ، بۆ وێنە ئێمە هەتا زیاتر کتێبی (إحياء علوم الدين)ی ئیمامی غەزالی‌و (مجموع الفتاوي)ی ئیبنو تەیمییەو (رسائل النور)ی سەعیدی نۆرسی‌و (في ظلال القرآن)ی سەیید قوتب‌و (تفهيم القرآن)ی مەودوودی، موتالا بکەین‌و

بخوێنینەوەو بتوێژینەوە، پتــر پەی بە پایە بەرزییو شارەزایی ئەو ناودارانە دەبەینو چاکتر دەیانناسین، خوا لە هەموویان خۆشبێو پلەیان بەرزتر بکاتەوە، ئنجا لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی وڕێنەی بێبڕوایانەوە، هەتا زیاتر زانیاری گەشە بکاتو بوونەوەر چاکتر یاساو دەستوورەکانی ئاشکرابن، بیــری بێبڕواییو کافرایەتی زیاتر پاشەکشە دەکاو بەپاشەوە دەچێتەوە!! چونکە بیــری بێبڕوایی بە هەموو جۆرەو شێوەکانییەوە سەرجەم دەچێتەوە سەریەك ئەسڵ، ئەویش ئەوەیە کە بوونەوەرو هەرچی تێیدایە، لەخۆوەو بێ هیچ کردگارو پەروەردگارو مشوورخۆرێك دروست بووەو بەڕێوە دەچێ!! بە واتایەکی دی هەموو جۆرو شێوەکانی بیــری بێبڕوایی سەرجەم لەو بنچینەیەدا هاوبەشنو لە سەر ئەو ئەسڵە ڕێککەوتوون، کە دروست بوونو بەڕێوەچوونی بوونەوەر سەر چاوەیەکی زانستییانەو حەکیمانەی نیە! بە کورتی بوونەوەر بە ڕێکەوتو هەڕەمەکیو گۆترەکاریی دروست بووەو، هیچ کەس نەخشەو بەرنامەیەکی زانیارییانەی وردو قووڵی بۆ دانەناوە، وەك ( تاوێری سەرەوژێر) کەوتۆتەڕێو، کەسیش نازانێو بۆ کوێ دەچێو پاشەرۆژو سەرەنجامی چۆن دەبێ!! بەڵام بەرەوپێش چوونی زانیاری ( سەرلەبەری لقەکانی، بەڵام بە تایبەتی زانیارییە سروشتییەکان)و دۆزرانەوەی یاساو دەستوورەکانیو پەردەلاچوون لەسەر ڕازو نهێنییە سەرسامکەرەکانیو، پەی بردن بەڕێكو پێکیو یاساداریيەکەی بە ئاشکراو بێچەندو چوون

ڕای دەگەیەنێ کە: ئاگاداربن! بوونەوەر ( تاوێری سەرەوژێر )و گورزی (شەلم کوێرم کەس نابوێرم) نیەو لەسەر بنچیەی زانیاریو لێزانییەکی وردو قووڵو حسێب کراو ڕۆنراوەو بە گوێرەی نەخشەو بەرنامەیەکی زانایانە بەڕێوەدەچێ!! کەواتە ئەو ئەسڵو بنچینەیەی کە بێ بڕوایان بەبەڵگەیان لە قەڵەم دابوو کردبوویان بە بناغەی بیری قرپۆکیانو، کۆشکی ئەفسانەیی خوانەناسی یان لەسەر هەڵچنی بوو، نە بەردو نە کەستەكو نە قوڕو... بەڵکو بەڵمیش تەواو دەرنەچوو!! جا گومانیشی تێدانیە کە دیواری بێبناغە ڕاناوەستێ و، دەستبەجێ بەلا چوونو نەمانی بناغەی دیواریش لە سەرڕا بۆ خوارێ هەرەس دێنێو هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ! هەر بۆیەش خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾[*]، واتە: لەمەودوا بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین لە ئاسۆیەکان (ئاسمانەکان)داو لە نەفسی خۆیاندا، هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە کە ئەو (خوا یان قورئان) هەقەو ڕاستە. بێگومان ئەم ئایەتە گفتو بەڵێنو مزگێنییەکی خۆشی تێدایە، کە ئێستا سوپاس بۆ خوا بە چاوی خۆمان دەیبینین: چۆن زانیارییە سروشتییەکان بوونە خزمەتکارو بەردەستی بێفیزی بیری ئایینیو، چاکترینو بەهێزترین پاڵپشتی بیری خواناسیو، درەوشاوەترینو بێ پێچو پەناترین بەڵگەی دەستی بڕواداران.

---

(*) ( الفصلت – 53 ).

## (6) خوا بەرنامەیەكی ناردوە تاقە بەرنامەی ڕاستو تێرو تەواوە:-

خوای بێوێنە هەروەك چۆن نە لە زاتیدا، نە لە سیفەتەكانیدا، نە لە دروستكراوەكانیدا، نە لە قسەو وتەكانیدا، كەمو كوڕییو نا تەواوییو هەڵەو پەڵەی نیەو لە هەموو لایەنێكەوە پاكو بەرزو پەسندەو هاو تای نیە، ئەو بەرنا مەو پەیڕەوەش كە تەواو كەری بەرنا مەی گ شت پێغەمبەرانە (علیهم السلام) خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ ﴾(□)، واتە: وە قورئانمان بۆ لای تۆ ناردوە ڕاستیی تێدا یە، كتێ بەكانی پێش خۆی بەراست دەزانێو بەسەریانەوە چاودێرە وە بە دوایین پێغەمبەری خۆی (محمد)دا (علیه الصلاة والسلام) ناردوویەتی خوای بەرز دە فەرموێ: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾(□)، واتە: محمد بابی هیچ كام لە پیاوانتان نیە (مەبەست لە زەیدە) بەڵكو نێرراوی خواو كۆتایی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، تێرو تەواوو پاكو بێگەردە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ...﴾(□)، ئەمڕۆ بەرنامەكەتانم بۆ تەواو كردن، وە وەڵام گۆی هەموو پرسیارەكانی ژیانی مرۆڤە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَاناً لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدىً وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾(□)، واتە:

---

(□) (المائدة □ 48).
(□) (الأحزاب - 40).
(□) (المائدة - 3).
(□) (النحل - 89).

وە قورئانمان ناردۆتە سەر تۆ هەمووو شتێك ڕوون دەكاتەوە، وە ڕێڕوونیو خێرو خۆشیو موژدەیە بۆ مسولْمانان، وە شیفاو چارەسەری سەر لەبەری گیروگرفتو دەردوخۆشییەكانیەتی، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدىً وَشِفَاءٌ﴾[٤٤]، واتە: بلْێ ئەوە ڕێنماییو چارە سەرە بۆ ئەوانەی بڕوادارن، ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾[٤٥]، واتە: وە ئەوەی لە قورئانێ دەینێرینە خوارێ چارە سەرو رەحمەتە بۆ بڕواداران‌و تاقە بەرنامەیە كە كە بتوانێ سەربەرزیو بەختیاریی ڕاستەقینە بۆ تاكو كۆ مەلْ بێنێتە دی، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ...﴾[٤٦]، واتە: وە سەربەرزی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەكەیو بۆ بڕوادارانە... ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً﴾[٤٧]، واتە: هەركەسێك كردەوەی چاك بكات لە نێر یان لە مێ وە بڕواداریش بێ ئەوە لە ژیانێكی خۆش‌و پڕ ئارامیدا دەیژیەنین، وە تا كە بەرنامەیە كە كە بتوانێ داد گەرییو یەكسانیو ئازادی لە نێوان كۆمەلْدا بچەسپێنێ، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى...﴾[٤٨]، واتە: خودا فەرمان دەكات بەدادگەرییو چاكەكردن‌و دەستگیرۆیی كردنی خزمان... ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ

---

(٤٤) ( فصلت – 44 ).

(٤٥) ( الأسراء – 82 ).

(٤٦) ( المنافقون – 8 ).

(٤٧) ( النحل – 97 ).

(٤٨) ( النحل – 90 ).

بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾ (ت)، واتە: جا بانگەواز بکە بۆ ئەوەی کە گوترا، وەوەکو فەرمانت پێ‌کراوە خۆت راگرە، وە مە کەوە دوای ئارەزووەکانیان، وە بڵێ بڕوام بە هەر کتێبێك هێناوە کە خوا ناردوویەتی، وە فەرمانم پێ‌کراوە کە بە دادگەریی حوکمتان لە نێوا ندا بکەم، وە تاقە بەرنامەو رێبازێکە کە ئینسان بتوانێ بەهەشتی بەرین‌و رەزامەندی خودای پێ وەدەست بێنێ، وەك خوای کار بەجێ دە فەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً﴾ (ث)، واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە رێنمایی (مرۆڤ) دەکات بۆ تەواوترین ژیان، وە موژدەی پادا شتێکی گەورە دەدات بەو بڕوادارانەی کە کردەوەی چاك دەکەن.

## (7) خوا هەموو کردەوەکانی راست‌و بەجێ‌و حیکمەت دارن:-

هەرچی خوا بیکات‌و ئەنجامی بدات بێ سوودو حیکمەت نییەو، مەرجیش نیە مرۆڤ پەی بە رازو نهێنی‌و حیکمەتی هەموو کردارێکی خوا بەرێ، کەواتە: خوای بەخشندەو تۆڵەستێن هەروەك چۆن زاتی‌و سیفەتی‌و قسەی‌و بەرنامەی‌و دروستکراوی‌و ناوی، لەوپەڕی تێرو تەواوی دان‌و لە هەموو کەم‌وکوڕی یەك بەدوورن، کرداریشی دیسان بە پێی حیکمەت‌و زانیارییەکی بێ‌وێنەیەو هەموو کردەوەیەکی بەجێ‌یەو پڕ لە سوودو خێرو بەرژەوەندییە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا

(ت) ( الشورى - 15 ).
(ث) ( الأسـراء - 9 ).

شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ﴾[1]، وە رەنگە شتێکتان پێناخۆش بێ ئەو شتە بۆتان چاك بێ، وە رەنگە شتێکتان خۆش بوێ و ئەوشتە بۆتان خراپ بێ.

## چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ویست و رەزامەندی خوا

خوێنەری خۆشەویست! لێرەدا دەمەوێ وەڵامێکی ورد بخەمە روو بۆ پرسیارێك کە رەنگە خوتخوتەی زۆر دڵان بدات: باشە مادام کردەوەکانی خوا هەموویان لە سەر بنچینەی زانیاری و لێزانییەکی بێ سنوورو حیکمەتێکی باڵا بەرێوە دەچن، وە لە راستیشدا هەرچی لە بوونەوەردا روودەدات لەو لایەنەوە کە بە پێی زانیاری و نەخشەو ئەندازەگیری خوداو بەهۆی ویست و دەستەڵاتی وی یەوە پەیدا دەبێ دروستکراوی وی یە، بۆچی نارەزایی بەرانبەر بە هەڵوێست و رەفتاری ستەمکارانەی زۆردارو طاغووتە خۆ بە خوازانەکان دەربرین و لێیان راپەرین و ئەو بارودۆخ و واقیعە نائیسلامییانەی کە هێناویاننە دی بیانگۆرین؟! بە واتایەکی دی مادام ئەو رووداوو کارەساتانە بە ویست و دەستەڵاتی خواو

[1] (البقرة - 216).

بە گوێرەی نەخشەو بەرنامەی خوا دێنەدیو هەر کارو کردارێکیش خوا پێی هەستێو ئەنجامی بداتو راست بەجێو حیکمەتداربێ، چۆن بە خۆمان رەوا ببینین دژی واقیعێك بجەنگین کە ویستو دەستەڵاتی خوای کاربەجێو لێزان هێناویەتەدی؟! لە وەڵامدا دەڵێین: هەر چەندە جێی تەرخانی ئەم جۆرە باسانە بابەتی (قەزاو قەدەر)ە بەڵام لێرەش کورتە وەڵامێکی هەر دەدەینەوە: راستە ئەم واقیعەو هەر واقیعو کارو کارەساتو رووداوێکی چاك یان خراپ هەر بە ویستی خواو بە گوێرەی نەخشەو بەرنامەیەك كە خوا دایناوە دێنەدی، بەڵام هەر ئەو خوایەی كە ئەو یاسا سروشتیيانە (القوانين التكوينية)ی داناون كە بە پێیوان هەموو شتێك (چاكو خراپ) دێتەدی، هەمان خواش چەند یاسایەكی شەرعی (القوانين التشريعية)ی داناون، كە فەرمانمان پێدەكەن راپەرینو هەر واقیعێكو هەر دیاردەیەك كە لەگەڵ بەرنامەو شەرعی خوادا نەگونجا لای بەرین. ئنجا دەبێ بزانین كە ویستو رەزامەندی (الأرادة والرِّضى)ی خودا مەرج نیە هەموو دەمێ پێكەوە گونجاوو پەیوەست بن، بەڵكو جاری وایە لێك دەترازێنو دژی یەكدی دەوەستن، بۆ وێنە خوا لە قورئانێدا دەفەرموێ: (مەی مەخۆنەوە)، بەڵام ویستی وایە كە شەراب خۆرەكان بیخۆنەوە، لێرەدا ویستو رەزامەندی خوا لێك جودان! كەواتە: مەرج نیە هەر واقیعێك كە بە ویستی خوا دروست بوو، بە پێی رەزامەندیی خواش بێ، بەڵكو دەبێ بۆ ئەوەی داخۆ فلان واقیع

یان فلان کردەوە خوا پێی ڕازی‌یە یان نا، لە بەرنامەکەیدا بۆی بگەڕێیـن، چونکە بەرنامەو ئایینی خوا هەموو دەمێ لە گەڵ ڕەزامەندیی‌دا پێکەوە جووتن‌و لێك ناترازێن. کەواتە پوختەی قسان: لەبەر ئەوەی خوا بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە، ناگونجێ هیچ شتێك بەبێ ویست‌و توانای وی دروست بێ‌و هەرچی پەیدا دەبێ چاك‌و خراپ هەر بەپێی ویستی خواو بەهۆی توانای وی‌یەوەیە، بەڵام مەرج نیە هەرچی بە پێی ویستی خوا (ویستی خواش لەو یاساو دەستوورانەدا بەرێوەدەچێ کە لە بوونەوەرو ژیانی ئینساندا لە کاردان) پەیدابوو، -خوا لێی رازی بێ- تاکو ئێمەش ناچاربیـن ملی بۆ کەچ بکەین‌و پێی ڕازی بیـن. ئنجا ئەوەی خوا لەسەر ئێمەی پێویست کردوە ئەوەیە کە بەپێی ئەو یاساو دەستوورە ئایینی‌و شەرعییانە بەرێوەبچین، کە خوا ناردوونی‌و لەگەڵ ڕەزامەندیی‌و پەسندیی خۆیدا لێکی بەستوون ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِيناً﴾[1]، چونکە ئێمە دەبێ بەدوای ڕەزامەندیی خوادا وێڵ‌و عەودالْ بین، ڕەزامەندیی خواش لە شوێنکەوتنی ئەو بەرنامە دایە کە لێی ڕازی‌یەو پەسندی کردوە، دەنا ئەگەر بمانەوێ وەدوای ویستی خوا بکەوین، ئەوە پێویست بە ویستن‌و نەویستنی ئێمە ناکات، چونکە هەرچی بکەین هەر بە ویستی خودا دەیکەین‌و ناتوانین لەژێر ڕکێفی ویست‌و دەستەڵاتی وی دەربچین، خوای بەرز دەفەرموێ:

---

[1] (المائـدة – 3).

﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ...﴾(1)، واتە: وە ناتانەوێ هەتا خوا نەیەوێ، بەڵام دەتوانین لە بەرنامەو ڕەزامەندیی خودا دەربچین و لاڕێ بین! کەواتە: ئێمە بۆیە ڕادەپەڕین بۆ گۆڕین و لابردنی ئەو واقیعانەی دژی بەرنامەی خودان، چونکە فەرمانی پێکردووین و بەوە لێمان ڕازی دەبێ، ئنجا خواش هەرچەندە ئەو واقیعانەی بە ویستی خۆی هێناونەدی، بەڵام لە ڕێی کردەوەو ویست و هەڵبژاردنی خراپ و لەگەڵ شەرع و ڕەزامەندیی خوادا نەگونجاوی خراپەکارانەوە هاتوونەدی، وە دەیەوێ بیگۆڕین بە جۆرە واقیعێك کە لەگەڵ ئایین و ڕەزامەندییدا بگونجێن!

بە پێویستی دەزانم بۆ پتر ڕوون بوونەوەی مەبەست پێشەکی وێنەیەك بێنینەوە (لە ژیانی ڕۆژانەماندا) بۆ چۆنیەتی لێك جوێ بوونی (ویست و ڕەزامەندیی)و دواییش وێنەیەك دێنینەوە بۆ پتر ئاشکرابوونی چەمك و مەبەستی ویستی خودا (إرادة الله):

## وێنەی یەکەم: بۆ ڕوونکردنەوەی لێك جیایی ویست و ڕەزامەندیی خوا:-

بابێك دوو کوڕی هەن، پێیان دەڵێ: ڕۆڵەکانم ئەوە باڵغ بوون و لەمڕۆ بەدواوە پیاون و تەکلیفی شەرعتان لە سەرە، جا داواتان لێدەکەم مسوڵمانی چاك بن و بێفەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ مەکەن، هەر

(1) (التکویر 29).

کامێکتان پیاوی چاك بێو بێفەرمانی خوا نەکات، با لە ماڵی مندا بمێنێتەوە، بەڵام هەرکامێکتان بێفەرمانیو سەرەخەری بکاتو ڕێی خوارو خێچو هەڵەتو هەڵدێر بگرێ، لێی تورە دەبمو لە ماڵی خۆم وەدەری دەنێم، پاشان نەڵێن ئاگادار نەبووینو نەمانزانی!! پاشان دوای ماوەیەك یەکیان ڕێی چاکەو خواپەرستی گرتو یەکی شیان سواری کەرێ شەیتانی بووو نەهاتە ژێربار، جا هەرچەندە بابەکە چەند جارێکی دیکەش ئامۆژگاری کردو ئاگاداری کردەوەو ترساندی، بەڵام فایدەی نەبوو!! تا لە ئاکامدا بابەکە کوڕە بەدفەرەکەی لە ماڵێ وەدەرنا!! جا باسەرنج بدەین! بێگومان هەم مانەوەی کوڕە گوێرایەڵو موسوڵمانەکەو هەم دەرکرانی کوڕە بەدفەرو لا سارەکەش، هەردووکیان بە ویستی بابەکەی هاتنە دی، بەڵام دیارە بابەکە هەرچەندە لە مانەوەی کوڕە چاکەکەدا ڕەزامەندیی هەبوو، بەڵام لە دەرکرانی کوڕە بەدکارەکەدا ڕەزامەندیی نەبوو، واتە مانەوەی کوڕە چاکەکەی پێ خۆش بوو، بەڵام دەرکرانی کوڕە بەدەکەی پێ خۆش نەبووە، کەواتە: ڕاستە جاری وایە ئینسان شتێك دەکاتو ویستی لەسەر پەیدابوونی شتێکە، بەڵام پێی خۆش نیەو لێی ڕازی نیە!

ئێستاش پێموایە تائەندازەیەکی چاك چۆنیەتی لێك جوێ بوونی ویستو ڕەزامەندیی خودا ڕوون بۆوە، ئنجا با بچینە سەر وێنەی دووەم:

**<u>وێنــەی دووەم:</u> بۆ ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ویســتی خــودا:**

دەتوانین ویست (ارادة)ی خـــوا (سبحانەو تعالی) بە ئاوی کانییەك بچوێنین، کە ئاوێکی سپیو سافو بێڕەنگو بێتامو بۆنە، دوو کەس دەچنە سەر ئەو کانییەو، یەکێکیان هەندێك ئاوی لـێ هەڵدێنجێو دەیکاتە نێو سوراحییەکەوەو ئەندازەیەك شەکرو شەربەتی لەگەڵ تێکەڵ دەکاتو شەربەتێکی شیرینو بەتامو چێژی لـێ دروست دەکات، ئەوی دیکەشیان هەر لە هەمان کانی هەندێك ئاو هەڵدێنجێو لە گۆزەیەکی دەکاو پاشان مستێك خۆڵی تێدەکاتو ئاوی نێو گۆزەکە دەکاتە ئاوێکی قوڕاوو پیسو نابەرچاو! بێگومان هەم شەربەتە شیرینو جوانو بۆن خۆشەکەو هەم ئاوەقوڕاوو لیڵو تامو بۆن ناخۆشەکەش، هەردووکیان لە ئاوی کانییە سپیو سافو ڕوونەکە هەڵهێنجرابوون، بەڵام هی یەکەمیان بەهۆی دەستکارییو بەکارهێنانی چاکەوە شەربەتی لە ئاوی کانییەکە ڕەخساندو، هی دووەمیشیان بەهۆی دەست تێوەردانو خراپ بەکارهێنانەوە قوڕاوی لـێ فەراهەم هێنا، کەواتە ئاوی کانییەکە لە ئەسڵدا سپیو سافو بێڕەنگو بێتامو بۆن بوو، بەڵام بە ویستو هەڵبژاردنو کردەوەی دوو کەسەکە بە شێکی شەربەتی لـێ دروست بووو تامو بۆنو ڕەنگێکی چاکی گرت، وە بەشێکیشی قوڕاوی لـێ دروست بووو تامو بۆنو ڕەنگێکی بەدوو خراپی پێوەنووسا، دەجا ئیرادەی خوداش بەهەمان شێوە: خوا ویستی خۆی کردۆتە یاریدەدەری هەموو کەس، ئنجا ئایا ئەوکەسانە بەویستو هەڵبژاردنی خۆیان تامو بۆنو ڕەنگی چاك لەگەڵ ویستی خوا لێك

دەدەن‌و کارو ڕەفتارو واقیعی چاك‌و مسوڵمانانە دەڕەخ سێنن، یان بە پێچەوانەوە تام‌و بۆن‌و ڕەنگی بەدی لەگەڵ لێك دەدەن‌و کردارو ئا کارو بارودۆخی خراپ‌و نامسوڵمانانە پەیدادەکەن، ئەوە عا یدی خۆیا نەو دەکەوێتە ئەستۆی خۆیان. ئنجا لەبەرئەوەی خودا کوفرو خراپەی خۆش ناویَ و لێی ڕازی نیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەوی ست هەڵ بژاردنی تاوانباران‌و تام‌و ڕەنگ‌و بۆنی خراپ‌و بەدی تاوا نان هاتۆ تە دی، وەك فەرموویەتی: ﴿... وَلاَ يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ...﴾[تر]، واتە:... خوا کوفری پێ پەسند نیە (پێی ڕازی نیە) بۆ بەندەکانی. لە سۆنگەی ئەوەوە، خوا فەرمانمان پێ‌دەکات کە ئەو واقیع‌و بارودۆخ‌و ئا کارو کردارە دز یوو خراپانە بگۆڕین‌و هەوڵ دەین بە ویست‌و هەڵبژاردنێکی لەگەڵ بەرنامەو ڕەزامەندی خودا گونجاو، واقیع‌و بارودۆخ‌و ئا کارو ڕەفتار یك بێنیـ نە کایەوە کە خودا پێی ڕازی بێ‌و تام‌و بۆن‌و ڕەنگ یێك لە ئاوی ساف‌و بێگەردی کانیاوی ویستی خودا بێنینە دی، کە لەگەڵ بەرنامەو یا سا شەرعییە پەسندەکانی خوادا بـ گونجێن، بۆ ئەوەی هەم وی ست‌و ڕەزامەندی خوداو هەم ویستی ئێمەو ڕەزامەندی خودا پێ کەوە گو نجاو بن‌و دژو پێچەوانەی یە کدی نەبن، وەك خودا فەرموو یەتی: ﴿وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾[یر]، واتە: وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن (و بەندەی چاك‌و بە ئەمەك بن) خوا بۆ تان پە سند دە کاو لێ تان ڕازی دە بێ.

---

(تر) ( الزمـر – 7 ).

(یر) ( الزمـر – 7 ).

هەڵبەتە ڕەزامەندیی خوداش گەورەترین مەبەستی مرۆڤی خواناسو بەرزترین لووتکەی ئاواتو ئامانجیەتی، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾(ت)، واتە: وە ڕەزامەندییەك لە لایەن خواوە گەورەترە (لە هەموو شتێك) هەر ئەوەش بردنەوەی گەورەیە.

## (8) خـوا دادگەرەو هەموو کەس وەك یەك سەیر دەکاو پلەو ئیمتیازی نەداوەتە هیچ کەس:

خوا وەك یەك سەیری مرۆڤەکان دەکات، وەك دەفەرمویّ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾(ت)، ئەی خەڵکینە! ﴿يَا بَنِي آدَمَ﴾(س)، ئەی وەچەی ئادەم! ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ﴾(ل)، ئەی ئینسان! وە هیچ پلەوپایەو ئیمتیازێکی نەداوەتە هیچ ئینسانو هیچ نەتەوەو ڕەگەزو چینو توێژو خێڵو تیرەو بنەماڵەیەك بەسەر باقی خەڵکیدا، وەك فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى...﴾(ه)، واتە: ئەی خەڵکینە ئێوەمان لە نێر (ئادەم)و مێ (حەووا)یەك دروست کردوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە وەکو جوولەکەکان

(تر) (التوبــة – 72).
(یر) (الحــج – 1).
(سهم) (یــس – 6).
(ل) (الأنفطـار – 6).
(له) (الحجرات – 13).

دەیانگوت‌و دەیلێن‌و باقی رەگەزو نەتەوەو تیرەو وەچاخ‌و چین‌و پەرستەکان دەیلێن، وە تاقە سەنگی مەحەك‌و پێوەرو تەرازووی خەڵك پێوان‌و هەڵسەنگاندنیش لەلای خوا بریتیە لە مسوڵمانەتی‌و تەقواو پاریز، وەك خوای کار بەجێ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[تر]، واتە: بەراستی بەرێزترتان لەلای خوا (واتە لە تەرازووی بەرنامەکەیدا) پارێزکارترتانە، پێغەمبەر ﷺ یش دەفەرموێ: ((إِنَّ اللهَ تعالى قد أذهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الجاهِلِيّةَ وفَخْرَهَا بالآباءِ إِنَّما هُوَ مُؤمِنٌ تَقِيٌّ و فاجِرٌ شَقِيٌّ، الناسُ بَنُوا آدَمَ و آدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرابٍ ولافَضْلَ لِعَربيّ على عَجَميّ الاّ بالتقوى))[یر]، واتە: خوای بەرز فیزو دەماری نەفامی‌و خۆهەڵدانەوە بە باب‌و باپیرانی لە ئێوەدا لابردوە، بەس دوو کەس هەن، برواداریکی پارێزکار، بەدکارێکی تاوانبار، خەڵك وەچەی ئادەمن‌و ئادەمیش لەگڵ دروست بووە، وە بابای عەرەب لە غەیرە عەرەب چاکتر نیە مەگەر بە پارێزکاریی، وە فەرموویەتی: ((النَّاسُ مُستَوُون كَأَسْنان المَشْط لَيْسَ لأحَدٍ فَضْلٍ على أحَدٍ إلاّبِتقْوى اللهِ)) (اخرجه الديلمي عن أنس) واتە: خەڵك وەك دەنکەکانی شانە یەکسانن، کەس لە کەس گەورەتر نیە مەگەر بە (زیاتر) پارێزکردن لە خوا.

---

(تر) ( الحجرات – 13 ).

(یر) رواه أبوداود والترمذي و حسَّنه .

## (9) خــوا ڕێزی لە مرۆڤ گرتوەو خۆشی دەوێ و بەجێ نشینی خــۆی داینــاوە:-

خودا (جل جلاله) ئینسانی كردوه بە جێنشینی خۆی لە سەر زەوی، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلائِفَ فِي الْأَرْضِ﴾[1]، واتە: ئەو (خوا) لەسەر زەوی گێراونی بەجێنشین، وە ڕێزی لــێ گرتوەو خۆشی دەوێ، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾[2]، وە ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، ﴿وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ﴾[3]، واتە: وە ئەو لێبووردەیەو بەندەكانی خۆی خۆش دەوێ. نەك وەك ئەوەی جووو دیانەكان دەیڵێن، كە پێیان وایە خوا دانووی لەگەڵ ئینساندا ناكولێ‌و ڕقی لــێیەتی‌و دوژمنایەتی كۆنیان پێكەوە هەیەو، هەر مرۆڤێك كە لەدایك دەبێ بە تاوانباریی و شەرمەزاری لەدایك دەبێ‌و ئەو تاوانەی كە كاتی خۆی (ئادەم) كردی، بەڵایەكە لە ئەستۆی هەموو مرۆڤێك دایە!! كە هەر كەسێك سەرنجێكی سەرپێیی لە تەورات‌و ئینجیل بدات شایەدی ڕاستیی ئەم قسانە دەبینێ (بێگومان تەورات‌و ئینجیلی دەستكاریكراوو گۆڕدراو)، وە دیانەكان دەڵێن: لەسێدارەدرانی عیساش (عليه السلام) بۆ سڕینەوەی ئەو تاوانە بووە) وە دەڵێن: عیسى (عليه السلام) كاتی خۆی بە پیلانی جوولەكەكان گیراوەو لە قەنارە دراوە،

---

(1) ( فاطـر 39 ).
(2) ( الأسـراء 70 ).
(3) ( البـروج 14 ).

هەڵبەتە قورئان ئەو قسەیەی وەدرۆ خستۆتەوەو فەرمووویەتی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾[1]، واتە: وە (جووەکان) عیسایان نەکوشتووەو لە داریان نەداوە، بەڵکو وێنەی ویان لێ براوەتە سەر یەکێکی دیکە، جا دیانەکان دەڵێن خوا بۆیە کوڕی خۆی بە لەداردانندا تا ببێتە قۆچی قوربانی بۆ مرۆڤایەتیو ئەو تاوانەی ئادەم کردی بیسرێتەوە!! وە نەك وەك ئەفسانەکانی یۆنانیو ئیغریقی گومان دەبەن: گوایە خوا زۆر لە پەروەردگاری ئاگر (زیوس) تووڕە بووە چونکە ئاگری لە خوا دزیوەو داویەتە دەست ئینسان وە لە راستیدا یەکێك لە هۆیە بنەرەتییەکانی بەرەو بێبڕواییو بێدینی چوونی وڵاتە ئەوروپاییەکان، ئەوەبوو کە کتێبە ئایینییەکانی وەك (تەورات، ئینجیل، زەبوور) بەهۆی گۆڕان و دەستکاری کرانەوە، تێڕوانینو بیروبۆچوونی سەیرو سەمەرەو ناماقووڵیان تێدابوون دەربارەی خودا، بۆ وێنە تەوراتی ئێستا لە بەشی دووەمی (سیفری تکوین)دا ئاوا باسی هۆو چۆنیەتی دەرکرانی ئادەم لە بەهەشتێ دەکات: (ئنجا خودا لە گڵی زەوی ئادەمی دروست کردو بای ژیانی بە مێشکیدا کردو ئادەم گیانی هاتەبەر، وە خودا هەموو جۆرە درەختێکی جوانو بەتامی لە زەویدا ڕواند، وە درەختی (ژیان)ی لە نێوە راستی باغداو درەختی (زانینی چاك و خراپ)یش... وە خودا فەرمانی بە ئادەم کرد کە بۆت هەیە لە تێکڕای درەختانی باغ بخۆی، بەڵام لە درەختی "زانینی چاك و خراپ" مەخۆ، چونکە لەو

---

(1) ( النساء 157 ) .

رۆژەی دا کە لێی دەخۆی شایستەی مرد نێ دە بی...!). وە لە بە شی سێیەمی (سیفری تکوین)دا گوتراوە: (دەنگی خودا یان بیست کە لەدەمی بەرەبەیا ندا لەنێو با غیّدا گۆرانی دە گوت! وە ئادەمو هاوسەرەکەی لەنێو درەختانی باغەکەدا خۆیان لە خوا شاردەوە! وە خودا بانگی ئادەمی کردو پێی گوت: لە کوێی؟ ئەویش وەلامی دا یەوە کە لەنێو باغیدا دەنگی تۆم بیستو ترسام، چونکە رووتم لەبەرئەوە خۆم حەشاردا، وە خودا پێی گوت: کێ بە تۆی گوتوە کە ڕووتی؟ ئا یا لەو درەختەی کە پێم گوتی لێی مەخۆ خواردت؟ ئادەم گوتی: ئەو ژنەی کە دابووت بە من، ئەو لەو درەختەی دامێو خواردم! وە خودا گوتی ئێستا کە ئادەم بەهۆی (زانینی چاك و خراپ)ەوە وەك یەکێك لە ئێ مەی لێهاتوە، جا نەوەك دەستی خۆی درێژ بکاتو لە (درەختی ژ یان)یش بچنێو بخواتو بۆ هەمیشە بژیەت! ئنجا لە پاشان خودا ئەوی لە باغی (عدن) دەرکرد بۆ ئەوەی لەو زەوییەدا کە ئەوی لێ درو ست کردوە جوتیاری بکات...!) جا ئێستا با سەرنج لەم داستانە ئەفـ سانەیی یەی تەوراتی دەستکاریکراو (مُحَرَّفْ) بدەین، داخۆ چەند تێڕوانینی هە ڵەو خوارو خێچی دەربارەی خودا تێدان:

1 ـ درۆ پاڵدانە لای خوا، چونکە خودا بە ئادەمی گوت ئەگەر لە فلان درەخت بخۆی دەمری، کەچی لێشی خواردو نەشمرد!!

2 ـ رژدیی پاڵدانە لای خوا، چونکە خودا حەزی نەکرد ئادەمو حەووا لە درەختی زانیاریو ژیان بخۆن، نەوەك زانابنو ژیانی هەمیشەیی وە دەست بێنن!!
3 ـ حەسوودیی پاڵدانە لای خوا، وەك دەبینین خودا بەهۆی زانیار بوونی ئادەمەوە حەسوودی پێ بردوەو لە بەهەشتێ دەری کردوە!!
4 ـ بێئاگاییو نەزانی پاڵدانە خوا، چونکە دەڵێ: بانگی ئادەمی کرد کە لە کوێی؟!

کەواتە دەبێ چ گلەیی‌یەك لە بابایەكی زاناو ژیر بكرێ کە لە ئایینێكی ئاوا برەوێتەوەو ملی بیابانی بێدینی بگرێ؟!

ئنجا با سەرنجی قورئانی بەهێزو پیرۆز بدەینو بزانین داخۆ پەیوەندی نێوان خوداو ئادەمو چۆن باس دەكات!! ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لا تَعْلَمُونَ ۞ وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ۞ قَالُوا سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ۞ قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ ؟ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا...﴾(ت)، واتە: کاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: من جێگرێك لە زەوی دادەنێم گوتیان: ئایا

(ت) (البقـرة – 31، 34).

کەسێکی تێدا (بە جێگر) دەگێڕی کە خرا پەی تێدا دە کاو خوێنی دەڕێژێ، لە حاڵێکدا کە ئێمە لەگەڵ ستایش کردنتدا بە پاکت دەگرینو بێپەڵەبیت ڕادەگەیەنین؟ فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن. وە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، دوایی ناوبراوەکانی لەسەر فریشتان ڕانواندن، فەرمووی: ناوی ئەوانەم پێ بڵێین ئەگەر ڕاستگۆن. گوتیان: تۆ پاکی ئێمە هیچ زانیارییەکمان نیە مەگەر ئەوەی تۆ فێر مان بکەی، بێگومان تۆ زانای کاربەجێی. فەرمووی: هۆ ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ، جا کاتێك ناوەکانیانی پێ گوتن، فەرمووی: ئەدی پێم نەگوتن من نهێنیی ئاسمانەکانو زەوی دەزانمو ئەوەی دەری دەبڕنو پەنهانی دەکەن دەیزانم! وە کاتێك بە فریشتامان گوت: کڕنووش (ی ڕێزگرتن) بەرن بۆ ئادام، دەستبەجێ کڕنووشیان برد.... وەك دەبینین:

1 ـ خودا، ئادەم بە جێنشینی خۆی لە قەڵەم دەدات، دیارە جێگریش دەبێ خاوەنی ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیو متمانەو باوەڕی (جێ دار)ەکەی بێ، دەنا لە جێی خۆی داینانێ.

2 ـ خودا زانیاربوونی ئادەم دەکاتە بەڵگەی شایستەبوونی ئادەم بۆ جێگرایەتی.

3 ـ دوای خستنە ڕووی زانیاریو شارەزایی ئادەم، فەرمانی بە فریشتان کردوە کە کڕنووش (ی ڕێزگرتن)ی بۆ بەرن.

کەواتە لە ڕوانگەی قورئانەوە زانایی ئادەم نەك هەر هۆی بوغزێنرانو لە بەهەشت دەرکرانی نەبووە لە لایەن خوداوە، بەڵکو ڕاست بە پێچەوانەوە تاقە هۆی ڕێز لێگیرانو بەکەڵکی جێگرایەتی هاتنی

ئادەم ئەوەیە کە زانیارییەکی هەبووە فریشتان شکیان نەبردوە! ئنجا وەك دیتمان لە تەوراتی (گۆڕراو)دا تاوانی قەدەغە شکاندنو لە درەخت خواردن خراوەتە ئەستۆی (حەووا)وە، بەڵام قورئان بە ئاشکرا خستوویەتە ئەستۆی هەردووکیان (ئادەمو حەووا)وە، وەك دەفەرموێ: ﴿فَأَكَلا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا...﴾(تر)، واتە: لێیان خواردو عەورەتیان لێیان دەرکەوت. کەواتە: ئەوەی کە لە نێوان مسوڵماناندا بۆتە باو گوایە شەیتان پێشێ حەووای فریوداو ئەویش ئادەمی فریودا، یەکێکە لە ئەفسانەو ئیسرائیلییاتەکانو فری بەسەر ئیسلام و قورئانەوە نیە.

## (10) خـوا هیچ دەڵاڵو واسطـەیەکی لە نێوان خۆیو بەندەکانیدا دانـەنـاوە:-

مرۆڤ بۆ ئەوەی گفتوگۆو ڕازو نیازی بەندایەتی لە گەڵ خوادا بکاتو لێی وەپاڕێو بیپەرستێو داوای لێ بکات، حەوجێی بە هیچ جۆرە دەڵاڵو (واسطة)یەك نیە کە لە نێوان خواو مرۆڤدا هەبێ، بە پێچەوانەی ئەفسانەکانی کڵێسایيو بیری پووچی بتپەرستی بە هەموو شێوەکانییەوە، کە پێیان وایە مرۆڤ ڕێی نا کەوێ یەکسەر بچێتە خزمەت خوداو، دەبێ هۆو وەسیلەیەك لە نێواندا هەبێ کە ببێتە ئامرازی پەیوەندی نێوان خواو بەندە، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾(ش)، واتە:

---

(تر) (طـه - 121).

(یر) (الزمـر 3).

وە ئەوانەی کە بێجگە لە خوا چەند شتێکی دی کەیان کردۆتە سەرپەرشتیاری خۆیان ـ دەڵێن ـ تەنیا لەبەرئەوە دەیانپەرستین تاکو لە خوامان نزیك بخەنەوە. وە مرۆڤ دەتوانێ یەک سەر لە هەر کات‌و شوێنێکدا حەزبکات بەبێ پەردە لە گەڵ خوادا بدوێ‌و بیپەرستێ‌و لەبەری بپاڕێتەوەو داوای لێ بکات، خوای بەرز دە فەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ...﴾()، واتە: وە ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من پرسیاریان لێ کردی ئەوە من نزیکم، وەلامی داوای دووعاکەر دەدەمەوە هەرکاتێك بانگم بکات.

## (11) خوا خاوەنی رۆژی سزاو پاداشتەو بەبێ رێدانی وی کەس مافی تکـاکردنی نیە:-

خوا خاوەن‌و گەورەو فەرمانڕەوای رۆژی سزاو پادا شتە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾()، واتە: خاوەنی رۆژی سزاو پاداشتە، وە ئەگەر لە دنیادا خودا گەورەیی‌و سەروەریی خۆی خستۆتە ژێر پەردەی نەدیترانەوە، لەو رۆژەی دا بێ‌پەردە دەردەکەوێ خوای بەرز دە فەرموێ: ﴿لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾()، واتە: ئەمڕۆ دە ستەلات هی کێیە؟ هی خوای تاکی زاڵ‌و گەردن کەچکەرە، وە لەو رۆژەی دا هیچ کەس ناتوانێ تکاو ڕەجا بۆ هیچ کەس بکات هەرچەندە یەکجار بەرێزو

(تر) ( البقـرة  186 ).
(یر) ( الفاتحـة - 4 ).
(سە) ( غافـر - 16 ).

پایە بەرزبێ، مەگەر خوا فەرمان بکاو ڕەزامەندی لەسەر بێ، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾()، واتە: کێیە ئەو کەسەی تکا لەلای وی (خوا) بکات، مەگەر بە فەرمانی وی!! ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلائِكَةُ صَفّاً لا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً﴾(تر)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە جوبرائیلو فریشتەکان رادەوەستن، قسە ناکەن مەگەر ئەوەیان کە خوای میهرەبان ڕێی بداتو قسەی پەسندیش بکات، ئنجا خودای دادگەریش ڕایگەیاندوە کە ڕێ نادات تکا (شفاعة) بۆ کەس بکرێ مەگەر بەندەیەکی فەرمانبەرو چاکەکار بوو بێو جێی ڕەزامەندیی خوابووبێ، خوای بەرز دەفەموێ: ﴿وَلا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى﴾(یر)، واتە: وە (فریشتەکان) بۆ کەس تکاو ڕەجا ناکەن مەگەر بۆ کەسێك کە خودا لێی رازی بێ. کەواتە ئەوانەی گوێ نادەنە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرو ﷺ بە تەمای تکاو ڕەجای پێغەمبەر ﷺ یان فلانو فیسار شێخ پشتێندیان لێکردۆتەوە دەستیان لێ وەبن سەری داوە، با چاك بزانن خراپ حاڵی بوونو لە داوی هەڵە کەوتوون، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((الكَيِّسُ مَنْ دانَ نَفْسَهُ وعَمِلَ لما بَعْدَ المَوْت والعاجِزُ مَنْ أتْبعَ نَفْسَهُ هَواها وتَمَنّى عَلى اللهِ))()، واتە: ژیرو وریا ئەو کەسەیە کە لێپرسینەوە لەگەڵ نەفسی

(تر) ( البقـرة 255 ).
(یر) ( النبـاء – 38 ).
(سەم) ( الأنبيـاء 28 ).
() رواه الترمذي.

خۆیدا بکات، وە بۆ پاش مردنێ کار بکات، وە دەستەوەستان کە سێکە کە نەفسی وە دوای ئارەزووەکانی دەخات‌و وە خۆزگە (ی بێجێ) لە خوا دەخوازێ.




## بـابــەتی دووەم: بەرهــەمی خـوانـاسین

ئەم بابەتی دووەمــە لە پێنج کورتە باســان پێکهاتوە کە ئەمە ناوو نیشانەکانیان:

1 ـ یەکلابوونەوە بۆ خوا لە پەرستن دا.

2 ـ پاڕانەوەو داواکردن تەنیا لە خوا (عزّوجلّ).

3 ـ لە هەموو کەس‌و شتێك پتــر خۆشویستنی خوا (سبحانەو تعالى).

4 ـ لە هەموو شتێك‌و کەسێك زیاتر لێترسانی خوا (سبحانەو تعالى).

5 ـ لە هەموو کەس‌و شتێك بە گەورەتر دانانی خوا (تبارك وتعالى).

# دەستپێك!

وەك چۆن هاتنە دەرەوەی تیشك‌و رووناكی لە دەرگاو پەنجەرەكانی ژوورێكەوە كە چرایەكی تێدا هەڵكراوەو، میوە دەركردنی درەختێكی بەردار كە لە زەوی‌یەكی بە پیتدا نێژراوە، ئەنجامێكی ئاسایی‌و بەرهەمێكی سروشتی‌و چاوەڕوان كراوە، بە هەمان شێوەش پەیدابوونی كردەوەو رەفتاری چاك‌و پەسندو جم‌وجۆڵ‌و چالاكی مسوڵمانانەی كەسێك كە بڕواو خواناسینی لە دڵدا دامەزراوە، ئەنجام‌و بەرهەمێكی سروشتی‌و چاوەڕێ كراوە، هەربۆیەش دەبینین وشەی (العمل الصالح) كردەوەی چاك دەیان جار لەگەڵ وشەی (إیمان) لە قورئانیدا دووبارە بۆتەوە، جا بێگومان بڕوا بە خوا بوون لە سەرلەبەری ژیانی تاكی‌و كۆمەڵیی

ئینساندا پەرێزو شوێنەواری هەیە، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەما نەوێ لێی بکۆڵینەوە، بریتیە لە پەرێزو شوێنەواری برِوا بە خوا بوون‌و خواناسی بەس لە لایەنی پەیوەندی نێوان خوداو ئینسانەوە، وا تە ئا یا مرۆڤێك بەوجۆرەی کە لە یازدە خاڵی رابردوودا باسمان کرد برِوای بە خودا هەبێ‌و خوابناسێ، هەڵوێستی سەبارەت بە خوا چی دە بێ‌و پەیوەندی لەگەڵ خوادا چۆن دەبێ؟! جا ئێمە ئەوە لە پێنچ خاڵاندا ئەو مەسەلەیە دەخەینەڕوو:

## 1 ـ یەکـلابوونەوە بۆ خودا لە پەرسـتن دا:

یەکەمین ئەنجام‌و بەرهەمی برِوا بە خوا بوون و خوانا سینی تێرو تەواو ئەوەیە کە ئینسان لە بەندا یەتی‌و گەردن کە چی‌و پەر ستن (عبادة)دا بۆ خوا یەکلادەبێتەوەو بە خۆی رەوا نابینێ بێجگە لەوی بەندەی کەسی دیکە بێت‌و رووی دڵی لە قیبلەیەکی دیکە بێت، چونکە پەرستراو (معبود)و خۆشەویستراو (محبوب) بە ئەندازەی تێرو تەواویی (کمال) یان پەرستران (معبودیة)و خۆشەویستران (محبوبیة) یان لە دڵی پەرستار (عابد)و ئەویندار (عاشق)دا پە یدا دە بێ‌و سەقامگیر دەبێ، جا بێگومان خوداش ( سبحانەوتعالی) (ولله المثل الأعلی) لەوپەڕی سیفەت بەرزیی‌و ئاکار پەسندیی دایەو، مادام وا شبێ جێی خۆیەتی هەرکەسێك خۆی بە بەندەو پەرستاری وی زانی، خۆی بۆ یەکلاو ساغ بکاتەوەو بەشی کەسی دیکە بەخۆیەوە نەهێڵێ، وەك خوای بێهاوتا

فەرموویەتی: ﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصاً لَهُ الدِّينَ...﴾[١]، واتە: جا خوا بپەرستەو گەردن کەچیتی بۆ ساغ بکەوە. هەڵبەتە چەمکی (عبادة)یش بەس لە جوغزی نوێژو ذیکرو پاڕانەوەدا کورت هەڵنایەتو یەکجار بەرینو فراوانە، وەك خودا لە سوورەتی (یوسف) فەرموویەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾[٢]، واتە: فەرمانڕەوایەتی بەس هی خودایە، فەرمانی کردوە، کە جگە لەوی کەس نەپەرستن، ئەوەیە ئایینی راستو تەواو. وەك دەبینین پاش باسکردنی فەرمانڕەوایەتی (حاکمیة)و کورت هەڵێنانی لە خوادا، باسی پەرستنی خوا دێنێتە پێش، کەواتە مەسەلەی حوکمو فەرمانڕەوایەتیش هەر بەشێکە لە پەرستن (عبادة)ی خودا.

بەڵێ جا یەکەمین بەرهەمو ئەنجامی خواناسینی تەواو بریتییە لە یەکلابوونەوەو ساغبوونەوەی مرۆڤ لە گەردنکەچیو بەندایەتیو فەرمانبەرییدا بۆ خوا، لە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاکیو کۆمەڵیدا ئنجا، کە وای کرد ئەوە ئەو ئامانج و مەبەستەی هێناوەتە دی کە خودا مرۆڤی بۆ خولقاندوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾[٣]، واتە: جندو مرۆڤم دروست نەکردوە مەگەر بۆ پەرستنی خۆم، هەڵبەتە بەس دوای ئەو جۆرە بەندایەتیو فەرمانبەرییە هەمەلایەنەیەی گوتیشمان ئەو قسەیەی بابای نوێژکەر وەڕاست دەگەڕێ کە دەڵێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ بەس تۆ دەپەرستین.

---

(١) ( الزمـر : 2 ).
(٢) ( یوسف : 40 ).
(٣) ( الذاریات : 56 ).

## 2 ـ پاڕانـــەوەو داواکردن بەس لە خـــوا :

دووەمین ئەنجامو بەرهەمی بڕوا بە خوا بوونو خوانا سینی تەواوو ساغ، بریتیە لەوەی کە مرۆڤ بێجگە لە خوای میهرەبانو وەڵام گۆ دەستی پاڕانەوەو کڕووزانەوە بۆ لای کەس بەرز نەکاتەوەو بۆ ئەو شتانەی کە بێجگە لە خوا لە دەستی کەس نایەن، جگە لە خوا داوا لە کەس نەکاتو رووی نیازو مەبەستی بەس لە خوا بێو لە بەدەنگەوەهاتنو وەڵامدانەوەشی پشت ئەستوورو دڵنیابێ، خوداش فەرموویەتی: ﴿...فَلا تَدْعُو مَعَ اللَّهِ أَحَداً...﴾[ت]، واتە:... جا وێڕای خوا لە کەس مەپاڕێنەوە.. پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ أَقْوى النَّاسِ فَلْيَتَوَكَّلْ عَلى اللهِ...))[ی]، واتە: کێ حەزدەکات بەهێزترین کەس بێ با پشت بە خوا ببەستێ.. هەڵبەتە کەسێکیش خوای ناسیبێو بزانێ کە مردنو ژیانو قازانجو زیانو خۆشیو ناخۆشیو نەساغیو دەوڵەمەندییو هەژارییو... هتد، بە دەستی خوایەو هیچ شتێك بێ ویستی وی پەیدا نابێو گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەخۆی رەوا نابینێ بێجگە لە خوا لەبەر کەس بلاڵێتەوەو لە دەرگای کەس بداتو داوای هیچ شتێك لە هیچ کەس بکات. ئنجا هەر کاتێکیش مرۆڤ ئاوا بوو ئەو کاتە دەتوانێ بڵێ لە گوتنی ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾دا راستم کردووەو بەس یارمەتیو کۆمەکیم لە خوا خواستوە.

---

(ت) ( الجـن – 18 ).

(ی) رواه إبن أبي حاتم.

## 3 ـ لە هەموو کەس و شتێك پتر خۆشویستنی خوا :

بەڵێ یەکی دیکە لە ئەنجامو بەرهەمە مسۆگەرو سروشتی یەکانی خواناسینو بڕوا بە خوا بوونی تەواو ئەوەیە، کە مرۆڤ لە ئەنجامی ئاشنابوونی بە سیفەت بەرزییو ئاکار پەسندیی بێهاوتاییو تەواویی خوا، لە هەموو کەسو هەموو شتێکی خۆشتر بوێ، چونکە وەك ئیمامی غەززا لی دە لێ: دوو شت دەبنە هۆی خۆشویستانی هەرکەسێك:

یەکەم: ئەوە کە ئەو ئینسانە لە زاتی خۆیدا تێرو تەواو بووبێ، یان لە سیفەتێکی بەرزو پەسنددا زۆر تەواو بووبێ، وەك جوانیی، ئازایەتی، بەخشندەیی، زانیاری، بێئەوەی تۆ لەوکەسەوە بەهرەو سوودێکت پێ گەیبێ، بۆ وێنە هەموو کەس یوسفی لەبەر جوانییو داوێن پاکییو خالیدی کوڕی وەلیدی لەبەر ئازایەتیو حاتەمی لەبەر بەخشندەیی خۆش دەوێ، بێئەوەی لەوانەوە قازانجێکی ماددی پێ بڕابێ.

دووەم: ئەوەیە کە ئەو ئینسانە خێرو چاکەو بەرژەوەندییەکی لێ هەڵوەری بێو قازانجێکی بۆ تۆ هەبووبێ، جا بێگومان خوای بێوێنە هەم بۆ خۆی لە زاتی خۆیدا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندو چاکە، وە هەم هەرچی چاکەو خێرو خۆشیو نازو نیعمەت هەیە لە ویەوە بە ئێمەو غەیری ئێمەش دەگات.

بە کوردی خودا هەم تەواو (کامِلْ)ەو هەم تەوا کەر (مُکَمِّلْ)ە. کەواتە جێی خۆیەتی لە هەموو شتێكو هەموو کەس زیاتر خۆش بویستری، هەربۆیەش خوای خۆشەویست فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ

آمَنُوا أَشَدُّ حُبّاً لِلَّهِ...﴾[1]، واتە: وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە خوا یان زۆر خۆشتر دەوێ. پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيْهِ وَجَدَ بِهِنَّ حلاوَةَ الأيْمانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَ رَسُوْلُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمّا سِواهُما...))[2]، واتە: سێ خەسڵەت لەهەر کەسێکدا هەبن ئەوە شیرینایەتی بڕوای پێ دەستگیر کردوون - یەکەم - کە خوداو پێغەمبەرەکەی لە غەیری وان خۆشتر بوێن..

## 4 - لە هەموو شتێك و کەسێك زیاتر لێترسانی خوا :

یەکی دیکە لە ئەنجامو بەرهەمە سروشتییەکانی بڕوا بە خوا بوون و خواناسین ئەوەیە کە ئینسان لە هەموو شتێكو هەموو کەس پتر لە خوا دەترسێو سامی لێدەکات، هەڵبەتە کەسێك بە ڕاستی خوا بناسێو بزانێ چەند دەستەڵاتدارو بێ باکەو چەند مەزنو بەرێزەو چەند بە سامو هەیبەتە، حەتمەن لێی دەترسێو سامی لێدەکات، چونکە دەزانێ کە تاوان هەرچەندە گچکەش بێ، بەڵام لەو رووەوە کە سەرپێچی ئەو زاتە مەزنەی تێدایە، هەر گەورەو بێرەزایە، جا بێگومان ئەو تاوانە دەبێتە مایەی ترسانو شەرمەزاریی بەرانبەر بە خوا، هەر بۆیەش خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾[3]، واتە: بەڕاستی بەس ئەو بەندانە - وەك پێویست - لە خوا دەترسن کە زانان...، چونکە مرۆڤ هەتا پتر خوا بناسێ زیاتر هەست بەوە دەکات کە تاوانو

---

(1) ( البقـرة - 165 ).

(2) رواه البخاري ومسلم.

(3) ( فاطـر - 28 ).

سەرپێچی چەند ناقوڵاو بێئەدەبی‌یە بەرانبەر بە خوا، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین کە مەبەست لە (لە خواترسان) ئەوە نیە کە خودا وەك شتێکی ترسناك بێتە بەرچاوی ئینسان، چونکە خودا خاوەنی ئەو پەڕی بەرزیی‌و پەسندیی‌و چاکیی‌و میهرەبانیی‌و بەخششە، بەڵکو مەبەست لە (خوا ترسان) ئەوەیە کە لە سزاو جەزرەبەیەك بترسێ‌ی کە خودا بۆ ئەو تاوان‌و خراپانەی دیاری کردوە کە مرۆڤ دەیان کات، دەنا خوای میهرەبان‌و دادگەر زۆر لەوە بەرزترە، کە هەر لە خۆڕاو بێ سووچ و تاوان لە مرۆڤ هەڵپێچی‌و بەرۆکی بگرێ، بەڵام کەسێك کە بێگوێیی خوا دەکات‌و لە فەرمانی لادەدات، ئەوە بە دەستی خۆی خۆی تووشی چۆرتمێ کردوەو بۆ خۆی، خۆی بە پەند بردوە، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾[1]، واتە: وە هەر بەڵایە کەتان تووشبێ ئەوە کردەی دەستی خۆتانە..

ئنجا لە کۆتایی‌دا دەڵێم:

کەسێك وەك لە خوادەترسێ‌و شەرمی لێ دەکات هێندە لە هیچ نەترسێ، لە ڕاستیدا ئەو کەسە لە دیلی و کۆیلەیی قوتاری دەبێ‌و کۆتو زنجیری دەست‌و پێ‌یانی دەپسێنێ‌و ئازادی ڕاستەقینە وەدەست دێنێ، وە بابای وا دەبێتە شێری چەنگ بەخوێن‌و شەرمێ لە شای ناکاو لە هیچ سڵ ناکات، هەر بۆیەش خوای زانا (بەس لە خواترسان)ی کردۆتە

---

[1] (الشورى - 30).

مەرج و خەسڵەتێکی گرنگ و بنەڕەتی با ـبای مـ سوڵمانی ـکامڵ، وەك دەفەرموێ: ﴿فَلا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾(ٿ)، واتە: جا لەوان مەترسن و لەمن بترسن ئەگەر ئـ ـێوە ـبڕوادارن، هەروەها ـلە وه سفی ئەوا ـنەدا خواپەر ستی رە سەنن و ما ـڵێ ـخوای ـئاوەدان دەکە ـنەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ ا ـلْآخِرِ وَأَ ـقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ﴾(ڀ)، واتە: بەڕا ستی ـبەس ـئەو کەسە مزگەوتەکانی خوائاوەدان دەکاتەوە کە بڕوای بە ـخواو ـبە رۆژی دوایی هێناوە، وە نوێژێ بەرپا دەکاو زەکاتێ دەدات، وە ـبەس ـلە ـخوا دەترسێ..

## 5 ـ لە هـەموو کەس و شـتێك بە گـەورەتر دانانی خـوا :

یەکی دیکە لە ئامانجە سروشتیی و مسۆگەرەکانی بڕوابوونی را ـست و تەواو ئەوەیە کە مرۆڤی خواناس، خوا لە هەموو شتێك و هەموو ـکەس بە گەورەترو بەرزتر دەگرێ، چونکە بابا ـیەك بزا ـنێ ـخوا بەدیهێ ـنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکەو تاك و تەنیاو بێوێنەو هاوەڵەو ـحەوجێی کەس نیەو هەمو شتێك حەوجێی وی یەو خاوەنی ـهەموو ـسیفەتێکی چاك و پەسندەو لە هەموو پەڵەو ناتەواوی ـیەك دوورەو... هـ ـتد، د ـیارە بەخۆی رەوا نابینێ نەك هەر هیچ شتێك لە خوا بە بەرزتر بگرێ، بەڵکو نەشی باتە ڕیزی خواو، هەر لەگەڵ خواشدا بەراوردی پێ نەکات!! ئنجا گومانیشی تێدانیە کە مرۆڤی بڕوادار بارتەقای هەستکردنی بەبەرزیی و

(ٿ) ( آل عمـران  175 ).

(ڀ) ( التوبـة 18 ).

گەورەیی خودا، هەست بە گچکەییی و بەندەیی خۆی دەکات، وە بە پێچەوانەوە مرۆڤ هەتا لە خوا دوورتر بێ و پێی نائاشنابێ خۆی لەلا زلتر دەبێ، کەواتە: خۆ بەکەمگرتن (تَواضُعْ) بەرهەمی خوانا سینەو، خۆ بەزلگرتن (تَكَبُّرْ)یش قەلەفسەی برِ کە گوژاڵکی خوانەنا سینە، هەربۆیەش پێغەمبەری رابەرمان ﷺ فەرموویەتی: ((لايَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كانَ في قَلْبِهِ مِثْقالَ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ...))[تر]، واتە: هەرکەسێك کێ شی گەردیلە ـ یان مێرووولەی گچکە ـ خۆ بەزلگریی لەدڵ دا بێ نا چێتە بەهەشتێ.

بەڵێ هەموو دەمێ خوا بە گەورەگرتن و خۆ لەکن گچکەبوونەوەو بەندایەتی بەرانبەر خوا نواندن، پێکەوە پێویستن، هەر بۆیەش (نوێژ) کە ئەوپەڕی بەندایەتیی و گچکە نواندنی ئینسانی تێدایە بەرانبەر بە خودا، دەبینین بە فەرز[یر] و سوننەتەوە نەوەدو چوار (94) جاران و شەی (الله أكبر) خوا گەورەترە لە پێنج فەرزەکاندا دووبارە بۆتەوە. خوای بێهاوتاش لە کۆتایی (آية الكرسي)دا کە گەورەترین ئایەتی قورئانە، پاش وەسفکردنی خۆی بە چەندان سیفەتی بەرزو پەسەند، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾، واتە: وە ئەو بەرزی مەزنە، ئنجا شتێکی روونە کە مسوڵمانێکیش هێندە خودای لەلا بەرزو مەزن و گەورەو پایە بڵیند بێ، قەت قەت بەخۆی ڕەوا نابینێ جگە لەو پەرستراوێکی دیکە بگرێ، یان شتێك بێنێتە ڕێزی خودا (سبحانه وتعالى)، بۆیە (محمد ئیقبا لی

---

(تر) رواه مسلم.

(یر) واتە گوتنی (الله أكبر) فەڕزو سوننەتەکان، کە دیارە (الله أكبر) گوتنی فەڕز تەنیا هی نوێژ دابەستنە و ئەوانی دی هەموویان سوننەتن.

لاهوری) دەڵێ: (کڕنووش بردنێك بۆ خوای تاك لە هەزار کڕنووش بۆ بەندان ڕزگارت دەکات) (وَسَجْدَةٌ لِلَّهِ الأحَدِ تُنْجِيْكَ مِنْ ألفِ سجدَةٍ لِلعَبِيْدِ) ئێستاش بە پەسندی دەزانم کە لە کۆتایی ئەم باسەدا تیشکێك بخەینە سەر مەسەلەی سوێند بە غەیری خوا (عزّوجّل) خواردن. کە خەڵکێکی زۆر پێیەوە گرفتار بووە، هەر چەندە گوناهێکی گەورەیەو ڕاستەوخۆش لەگەڵ بە گەورەتر دانانی خوادا لە هەموو کەسو هەموو شتێك، تێك دەگیرێ:

سوێند بە غـــەیری خـــوا خواردن[٣٣]:

گومانی تێدانیە کە کەسێك خودا لە هەموو شتێك بە گەورەترو بەرزتر بگرێ، ڕێ بە خۆی نادات سوێند بە غەیری وی بخوات، چونکە مرۆڤ بۆیە سوێند دەخوات تاکو قسەکەی بەهێزتر بکاتو سوێندەکە بکاتە پشتو پەنای، جا مرۆڤ کە بیەوێ سوێند بخوات گەورەترینو بەرزترینو پیـــرۆزترین شت لە فەرهەنگی مێشکیدا هەڵدەبژێریو سوێندی پێدەخوات، کەواتە سوێند خواردن بە غەیری خوا مەعناو مەبەستێکی زۆر ناماقووڵو دزێو دەگەیەنێ، هەربۆیەش پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ اللهَ تعالى يَنْهاكُمْ أنْ تَحْلِفُوا بِآباءِكُمْ فَمَنْ كانَ حالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ أوْ لِيَصْمُتْ...))[٣٤]، واتە: بەڕاستی

---

(٣٣) (إبْنُ حَجَرِ الهَيْتَمي) لە کتێبی (الزَّواجرِ عَنْ إقْترافِ الكبائرِ)دا سوێند خواردنی بە غەیری خوا لە ڕیزی گوناهە زلەکان (الكبائر)دا حسێب کردوە، ئیمامی (نَوَوِيْ) یش لە (رياضُ الصّالِحِيْن) دا ئەم مەسەلەیەی لە باسێکی سەربەخۆدا هێناوە بەناوی: (بابُ النَّهْيْ عَنِ الحلْفِ بِمَخْلوقٍ).

(٣٤) متفق عليـــه.

خوای بەرز لێی قەدەغە کردوون کە سوێند بە باب‌و باپیــرانتان بخۆن، جا کێ سوێند دەخوات با سوێند بە خودا بخوات، یان بێدەنگ بێ. وە فەرموویەتی: ((مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ))[ت]، واتە: هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە کافر بووە یان هاوبەشی پەیداکردوە. هەڵبەتە مەرج نیە باباى سوێند بە غەیری خوا خۆر هەموو دەمێ بەو سوێند خواردنەی بچێتە ڕیزی کافرو هاوبەش پەرستانەوە، بەڵکو تەنیا لە کاتێکدا وای لـێ دێ کە ئەو شتەی سوێندی پێ دەخوات لەلای وەك خودا یان بەرزتربێ، جا فەرموودە کە یان ئەم حاڵەتە تایبەتی‌یە بێتامەی لەبەرچاو گرتووە، یان وەك ئیمام (نووي) فەرموویەتی[ی]: مەبەست گەورەکردنی تاوانی گۆڕینە لەبەرچاوی خەڵکی تاکو لێی وەپرینگێن. وە دەشتوانین بڵێن: مەبەست لە (فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ) ئەوەیە کە سوێند خواردن بە غەیری خوا عادەت‌و خووی کافرو هاوبەش پەرستانە، کەواتە هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات ئەوە یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەوانەی تێدا هاتۆتە دی هەڵبەتە مەرجیش نیە بە خەسڵەتێکی کافران ئینسان کافر بێ‌و لە ئیسلام بچێتە دەرێ بەڵکو بەس تاوانبارو لارێ‌یەو هیچی دێ. چونکە هەروەك چۆن بڕوا (إيمان) حەفتاو ئەوەندە یان شەست‌و ئەوەندە بەشەیەو بەرزترین بەشیان گوتنی (لا إله إلا الله) یەو گچکەترینیان لادانی

---

(ت) رواه الترمذي.

(ی) بڕوانە (رياضُ الصّالِحِيْن) ل 483.

ئازارێکە لەسەر ڕێگا[تر]. کوفریش کە لە ئەسڵی زماندا واتا (داپۆشین) هەرجۆرە سەرپێچیی‌و لاملی‌یەك لە بەرنامەی خوا دەگرێتەوە، جا چ پەیوەندی بە بنچینەکان (الأصول)ەوە هەبێ کە ئەو دەمی مانای پڕبەپێستی وشەکەو ئەوپەڕی چەمك (مفهوم)ەکەی دێتە دی کە کافر بوون‌و وەرگەڕانە، وە چ پەیوەندی بە لق‌و پۆپەکان (الفروع)ی ئیسلامەوە هەبێ کە ئەودەمی چەمك‌و واتای جوزئیی‌و گچکەکەی وشەی (کفر) دێتە دی. هەڵبەتە بە پێی ئەم بنچینەیە (القاعدة)یش لە تەفسیرکردن‌و واتالێدانەوەی زۆر ئایەت‌و فەرمووداندا سەرکەوتوو دەبین‌و ڕێمان لێ تێك ناچێت.

جا خوێنـــەری بەڕێز!

ئەم (پێنچ) خاڵەی رابردن، ئەنجام‌و بەرهەمی بڕوا بەخوا بوون‌و خواناسی بوون، لە لایەنی (پەیوەندی ئینسان بە خوداوە)دا، هەڵبەتە بڕوا بەخوابوون‌و خواناسینی تەواو لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاك تاکو کۆمەڵی مرۆڤـدا پەریزو شوێنەوارو بەر هەمی گرنگ‌و بەرچاوی هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا بەس ئەو باسانە دێنینە پێش کە

---

(تر) ئەو فەموودە یە بۆ خاری و مو سلیم ریوا یەتیان کردوەو ئە مەس دەقەکە یەتی: ((الأيْمانُ بِضْعُ و سَبعُون، أو بِضْعُ وستونَ، شُعْبَةً، أفْضَلُها قَوْلُ لاإله إلاّ اللهُ، وأدْناها: إماطُه الأذى عَنِ الطريْقِ، والحَياءُ شُعْبَةً مِنَ الأيْمانِ)) بڕوانە (رياض الصالحين) ل 96.

پەیوەندیان بە خواوە هەیە، بەڵام لە جێی سەربەخۆو تەرخان کراودا پەرێزو شوێنەوارە جۆراوجۆرەکانی بڕوا بەخوا بوون توێژراونەوە(تر).



# نێــــوەڕۆك



(تر) لە بەرگی یەکەمی (یادی خودا) دا ئەم باسە توێژراوتەوە، هەروەها لە کتێبی (خواناسی، ئایین، ئیمان) دا، چاپی (2000)ی نووسینگەی تەفسیر وە بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرە دەرسە (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چی یەو چۆنە ؟!) چاپی یەکەم (2006)ی نووسینگەی تەفسیر..

# نێـــوەڕۆك

## ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی

گومانیش لەوەدا نییە کە ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و

ڕەگ و ڕیشە بۆ درەخت و هەوێن بۆ ماست و هەناو بۆ ئینسان وایە !

بۆیە هەرکەسێک بیەوێ مسوڵمانەتی و دینداریەکی ڕاست و ڕەوان

دەبێ لە ئیمان و عەقیدەوە و بنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەست پێ بکات ؟!

وە هەرگەل و میللەتێک بیەوێ ژیان و گوزەرانی خۆی بەپێی شەریعەتی

خوا پاکسازیی و چاکسازیی بکات و ڕێگەی بنچینەیی پێویستە لە ڕاستکردنەوە و

بژارکردن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدە دەست پێ بکات .

پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەر شەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و

جێی متمانە و پشت پێ بەستنە بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک بیەوێ

دەست بەو گۆڕانکاری و پاکسازیی و چاکسازییە بکات .

عەلی باپیر




نووسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
trizone ARCHITECTURE COVER.DESIGN
7000 دینار

